چاپی دەیەم

پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی ٢٠٢٣

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی یەکەم

ماکوان کەریم





بسم الله الرحمن الرحيم

# مەملەكەتی شەیتان

## كتێبی یەكەم

نووسین: ماكوان كەریم

پێداچونەوە و خاڵبەندی: شەوبۆ جەلال




كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی

بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد 07824671394 - 07504671394

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد كوردی 07509998182

فەیسبووک: كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی/ M.Ktebxana

ئینستگرام: كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەكەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد كوردی

نەخشەسازی بەرگ: توانا ئەحمەد

چاپی دەیەم: ٢٠٢٤

پێوانە: ١٤*٢١

تیراژ: ١٥٠٠

لاپەڕە: ٣٦٤

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان - هەرێمی كوردستان

ژمارە سپاردنی (١٨٨٤)ی ساڵی (٢٠١٦) پێدراوە

پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی ٢٠٢٣

کتێبی ژمارە (٩) لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی نوێ

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی یەکەم

نووسینی:

ماکوان کەریم

چاپی دەیەم:

٢٠٢٤

# پێشەکی:

بەناوی خوای کارزان و کاربەجێ

یەکێك لەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەی کە کۆمەڵگای ئێمە تووشی بووە و خەڵکی پێ هەڵدەخڵەتێنن بەناوی خۆشبەختی و کامەرانی فاڵ و قاوە گرتنەوەیە، ژنان و کچان بۆ بەختی خۆیان پەنا دەبەن بۆ فاڵگرتنەوە و قاوەگرتنەوە، تاکو لە ڕێگای ئەم کارە بێ مانایەوە لە ژیاندا هاوکارییەکیان بکات.

ئەم دیاردەیە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەیە، بەڵام ئەو کەسەی کە پەنا بۆ ئەم جۆرە کارانە دەبات پێی دەڵێن دۆڕاوی دەروونیەتی، چونکە ناتوانێ ڕووبەڕوی کێشەکانی بێتەوە. زۆرێك لە پسپۆرانی دەروونناسی ڕاڤەی ئەم جۆرە کارانە دەکەن دەڵێن هەموو زانیاری گشتییە دەیدەنە خەڵك و خەڵکی پێچەواشە دەکەن.

لە وڵاتی ئێمەدا ئەو کەسانەی کە پەنا دەبەن بۆ ئەو کارانە زۆر جار لە ئاستی گەورەدان بۆیە چەندین مامۆستای قوتابخانە و پەیمانگاو زانکۆکان دەچنە لای فاڵچیەکان، خۆیان ئەوەیان دووپاتکردۆتەوە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لەو بوارەدا. تەناتەت ئەوەیان ئاشکرا کرد کە موشتەری هەمیشەیی خۆیانن و لە هەموو کێشەکانیاندا ئاگاداریان دەکەنەوە، فاڵچییەکان زۆربەیان نەخوێندەوارن تەنها پێشبینییان بۆ دەکەن!

نووسەر- لە فاڵچییەکم پرسی تۆ چۆن دەتوانی پێشبینی بکەیت بۆ موشتەرییەکانت دوارۆژو و نهێنییەکانی ژیانیان بۆ ئاشکرا بکەیت؟

لەوەڵامدا وتی: لە ئەنجامی خوێندنەوەی قاوەکەی، ژیانی لەناو ئەو کوپەدایە لەوێوە هەموو ژیانی دێتە بەرچاوم!

پرسیم: ئەم ژیانە چۆن دێتە بەرچاوی تۆ لە کوێوە زانیت ئەم قاوە تەڵخە دەبێتە ژیانی ئەو بێچارانە؟

لەوەڵامدا ئەوەی درکاند: کەسێك بە مێشکی دەڵێت لە پەنهانەوە واتا(غەیب)؟

ئەمە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، بەڵکو تەنها دۆخێکی ناتەندروستی دەروونییە.

لەڕاستیدا هەردوولا کە ئەو کارە دەکەن تووشی نەخۆشی دەروونی بوون، هەندێکیشیان سیحرو جادوو بەکاردێنن.. کە لەناو باس و خواستەکانماندا زیاتر دەردەکەوێت.

بۆ ئەم مەبەستە نووسەر- چۆتە لای دکتۆری پسپۆر لە بواری دەروونیدا بۆ ئەم پرسە، پرسیاری کردووە لە پزیشکەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێم، کۆی گشتی وەڵامەکان لە یەک بازنەدا دەخولانەوە، ئەویش ئەوەیە کەوا ئەو جۆرە کەسانەی خەریکی قاوە گرتنەوەو فاڵ و ئەو جۆرە خوزەعبەلاتەن؛ تەنها خەڵکی چەواشە دەکەن بۆ کێشانەوەی پارە لەو کەسانەی کە لاوازن لە ڕووی کەسایەتییەوە و یاخود جاهیلن لە ژیانیاندا وە یان توانای چارەسەری کێشە تایبەتییەکانی خۆیانیان نیە

هەروەها پسپۆڕانی دەروونناسی دەڵێن: هەموو فاڵچییەکان وتەکانیان گشتین، واتا ئەوەی کە دەیڵێن لەسەر بنەمایەکی زانیاری گشتی دامەزراوە، بۆنموونە ئەو فاڵچی و قاوە گرەوانە موشتەرییەکانیان بەوە چەواشە دەکەن کە دەڵێن: تۆ کەسێك ڕقی لێتە، یاخود لەناو خزمانی خۆتاندا کەسێك سیحری لێکردویت و پلانت بۆ دەکێشێت بۆ ئەوەی چاڵت بۆ هەڵبکەنێت!

لەڕاستیدا لە ژیانی هەموو کەسێکدا، کەسێک یاخود چەند کەسێك ململانێ لە نێوانیاندا هەیە، زۆر جار سەر دەکێشێت بۆ شەڕو ئاژاوە، ئەمەش نەك کارێکی ئاساییە، بەڵکو ئەگەر وا نەبێت ژیان ناڕوات، کاتێك کە فاڵچی ئەم قسەیە دەکات ئەوەی موشتەرییە و جاهیلە یەکسەر بە خەیاڵ ئەو کەسەی کە خۆی ڕقی لێیەتی یاخود کێشەی هەیە لەگەڵیدا دەیخاتە مێشکی خۆیەوە و دەڵێت: ڕاستە ئەوە ئەو کەسەیە بەرانبەرم وەستاوە. لەڕاستیدا ئەمە شتێکی گشتییە، یاخود دەڵێت تۆ کە سەر دەکەیتە سەر سەرینەکەت زۆر بیر دەکەیتەوە، هەموو مرۆڤێکی ئاسایی کاتێك سەردەکاتە سەر سەرین هەر بیردەکاتەوە، جا ئەگەر کێشەیەکیشی هەبیت زیاتر بیرکردنەوەکەی چڕ تردەبێتەوە خەوی کەم دەبێت، ئەمەش هەر زۆر ئاساییە، یاخود دەڵێت تۆ ئازارێك لە گیانتا هەیە، ئەمانە هەموو شتی گشتینو چەواشەکارین، وەهەروەها.....

سەبارەت بەم جۆرە کارە زشتانە لەرووی ئایینەوە بەم جۆرە بۆمان دواون زانایانی ئایینی هەرێمی کوردستان دەڵێن: ئەم جۆرە کارانە پێویستە دەزگا ئەمنییەکان ڕێگای لێبگرن، چونکە زۆرجار دەبێتە هۆکاری ئاژاوەنانەوە، لە ڕووی ئاینییەوە هیچ بنەمایەکی نییە ئەوەی کە بەناوی ئیسلامەوە ئەم کارانە دەکات ئەوە خەڵکی گومڕا دەکات.

هەروەها ئەو جۆرە كەسانەی بە دەجال ناوبردو ئاماژەیان بەوە داوە: هەر كەس ئەوكارە بكات كوفرەو لەهەمانكاتیشدا هاوبەشدانانە. ئەوان ئاماژەیان بە حەوت جۆر گوناهی گەورە دا، بریتی بوون لە (هاوبەشدانان، سیحر، كوشتنی خەڵكی بەبێتاوان، ماڵی هەتیو خواردن، ریبا، زیناكردن، كەسێك جیهاد بكات خەڵكێك پەشیمانی بكاتەوە) لە تاوانە گەورەكانە، زۆرێكیش لەزانایان دەڵێن كافر دەبێت! ئەو جۆرە كارانە زۆر جار مرۆڤ تووشی سێ گوناه لەو حەوت گوناهە گەورەیە یاخود زیاتر دەكات، كە ئەم تاوانانە ئەنجام دەدەن مەگەر خەڵكی تۆبەی لەسەر بكەن دەنا لێخۆشبوونی ئاستەمە.

ئەو بەشەی كەباسی جنۆكەو چوونە ناو لاشەی مرۆڤە، هەوڵمانداوە بە شێوەیەكی زانستی و واقیعی لەڕووی مەیدانییەوە كە ڕوویانداوە خۆمان ئەزموونمان تێدا هەبوو، لەو بوارەدا پرسمان بە دەیان خەڵكی پسپۆر كردووە. لە هەمانكاتدا هەوڵمانداوە ئەوەی كە گونجاوە لە قورئان و سونەتدا ئەوەمان باسكردووە خۆمان بەدوور گرتووە لە هەموو قسەو باسێكی خورافی و درۆودەلەسە كە لەم بوارانەدا كراون.

ئەم هەوڵە سەرەتایە ئەشێت بەدوایدا بەشی تر بێت، ئەگەر تەمەن باقی بێت ڕووداوەكان وەك خۆی باس دەكەین.

ئامانج لەم كتێبە ئەوەیە چەواشەكاری و درۆو خورافات جیا بكرێتەوە لە سیحرو جادوبازی و كاری شەیتانەكان.

سوپاس و پێزانینی زۆرمان بۆ كۆمەڵێك خەڵكی بەڕێز لەوانە (كاك عابد عەلی، كاك مەریوان سەیدسادقی، كاك بڕیار كەلاری وە یەك دوو برای

دیکه‌ش) که‌ هه‌ریه‌که‌یان به‌گوێره‌ی توانای خۆی هاوکاری مادديان کردووه‌ بۆ چاپکردنی ئه‌م کتێبه‌.

فه‌رموون ڕاسته‌وخۆ بۆ ناو باسه‌که‌.

ماکوان که‌ریم
دووه‌م شه‌وی پایز ساڵی ٢٠١٦ز

# من و شەیتان لە کاتی ماسی گرتندا

ئێوارەیەکیان زۆر بێزار بووم دەرچووم لە ماڵ، وامدەزانی ئەم دنیایە بەسەر شانی منەوەیە.. بەبێ ئەوەی هیچ ڕوویدا بێت. چوومە کەناری دەریا بۆ ماسی گرتن، کاتژمێر ٩ی شەو بوو چەند قولاپێکم هاویشت هیچ نەهاتە دەرەوە، خەریك بوو بێزار دەبووم لەوەی کە قولاپ هەڵبدەم،.. وتم دەڕۆمەوە بۆ ماڵ لەپڕ لە تەنیشتمەوە پیاوێك هاواری کرد ماکوان پەلە مەکە وەرە هاوکاریم بکە لەسەر ئەوبەردانە با بێمەلات ئێستا ماسی زۆر دەگرین!

کەتەماشام کردو زانیم پیاوێکی بە تەمەنە لە دەوری ٥٠ بۆ ٥٥ ساڵ دەبوو، قولاپەکەم داناو خێرا بە دەمیەوە چووم و دەستم گرت و هێنامە سەر بەردەکەی خۆم کە ماسیم لەسەر دەگرت،

وتم: بەڕێز خەڵکی کوێیت؟ ئەو بەزمانی عەرەبی بانگی کردم.. وامزانی ئەهلی مزگەوتی خۆمانەو دەمناسێت ناوەکەمی زانییوە!

یەکەم جار بوو کە ئەو دەموچاوەم بینی، لەخەڵکی لای کۆسۆڤۆو بۆسنا دەچوو.. بەڵام بەعەرەبییەکی زۆر جوان قسەی دەکرد!

من خەڵکی ئەم جیهانەم.

پیاوەکە: وامزانی ڕادەبوێرێت

وتم: کەواتە بە هەر زمانێك قسەت لەگەڵ بکەم دەبێت تێبگەیت کە تۆ خەڵکی جیهانیت؟

ڕووی کردە بەو لاوەو وتی: بەڵێ بەڵی دەتوانێت، دەستی کرد بە قسەکردن بەزمانی فارسی بە فارسییەکی زۆر جوان قسەی دەکردا!

ماکوان: خەڵکی ئەهوازی ئێرانی وا عەرەبی و فارسی قسە دەکەیت؟

پیاوەکە: - نا- من وتم خەڵکی جیهانم، بە کوردی دەستی کردە ئاخافتن و وتی: ماکوان، بە تایبەت هاتووم بۆ لات، بە خۆمم وتت کەوا بەیەکەوە تۆزێك ماسی بگرین و هەندێك قسەی خۆش بکەین، چییە ئەڵێی بێزار بوویت.

لە داخا وەڵامم نەدایەوە لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمە چییە؟ ئەو کوردییە جوانە قسە دەکات، عەرەبییەکەی لەکوردی باشترو فارسی لە هەردووکیان باشتر!

خۆمم پێنەگیرا دووبارەم کردەوە بەڕاست خەڵکی کوێیت؟

پیاوەکە: کاکە، کوردی دەزانی یان بۆت بکەم بە نەرویجی؟

بە نەرویجییەکی فول دەستیکرد بە قسەکردن کە خەڵکی جیهانەو هەرکوێیەکی بووێت دەڕوات و دەگەڕێت، ئینجا دەستی کردەوە بە قسە کردن بە کوردی.

پیاوەکە: قولاپەکەتم بدەرێ با من هەڵیدەم.

ماکوان: دانەیەکی ترم پێیە ئەوە هەڵدە بۆ خۆت.

پیاوەکە: نا ئەوەی تۆم دەوێت.

ماکوان: فەرموو..

قولاپی هەڵدایە ناو ئاوەکەو هەڵێنەکردەوە، وتی ماکوان خۆت هەڵیکەرەوە پشتم دێشێت.

منیش زوو چووم بەدەمیەوە بۆ ئەوەی دەمی قولاپەکە لە شتێك نەگیرێت هەڵم کردەوە زۆر قورس بوو، وتم ئەوا گیرت کرد لە زەوی.

پیاوەکە: نا- سێ هاوڕێی خۆمم ناردۆتە ناو دەریاکە تا بەدڵی تۆ ماسیەکان کۆبکەنەوەو تۆش بیانگریت، خەمەکانت بکەم بەخۆشی ئەم شەو، وردە وردە هەڵمکردەوە ماسییەکی گەورەی پێوە بوو بوو.

لەدڵی خۆمدا وتم تەماشای ئەم فشەکەرە ناکەیت بەم تەمەنەوە پۆز لێئەدات.

پیاوەکە: ماکوان زۆر بیری لێ مەکەرەوە هەر قولاپ هەڵدەو ماسییەك لەمنەوە بۆ تۆ.

منیش بە پێکەنینەوە قولاپم هەڵدا، ماسیەکی تر هات لەوی تر گەورەتر بوو، قولاپی سێیەمم هەڵدا ماسی هات، کردم بە چوارو پێنج هەر بەردەوام ماسی دەگرت! دە جار زیاتر قولاپم هەڵدا ماسی گرت.

پیاوەکە: لەبەردەم خۆیەوە دەیوت ڕازیت ماکوان .. ڕازیت ماکوان؟

ماکوان: ئەرێ رازی رازی چیتە؟ ئەوە ڕزقی خوایە، تۆ چیت من ڕازی کەیت؟ تۆ تا ئێستا ناوی خۆت بەمن نالێیت، دەڵێی پێم دەفرۆشییتەوە، تۆ کێیت؟

پیاوەکە: من دۆستی هەمووتانم، ناوتان ناوم شەیتان!

ماکوان: تف لەدەممدا وشك بوو، خەریك بوو قولاپەکە بکێشم بەسەریدا و ڕاکەم، دواى لە دڵی خۆمدا وتم: جا باشە کێ نالێت پێم رانابوێرێت بۆ ئاوا ترسام؟

ماکوان: بە پێکەنینەوە.. راستە دەڵێن پیاو کە پیر بوو شێت دەبێت، ئەوەندە لەم وڵاتانە ماویتەوە شێت بوویت، دیارە شەیتان ئاسا ڕەفتار دەکەیت؟

پیاوەکە: توو پەروەردگارەکەت بڕوا ناکەیت ماکوان؟

ماکوان: نەوەڵلا.. قەشمەریشم پێت دێت، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر ترس لە دڵمدا دروست بوو بوو بێئەوەی بهێڵم بزانێت.. دوایی وتم ئەرێ کاکە تۆ چۆن من دەناسییت؟

پیاوەکە: ناسینی تۆ بۆ من ئاسانە، بەڵام گرنگە تۆ من بناسیت؟

ماکوان: باشە جەنابتان کێن؟

پیاوەکە: شەیتان!

ماكوان: ئەگەر شەیتانی ئاساییە ئێستا ئایەتەلكورسییەك دەخوێنم نامێنیت، قولاپەكەم هەڵداو دەستم كرد بەخوێندنی ئایەتەلكورسی بەدەنگی بەرز.

وتم: ئەگەر مایەوە ئەوە دەڵێم شەیتان نییە، خۆ ئەگەر شەیتانیش بێت دوور دەكەوێتەوە. قولاپەكەم هەڵدا لە نیوەی خوێندنی ئایەتەلكورسیەكەدا بووم، ئاوڕم دایەوە كابرا دیار نەما، هەرچی هاوارم كرد.. نەما

## گەڕانم بەدوای شەیتاندا

لەدوای تەواو بوون لە خوێندنی ئایەتەلکورسی، کابرا دیار نەما. هەرچی بەدوایدا گەڕام نەبوو.

وتم: خۆ ئەم (سەگبابە) ڕاست دەکات شەیتان بوو!

زۆر ترسام دەستم کرد بە خوێندنی قورئان تاکو ماڵەوە، هەرچییەکم لەبەر بوو خوێندم. هاتمەوە خێزانم وتی ئەوە بۆ وا ڕەنگت گۆڕاوە، خۆ شەڕت نەکردووە؟

ماکوان: ناوەڵڵا هەر بێتاقەتم

خێزانم: دەعمیشت نەکردووە، واتا بە سەیارەکەت هیچ ڕووی نەداوە؟

ماکوان: نا

خێزانم هەر بڕوای نەکرد، پرسی لە کوردستان کەس نەمردووە؟

وەڵامم هەر نا- بوو، چونکە چی بۆ باس بکەم، ئەگەر ڕاستییەکەی بۆ باس بکەم، خۆ ئەگەر بڕواشم پێنەکات زیرە دەکات، بۆیە بێدەنگ بووم.

چوومە بەردەم کۆمپیتەرەکەم و لە گوگڵ نوسیم (من هم الجن)، بە نەرویجی نووسیم جنۆکە چییە و کێن؟.... Hvem er den jinn

بە ئینگلیزی بەدوای سەرچاوەدا دەگەڕام، ...Who are the jinn

بەدەیان کتێب و سەرچاوەم پەیدا کرد، تەنانەت چوومە ناو شەیتان پەرستەکان و ساحیرەکانیش، بێجگە لەوەی لە یوتیوب گوێم لە دەیان وتار و بەرنامەی دیکۆمێنتی گرت .. ماوەی مانگێك سەرقاڵ بووم بەم باسانەوە، نەشم دەوێرا بچم بۆ ماسی گرتن.

وتم ئەگەر هەر هیچم دەست نەکەوێت، پەیوەندی بە کەسێکی شارەزاوە دەکەم کە لەگەڵ جن و شەیتاندا قسەیان کردووە، تا بزانم ئەو وەزعەی من چییە؟

ڕۆژێك بیرم کردەوە بچمەوە بۆ کەناری دەریاکەو دەستکەمەوە بە ماسی گرتن، بەڵکو شەیتانە فەنی بێتەوە!

چوومەوە هەمان جێگا، لەوانەیە نیو کیلۆ گوڵە بەرۆژەم خوارد بێت بە ماسی گرتنەوە، شەیتان دیار نەبوو یەك ماسیشم نەگرت، ماوەیەکی زۆر لە ٤ کاتژمێر زیاتر قولاپم هەڵدا، ئیتر باڵم ئازاری پێگەیشت ئەوەندە قولاپم هەڵدا، چار نەما لەدڵی خۆمدا دەمووت تۆ بڵێی تووشی نەخۆشی دەروونی بوو بم! دەنا ئەمە چی بوو تووشم بوو. زوو زووش بۆ ئەوەی نەفسیەتی خۆم تاقی بکەمەوە، بزانم ئەو بوارە دەروونیەم تووش بووە نەخۆشم یان کەسێکی ساغ و تەندروستم، بۆ ئەو مەبەستە بابەتەکانی ناو مێشکم دەگۆڕی. بۆ ئەوەی بزانم توانای دەستگرتن بەسەر مێشکی خۆمدا هەیە، بۆ گۆڕینی باسەکان لە فیکرو مێشکی خۆمدا زوو دەتوانم بیرکردنەوەکانم بگۆڕم، چونکە مرۆڤی تەندروست لە باری دەرونی توانای ڕاگرتنی بیرکردنەوە و هەست و سۆزی خۆی هەیە ئەگەر ساغ بێت، لەپڕ باسێکی مێژوویم دەهێنا بە مێشکی خۆمدا، ئینجا دەمگۆڕی بۆ تەفسیر، یان بۆ باسێکی هونەری و سینەماو فیلم، یان بۆ باسێکی فیزیایی. دڵنیا

بووم لەوەی ئەمە هیچ پەیوەندی نییە بە باری دەروونییەوە، لە ڕووی دەروونییەوە زۆر سەلامەتم سوپاس بۆ خوا، چونکە تەرکیزم لەسەر هەموو شتەکان لەجاران باشتر بوو. خۆشم تاڕادەیەك لێکۆڵینەوەم لەسەر زانستی دەرووناسی هەبوو (علم النفس).

چەند ڕۆژێکی تر چوومەوە هەمان جێگا، لەگەڵ خێزانم و منداڵەکانمدا بۆ ماسی گرتن دوایی سەیر دەکەم کابرا لەسەربەردێك وەستاوە بە دووری ٦٠ بۆ ٧٠ مەتر لە ئێمەوە ماسی دەگرێت. منیش هاوارم کرد، بەڵام بە عەرەبی وتم (مرحبا أبو ابليس).. هەر وەڵامیشی نەدامەوە.

بۆم کرد بە فارسی وتم: ئاغای ئیبلیس خستە نباشی، وەڵام نەبوو..

کردم بەکوردی وتم شەیتان .. سەیری ئەکردم وەڵامی نەبوو.

خێزانم: ئەرێ ماکوان ئەوە تێکچووی بۆ وادەکەیت، ئەو پیاوە دەناسیت؟

ماکوان: ئەی چۆن!

خێزانم: کێیە؟

ماکوان: هاوڕێمە

خێزانم: ئەی بۆ وەڵامت ناداتەوە، ناوی چییە؟

ماکوان: وەڵلا نازانم ناوی چییە، بەس هەر دەیناسم.

خێزانم: وازی لێ بێنە خەریکی ماسیگرتنی خۆت بە مادام وەڵام ناداتەوە تۆش ئیهمالی کە.

خەریکبوو دڵم ئەتەقی من قولاپم هەڵئەدا یەك ماسیم نەدەگرت، ئەو قولاپی هەڵئەدا جاری واهەبوو شەش ماسی بەیەك جار دەردەهێنا.

زوو زووش خێزانم دەیووت سەیری ئەو پیاوەکە چۆن ماسی دەردەهێنێت.

بەخێزانم وت دەچمە نزیکی ئەو، ئاگات لە منداڵەکان بێت هەرچی وتی عەیبەو مەڕۆ، گوێم بەقسەی نەدا، چوومە تەنیشتی.

ماکوان: ئەوە بانگت دەکەم بۆ وەڵام نادەیتەوە، چەقۆیەکم پێ بوو ماسیم پێ چاك دەکرد، پێمووت بێم چوار چەقۆت لێدەم و بتخمە ئەو ئاوە، بۆ وا لە من دەکەیت بتتۆپێنم وەك سەگ، بۆ خۆتت کردووە بە کەڕەی شەربەت؟ هەر جوابیشی نەدامەوە.

ئەوەندەی تر تورە بووم!

ئەوە بۆ من ناخۆش بوو دەمزانی خۆیەتی، بەڵام هەمان جلو بەرگو دەموچاو، ئەمجارە باشترین قولاپی پێیە، هەرئاوڕیش لە من ناداتەوە.

نیوکاتژمێر زیاتر لە تەنیشتی بووم، هەر قسەی لەگەڵ نەکردم لەوانەیە (٤٠) ماسی گرتبێت، منیش یەك ماسیم نەدەگرت.

دوای کەمێك ڕووی تێکردم ،بەنەرویجی وتی: ئەو ماسییانەی گرتوومە ببیبە بۆ خۆت من نامەوێت!

ماکوان: لە داخا بە کوردی پێمووت: (دە گوو بخۆ) بۆ بە کوردی قسە ناکەیت؟

شەیتان: بە کوردی، خێزانت هیچ نازانێت؟

وتم: نا هیچ نازانێت.

شەیتان: بۆیە خۆم تێنەگەیاندی ئەزانم بەشوێنمدا دەگەڕێیت، سبەینێ لە بازاری (ئویێست فۆڵد هاڵن) لە قاوەخانەیەك پێکەوە دادەنیشین و قسە دەکەین، بەس باکەس نەزانێت؟

ماکوان: تەلەفونەکەت چەندە؟

شەیتان: من بڕوام بە مۆبایل نیە و هەڵیناگرم.

شەیتان بەجێی هیشتم و ماسیەکانی جێهیشت و منیش بە خێزانم وت وەرە ئەو ماسیانە بخەینە ناو عەلاگەیەك با بیانبەینەوە.

خێزانیشم دەیوت ئەی ماڵی ئاوابێت، وەڵڵا نەرویجی وام نەدیوە ئەوەندە دەستو دڵی باش بێت،

خێزانم: ئەی خۆی بۆ نەیبردەوە؟

ئاخر وتی موجەمیدەکەمان زۆری تێدایە، هاتینەوە بۆ ماڵەوە، دەست بەجێ چووم بۆ لای کوڕێکی هاوڕێم، پێم وت بەیانی کاتژمێر(٣)دوای نیوەڕۆ من لە فلانە قاوەخانە دادەنیشم یان هەر لەناو ئەو بازاڕەدا بەدوامەوە بە کەسێك دەبینم چەند وێنەیەکمان بگرە بە ڤیدۆ و بە فۆتۆگراف.

هاوڕێکەم: باشە بەسەر چاو سبەینێ خۆم ئامادەکرد، ئامێری دەنگ تۆمار کردنەکەم خستە گیرفانم، بەهۆکاری- کاری ڕۆژنامەنووسی، هەمیشە ئەو ئامێرانەم هەیە، چوومە ناو بازاڕ شەیتان دیار نەبوو تا دووکاتژمێر چاوەڕێمان کرد هەر دیار نەبوو، زوو زووش هاوڕێکەم دەیوت دە تەلەفونێکی بۆ بکە.

لەدوای ئەوەی کە هیوام نەما لە هاتنی، بە هاوڕێکەمم وت: دەتوانیت بڕۆیت و زۆر سوپاسم کردو ماندوو نەبوونیم لێکرد منیش لەدەرگای پشتەوەی بازاڕەکەوە هاتمە دەرەوە، کەوتمە ڕێ بەرەو ماڵەوە لە نزیك ماڵی ئێمە پردێکی لێیە خەتی شەمەندەفەری لەسەرە، لە دوورەوە بینیم لەژێر پردەکە دانیشتووە، ئینجا دەوەرە زیڕە مەکە!

خۆم باداو چوومە پێشەوە لێی وتم: ئەوە عەیب ناکەیت نەهاتی لەسەر مەوعیدو پەیمانەکەت؟

شەیتان: ئەوە عەیب ناکەیت وێنەم دەگریت و خەڵکم بۆ دادەنێیت؟ ئێوەی مرۆڤ زۆر درۆزنن، درۆ دەکەن و دەیخەنە بەسەر مندا، منیش بەلەعنەت دەکەن.

ماکوان: ئەگەر شەیتان بیت قابیلتە هەر دەبێت وابکەین، بەڵام ڕاستدەکەیت من ئەوکارانەم ئەنجامداوە بەس تائێستا گومانم هەیە کە شەیتان بیت؟

شەیتان: من شەیتان نیم..

ماکوان: ئەی تۆ چیت؟

شەیتان: من جنۆكەم! ئێوە ناوتان ناوم شەیتان، وەرە بڕۆینە ئەو پاركە دانیشین لەوێ قسە دەكەین.

## دانیشتنی من و شەیتان بۆ یەكەمجار

لەگەڵ شەیتان كەوتمە رێ بەرەو باخچەو پاركێك كە داوای لێكردم بچینە ئەو جێگایە دانیشین، رازی بووم لە دواوەی دەرۆیشتم و جارو باریش لە تەنیشتییەوە، تەماشام دەكرد و لێی ورد دەبوومەوە مرۆڤێكی زۆر ئاسایی بوو، هیچ جیاوازییەكی نەبوو لەگەڵ خەڵكی تردا، من بۆ خۆم بێجگە ئەوەی ونبوونێكی لەپڕی نەبێت و زمانەكانی كە قسەی پێدەكرد هیچی ترم لێ بەدی نەكرد كە نا ئاسایی بێت.

ئەوەی كە سەرسامی كردم كاتێک لەگەڵیدا دەرۆیشتم هاورێیەكی خۆمم بینی، تەنها سڵاوی لە من كرد. وا هەستم دەكرد كە خەڵكی بە تەنها من دەبینن! بەهەر حاڵ، چووینە ناو پاركەكە و دانیشتین و دەستمان كرد بە قسە.

ماكوان: كاكە تۆ كێت و چیت و چیت لە من دەوێت؟

شەیتان: زۆرم لێت دەوێت، هەروا بە ئاسانی هەڵمنەبژاردویت، دڵنیابە بۆیە هاتوومەتە لات كارێكی زەروورم پێتە، تەنها بەتۆش دەكرێت!

ماكوان: سەر بەچی و كام موخابەرات تۆی ناردووە؟ پەیامەكەت چییە؟ ئینجا باشە بزانم ناوت چییە؟ من بە چ ناوێك بانگت بكەم، پێت باشە پێت بڵێم كاك شەیتان لەگەڵیشدا بەلەعنەت بیت واباشە، شەیتانی لەعنەتی؟

شەیتان: بە پێكەنینەوە.. ئاساییە، من ناوم (حەزقیل) ە! خەڵكی بیابانی مەغریبم.

ماکوان: ئەگەر لە بەر شەخسییەتم و کەسایەتی خۆم نەبێت، یەك شینە جرتم بۆ لێئەدایت، ناچار بووم بۆیە بەو شێوەو ئوسلوبە قسەی لەگەڵ بکەم تا زیاتر ڕاستییەکانی بزانم، لەدڵی خۆمدا وتم نەکو ڕابوێرێت.

سوێند بە خواکەی تۆ، درۆت لەگەڵ ناکەم، من جن م. شەیتان،

ئینجا دە وەرە ماکوان ئەو دڵەت شەق نەبات، ئەو بەردەوام جەختی لەسەر جنۆکە بوونی خۆی دەکردەوە، ناچار بڕوام کرد.

ماکوان: ئەی کاک حەزقیل ئەوە نیە وەك من مرۆڤی؟

حەزقیل: نا- بۆ زانیاریت ئەوە لاشەی کەسێکی ئەمەریکییە، بەکاری دێنم نزیکەی حەوت ساڵە مردووە، ناوی (فرانك)ە- و بە ڕەچەڵەك خەڵکی ئەڵمانیایە، بەهیچ شێوەیەك و هیچ مرۆڤێک ناتوانێت ئێمە ببینێت، مەگەر خۆمان لەسەر شێوەی ئاژەڵ یاخود مرۆڤ نیشان بدەین، ئەویش بە ئارەزوو و ویستی خۆمانە کەی دەردەکەوین کەی لا دەچین، هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بە ئارەزووی دڵی ئێمە بانگ بکات یاخود دەستەمۆمان بکات، بەڵام ئەگەر گرێبەند هەبێت لە نێوانماندا و لەسەر بنەمای عەقدێك دەتوانین هاوکاری یەکتر بکەین.

ماکوان: جا چۆن بزانم تۆ ڕاست دەکەیت کە جنۆکەیت، نیشانەیەکی خۆتم بدەرێ تا بڕوا بکەم؟

حەزقیل: لەڕاستیدا من جنۆکە نیم! من لە عەشیرەتێکی ترم بەناوی عیفریت.

خەریك بوو جەڵدە لێمبدات، من بە جنۆکە ڕازی بووم. واعیفریتیشی هاتەسەر.

ماکوان: ئەی کاك حەزقیل، عیفریت چییە بێزەحمەت، ئینجا من چیت بۆ بکەم و چیم پێدەکریت، ئایا تۆ موسڵمانی یان شەیتانی؟

حەزقیل: ماکوان گیان من دەزانم قورسە بڕوا کردن، بەڵام تۆ مرۆڤێکی ئیمانداری منیش تا ئێستا لە کۆمەڵی شەیتانم و عەقد و پەیمانێك لە نێوانی من و ئەواندا هەیە بۆ سڕینەوەی ئەو پەیمان نامەیە هاتووم بۆڵات و ئەوە کارەکەی منە کە تۆ بۆم بکەیت، من زۆر بەنهێنی و بەدزییەوە هاتووم بۆ لات، ئەگەر بێت و هاوکاریم بکەیت زۆر سوپاست دەکەم و موسڵمانیش دەبم.

ماکوان: ئاخر من چۆن بزانم کە تۆ لە بەنی بەشەر نیت و ئادەمیزاد نیت، ئیشەکە چییە پێم بڵێ با هاوکاریت بکەم.

حەزقیل: پێت دەڵێم، بەڵام پێشتر دەبێت سوێندم بۆ بخۆیت کە هەرچیم وت بەقسەم بکەیت.

ماکوان: زۆر تووڕە بووم، چونکە من بەقسەی کەس ناکەم ئەگەر زۆرم لێبکات، ئەوەندە یاری بە ئەقڵم دەکرد ئیتر بە تەواوەتی هەڵچووم قسەکەی تووڕەی کردم کە هەرچی بڵێت بەقسەی بکەم، خۆشم هەر دەمویست دەستی تێوەبدەم بزانم دەستم ناچێت بەناوەوە شەبەح نیە.

هەڵسامەوە بۆی، ئێخەیم گرت بەدەنگی بەرز وتم: هیچوپوچ ئەم یاریکردنە چییە بەئەقڵم؟ من بێ ئەقڵم و وەك تۆ سوکم کە گوێم بۆ تۆ

گرتووە، بتخنکێنم وەك سەگ؟ خوێری کوڕی خوێڕی ئەو کابرایە ڕەنگی زەرد بوو، ترسام بەدەستمەوە بمرێت، هەندێك خەڵکیش لەپارکەکەدا تەماشای منیان دەکرد، بەڵام سەیرکردنەکەیان زۆر ئاسایی بوو بۆ من، وەك ئەوە وابوو کە تەنها خۆم بم و دەنگم بەرزکردبێتەوە، کەس گوێی پێنەدام، بەڵام حەزقیل ترسا ئاگام لێ بوو چەند جار بەساقەم بوو، ڕەنگی زۆر گۆڕاو ترسی پێوەدیار بوو.

حەزقیل: ئارامەبە، من قسەت لەگەڵ دەکەم بۆ وا تورە بوویت حەیای خۆت مەبە لێرە و شەرمکە تەمەنم لە تۆ گەورەترە.

ماکوان: ئەی تۆچیت خۆت بناسێنە؟

حەزقیل: من عیفریتم، تەماشام بکە.. سەیری ئەو بەنزینخانەیە بکە کەپرەکەی دەبینی؟

ماکوان: کە ئاوڕم دایەوە بۆ بەنزینخانەکە حەزقیل لەسەر سەربانی بەنزیخانەکە وەستابوو! دوای چەند چرکەیەك لەویدا نەما، هاتەوە تەنیشتم وتی تەماشای ئەو کلێسایە بکە کە سەیرم کرد لەسەر سەربانی کلێساکە بینم، کە دووری منو کلّیسا و بەنزیخانەکە چەند کیلۆمەترێك دەبوو خێرا دەگەڕایەوە لام.

دەوەرە ئینجا ئەو دڵەت شەق نەبات.

حەزقیل: دەبینی چەندە بەتوانام؟

ماکوان: وەڵاهی سەگباب تۆ ساحیری.

خۆ نەدەکرا بڵێم پۆلیست بۆ بانگ دەکەم ئەو لە چرکەیەکدا دەچووە جێگایەکی تر و دەهاتەوە.

ماکوان: کاکە چیت دەوێت پێم بڵێ؟

حەزقیل: ماکوان تۆ هەندێك زانستت لایە فێرم بکە، منیش هەندێك زانستم لایە تۆی فێر دەکەم، لەوانەشە ببمە موسڵمان.

ماکوان: باشە چییە و چیت دەوێت؟

حەزقیل: کتێبێکت ئەدەمێ بخوێنەرەوە زانستەکە لەوەدایە.

ماکوان: ئەی زانستەکەی من چییە تا بدەمێ؟

حەزقیل: کاتی خۆی دێت و لە جێگای خۆیدا پێت دەڵێم.

کتێبێکی لە پشتیەوە دەرهێنا لە مەخطوطاتی کۆن دەچوو، لەوەدا بوو بۆم باس بکات.

برادەرێکی کوردی ڕۆژهەڵات هاتە لام و سڵاوی بەتەنها لە من کرد و وتی: کاک ماکوان خێرە بەتەنها لێرەدا دانیشتوویت؟

عەرزمکرد قوربان چی بێ لە جەنابت نهێنی، ئارەزووی شیعرم بوو، ئیتر حەزم کرد لەم سرووشتەدا دابنیشم و ئەو ئیلهامە شیعرییە لە دەروون و دڵمادایە دەریبڕم.

وتم: نەکو لەدوورەوە منی بینیبێت کە لەبەر خۆمەوە قسەم کردبێت بڵێت ماکوان شێت بووە! با هیچ نەبێت بزانێت خەریکی شیعر نووسینم.

ئەو برادەرە وتی وەڵڵا هیچ کارم نەبووە هەر حەزم کردووە سڵاوێکت لێبکەم، منیش عەرزمکرد خۆشحاڵت کردم خوا پاداشتت بداتەوە.

ئەو ڕۆیشت، حەزقیل نەما، کتێبەکەشم لێوەرنەگرت.

لەداخا نەمدەزانی چی بکەم، هاوار بکەم بانگی بکەم، نابێت. ئاخر کاکی برا کەی کاتی سەلام و چۆنی وچاکی بوو ژوانەکەی ئێمەیان تێکدا، چۆن بگەڕێم بەشوێن ئەم حەزقیلە عیفریتەدا ئەمەش بۆ خۆی خەمێکی ترە.

هاتمەوە بۆ ماڵەوە زۆر بێزار بووم، بۆ بەیانی دەبوو بڕۆم بۆ کار. ئەو جێگایەشی کاری لێدەکەم بۆ خۆی هەر ترسناك بوو، شوێنی سەربڕینی قەل و مریشك بوو، من دەبوو ئامێرەکان پاك بکەمەوە سەرلەنوێ لەدوای پاکردنەوەی ئامادەی بکەمەوە بۆ ڕۆژێکی نوێ و بەرنامەی بکەمەوە واتا پڕۆگرامێرەی بکەمەوە، جێگای کارەکەم نزیکەی کاتژمێرێك زیاتر لە ماڵەکەمەوە دوور بوو بە سەیارە، لە جێگایەك بوو ناوی «میسن» بوو. وەك هەموو ڕۆژانی ئاسایی چوومەوە سەرکارەکەم، دوو ڕۆژ خەریکی کار کردن بووم .

سەری سێیەم ڕۆژ .. تەماشا دەکەم لە پشتی بەرپرسەکەی منەوە دەڕوات و بە من دەڵێت: وەرە لە جێگای ئیسراحەتییەکە با یەکتر ببینین کارم پێتە، منیش وتم باشە.

وەڵا بەرپرسەکەم هات وتی ماکوان ئیشێکت هەبوو؟

ماکوان: نا- تەنها خۆشیت، ماندووم دەچم پشوویەك ئەدەم.

بەرپرسەکەم: فەرموو کارێکی باش دەکەیت.

چوومە شوێنی پشوودانەکە..

قاوەیەکم تێکرد دانیشتم و بەرەو ڕووم هات بە یەك پەرداخ ئاوەوە وامزانی بۆ خۆی هێناوە کەچی لەبەردەم مندا داینا و وتی فەرمووو!

## ئەیەوێت لە ڕێگای کتێبەکەیەوە بچیتە ناو لاشەم

لەدوای ئەوەی دانیشتم و پەرداخێك ئاوی بۆ هێنام لەبەردەمم داینا.

وامزانی خۆی دەیخواتەوە کەچی وتی: بۆ تۆم هێناوە، منیش لەڕاستیدا ترسامو نەمخواردەوەو وتم تینووم نییە.

بەهەرحاڵ کەوتینەوە قسە و باسەکانمان و پێمووت ئەو ڕۆژە چیت لێهات؟ بۆ ڕۆیشتی بێ ئەوەی هیچ بڵێیت؟

حەزقیل: ئاخر- هاوڕێکەت هاتە لات و منیش بۆم نەبوو بوەستم لەلاتاندا، دوای چۆن بەیەکترت دەناساندین؟

ماکوان: جا ئەوەکەی موشکیلەیە، ئەمووت کاک حەزقێلی عیفریتە یان باوەڕی دەکرد یان وا دەزانێت بۆ خۆشیی وادەڵێم! بەهەر حاڵ کوا کتێبەکە؟ بمدەرێ، بزانم چی تێدا نوسراوە؟

حەزقیل: من کتێبەکەت ئەدەمێ، بەڵام دەبێت بیخوێنیتەوە.

ماکوان: قابیلە پاقلەی تیا بفرۆشم هەر دەیخوێنمەوە، کتێب هەر بۆ خوێندنەوەیە! کوا بمدەرێ.

حەزقیل: ئاخر تۆ ناتوانیت بیخوێنیتەوە، هەندێك شتی تێدایە دەبێت فێرت بکەم.

ماکوان: بۆ بەچ زمانێك نوسراوە؟

حەزقیل: ئەو کتێبە بەکام زمان دەڵێیت هەیە.

ماکوان: بەڕاست! ئادەی نیشانم بدە؟

لەپشتی دەرهێنا و نیشانی دام و پیتەکانی کوردی و عەرەبی تێدابوو، واتا زۆربەی نووسین بوو، لەگەڵ ژمارەدا. بەسەرەو هەڵگەڕاوی و هیچ مانا و مەفهومێکم لێبەدی نەکردو ویستم دەستی بدەمێ و بیخەمە سەر کۆشمو بیخوێنمەوە تەماشای لاپەڕەکانی بکەم نەیهێشت دەستم بیگاتێ و هەڵیگرتو نای بەسنگییەوە، لە دوورەوە وتی تەماشای بکە چەند لاپەڕەیەکی هەڵدایەوە هەندێك خەت و خطوطی تێدا بوو، هیچی لێتەنەگەیشتم.

ماکوان: ئەوە بۆ نامدەیتێ ئەمە چییە خۆ - قورئان نیە ئاوا نات بەسنگتەوە؟

حەزقیل: نا ماکوان- بتدەمێ یان لای من بێت هیچی لێتێناگەیت، دەبێت خۆم فێری ئەم زانستەت بکەم؟

ماکوان: زانستی چی ئەوە هەموو پیتەو خەتەکانی دەڵێی شەڕە پشیلەیە. هەندێك وشەی عەرەبیم بەدی کرد وەك قورئان وابوو نەمزانی قورئانە یان- نا، چونکە باش نەم بینی بە هەڵگەڕاوی نووسرابوو، بەهەرحاڵ نەیدامێ و هەر دەیووت دەبێت خۆم فێرت بکەم، وتم باشە فێرم بکە.

حەزقیل: دەبێت سوێندم بۆ بخۆیت کە لەقسەم دەرناچیت و هەرچیم پێووتیت بەقسەم بکەیت، تۆش چیت بوێت بۆت دەکەم؟

ماکوان: من ئەو ڕۆژە لەسەر چی پەلامارم دایت، ئاخر چۆن تۆ هەرچی بڵێیت بەقسەت دەکەم. ئەی وا کوفر بوو، وا شتی ناشەرعی بوو، بەدڵنیاییەوە بەقسەت ناکەم، من ئەوەی پێویستمە لە خوای داوا دەکەم تۆچیت تا تۆ شتم بۆ بکەیت؟

حەزقیل: ئۆف ماکوان لەدەست تۆ، خۆت بیخوێنەرەوە بزانە چییە، بەڵام کە خوێندتەوە بە موسیقاوە بیخوێنەرەوە، ئەگەر تێنەگەیشتی دوایی خۆم بۆت ڕوون دەکەمەوە هەرکاتێك پێویستت بەمن بوو، بانگم بکە، بڵێ: (حەزقیلی کوڕی سومیا وەرە لام، بەناوی باو باپیرانتەوە بانگت دەکەم و وەڵام بدەوە بەزوویی) ئیتر منیش دێمە لات، بەڵام باکتێبەکە هیچ کەس نەیبنێت، باشە؟

ماکوان: باشە- بەس من بەناوی خوای پەروەردگارم خەڵک بانگ دەکەم نەك باوباپیرت، لەدڵی خۆشما وامدانا لێی وەربگرم و نیشانی خەڵکی شارەزای بدەم. ئەی بۆ نەڵێم بەناوی خوای گەورە وەرە بۆ لام؟

حەزقیل: هەرکەس و بەشێوەیەك بانگ دەکرێت، هەیە بەتەلەفون بانگی دەکەیت، هەیە بە سەیارە دەچیتە لای، تۆش دەتوانیت بەو شێوەیە بانگم بکەیت.

لەم قسانە دا بووم هاوکارەکانم خۆیانکرد بە ژووردا. کوڕێکی فەلەسطینی و عێراقی بەیکەوە خۆیانکرد بەژووردا، عێراقییەکە ناوی ماجید بوو یەکسەر دەستی دایە پەرداخە ئاوەکەو خواردیەوە وتی چەندە ساردو خۆش بوو ئەوە ئاوەت لەکەوێ بوو؟ بەدەم گۆرانی (کاظم ساهیر)ەوە بیرمە گۆرانییەکە (احبنی بلا عقد)ی بوو هاتە ژوورەوە، تا- لای دەرگاکە

ڕۆیشتوو بەڕەقسکردن و دەستێکی بۆ من باداو بە هێواشی وتی یەکتر دەبینینەوە، حەزقیلیش هیچ خۆی تێك نەدا.

کوڕە فەلەسطینییەکە ناوی طەها بوو، وتی ماکوان نوێژەکانمان بکەین بەجەماعەت. کاتی نوێژی عەسر بوو، نوێژمان کردو من چوومەوە سەرکارەکەی خۆم.

ئەو کتێبە بووە مەراقی مێشکم و ئەو شەوە خەوم لێنەکەوت، بەیانی پەیوەندیم کرد بە کوڕێکی هاوڕێم لە ئۆسلۆ.

ماکوان: کێ شارەزایە لەبواری جنۆکەو سیحر و ئەو باسانەدا؟

هاوڕێکەم: ماکوان کەسێك هەیە لە شارەکەی خۆت ناوی (عەلی) یە و خەڵکی یەمەنە، زۆر شارەزایە.

کەوای وت زۆرم پێخۆش بوو، کارەکەم ئاسانتر بوو. ژمارەی تەلەفون و ئەدرەسەکەیم وەرگرت و تەلەفونم بۆ کرد و کاتم دانا بۆ ئەوەی لە مزگەوت ببینم.

چووم لەسەر مەوعیدەکەم و لە مزگەوتی خۆمان بینیم، ناسیاوی خۆم دەرچوو، لەمزگەوت پێشتر تەعاروفمان کرد بوو، بەڵام وەك تێکەڵی - تێکڵاویم نەکردبوو، تا بڵێیت کوڕی بە ئەدەب و خاوەن ڕەوشت بوو، یەمەنییش بە گشتی سرووشتیان وایە خەڵکێکی بەڕێزو دڵ ناسك و هەمیشە دەم بە پێکەنینن.

هەموو باسەکەم بۆ گێڕایەوە، سەری داخست و تۆزێك بیدەنگ بوو، لەدڵی خۆمدا وتم: بەخوا بڕوام پێ ناکات، دەڵێ ئەم کابرا شێت بووە هاتووە بۆلام.

سەری بەرزکردووە وتی: ئەبوو ئاناء (بە لەقەبی ئەبو ئاناء بانگی کردم)، وەك ڕێزێك پاشان وتی: هیچت لەکتێبەکە خوێندەوە؟ وتم نەوەڵلا، هەر نەیهێشت ببینم، زوو لێیسەندم لە خۆشیدا(٣) جار وتی (احسنت، احسنت، احسنت) زۆر سوپاسی خوای کرد.

ماکوان: چییە ئەبو حەسەن؟

ئەبوحەسەن: ئەبو ئاناء باشتر نەتخوێندەوە، ئەوە ویستیویەتی سیحرت لێبکات، ئەگەر بتخوێندایەتەوە بە هۆکاری ئەو سیحرە دەچووە ناو لاشەت. بزانە کام ساحیر یان شەیتان ناردوویانە! بۆ ئەوەی بچێتە ناو لاشەتەوە، پێشتر هەوڵیداوە نەیتوانیوە بۆیە ناچار کراوە خۆی ئاشکرا بکات و بەوشێوە بچێتە ناو لاشەت و ئازارت بدات و تووشی سەرئێشەو و ناڕەحەتی دەروونیت بکات، ئەوە قەرینەکەتە یاخود پەیوەندی بە قەرینەکەتەوە هەیە.

ماکوان: قەرین چییە؟ وەڵلاهی منت ترساند ئەبو حەسەن، جا بۆ سیحرم لێدەکەن ئیشی چییە بەناو لاشەی من؟

ئەبوحەسەن: بزانە کێ ناردوویەتی، ئەگەر ویستت ئەیسوتێنین یان ڕاوی دەنێین یان هەولبدە، بەڵکو بیکەیت بە موسڵمان. ئەی نازانیت چ ئایینێکی هەیە؟ نەصرانییە؟ یەهودییە؟ چ دینێکی هەیە یان لە شەیتانە؟

ماکوان: وەڵلاهی نازانم ئەبو حەسەن، ئەو پرسیارانەم لێنەکردووە.

ئەبوحەسەن: ناوی نازانیت؟

ماکوان: با پێم تی ناوی حەزقیلە.

ئەبوحەسەن: ڕاستدەکەیت، بیرم چوو، ئەو ناوە لەوانەیە جولەکە بێت، بەڵام مەرجیش نیە، چونکە ناوی سەیرو سەمەرەیان هەیە. بەهەرحاڵ، تۆ هەموو شەوێك کە خەوتی ئایەتەلکورسی بخوێنەوە و ١٠٠ جار بڵێ (لا اله الا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد يحي ويميت وهو على كل شي قدير)، هەوڵ بدە سەرەتای سوڕەتی (البقرة) بخوێنە تا ئایەتی ٢٤ یاخود ٣٠ پارێزراو دەبیت، بەڵام ئەگەر هاتەوە نە هیچی لێوەرگرە، نەهیچی بدەرێ، نە هیچ بەدەستی بخۆیت و بخۆیتەوە.

ماکوان: ئەو وشە نهێنییەی کە داویەتی پێم بەناوی حەزقیل کوری سومیا نازانم بەناوی باوباپیرانیەوە بانگی بکەم نایەت بۆلام؟

ئەبوحەسەن: لەوانەیە بێت بۆلات. ئەو دەیەوێت تووشی شیرکت بکات و خۆی بنوێنێت و بە حسابی خۆی دەیەوێت خۆی وا نیشان بدات کە لەبەردەستدا موسەخەر دەبێت! بەس ئاگاداربە ئەوانە درۆزنن و زۆر درۆدەکەن تەنها دەیەوێت هەڵتخلەتێنیت و بۆ کارێك بەکارت بنێت تا بچێتە ناو لاشەت یان تووشی نەخۆشی (صرع)ت بکات!

ماکوان: (صرع) چییە؟ واتا سەر ئێشە؟

ئەبوحەسەن: بەڵێ واتا سەرئێشە، بەڵام سەرئێشەیەکی قورسە هیچ دکتۆرو دەرمانێك چارەی ناکات، تا خۆیان لەبەردەستی خۆیاندا دەستە مۆت دەکەن و کەی ویستتان ئازارەکەت بۆ دەنێرن و کە ئیشی کوفرو تاوانت پێدەکەن و سەرئێشەکەت چاك دەکەن. جاری واهەیە لەدڵەوە کوفرت پێدەکەن، باشە ئەی نەت زانی نێرە یان مێینەیە؟

ماکوان: وەڵڵا وەك باسم کرد لە سەر شێوەی پیاو هاتووە، بۆ نێرو مێشیان هەیە؟

ئەبوحەسەن: بەڵێ هەیانە، ئەوەنیە پێغەمبەری خوا (درووددی خوای لێبێت) دەفەرمویت: (اللهم اني اعوذ بك من الخبث والخبائث)، ئەوە مەبەست بە نێرینەو مێینەکانیان، مێیینەکانیان زۆر خەتەرو ترسناکن! مەرجیش نیە ئەوەی لەسەر شێوەی پیاو هاتووە ئیتر نێر بێت!

ماکوان: ئەی من ناتوانم موسەخەری بکەم لەبەر دەستی خۆمدا بەکاری بهێنم، شتی وانابێت؟

ئەو حەسەن: ئەوە موستەحیلە و هەرگیز نابێت، هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت موسەخەریان بکات، مەگەر بەیەك شێوە. ئەوان چیان وت تۆ بۆیان بکەیت، ئینجا ئەوانیش شتت بە قسە دەکەن ئەویش دەبیتە ساحیر خوا پەنامان بدات کە لە زومرەی شەیتان حساب دەکرێت! چونکە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: لە دوای پێغەمبەر سولیمان -سەلامی خوای لێبیت- موسەخەر نابن بۆ کەسی تر، لەبەر دوعاکەی پێغەمبەر سولەیمان لە قورئاندا دوعاکەی هەیە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ۝٣٥﴾ [ص]

وتی: پەروەردگارا لێم خۆش ببە و دەسەڵاتێکم پێببەخشە کە دەست نەدات بۆ کەسی تر لە دوای خۆم، چونکە بەڕاستی تەنها تۆ بەخشێنەری هەموو ناز و نیعمەتێکیت.

لەبەر ئەوە- ئەوەی دەڵێت: جنۆکەو شەیتانم بۆ موسەخەرە، درۆدەکات یان قورئان بەدرۆدەخاتەوە، کە حاشا ناتوانێت قورئان بەدرۆ بخاتەوە، بەڵکو تەنها درۆکردنە.

ماکوان: باشە من ئێستا چی بکەم؟

ئەبوحەسەن: هەروەك پێم وتی هیچ، ئەو زیکرو ئایەتانە بخوێنەوە و پارێزراو دەبیت.

بەهیچ شێوەیەك بانگی نەکەیت، بەو وشانەی کەداویەتی بە تۆ باشە.

ماکوان: باشە، بەڵام هیچ کاریگەری نیە بۆ ماڵو منداڵەکانم؟

ئەبوحەسەن: نا- بەمەرجێك هیچ مامەڵەیەکی لەگەڵ نەکەیت و هیچ نەخۆیت بەدەستی، ئەو کتێبەش کە نیشانیداوی نەیخوێنییەوە، چونکە ئەوە هەمووی کوفرە بە شێوەی خۆیان نوسیوویانە. وەرە با بچین بۆ ماڵی ئێمە کتێبێکم هەیە بتدەمێ بیخوێنەرەوە باسی چۆنیەتی خۆپاراستنی مرۆڤە لە شەیتان.

ماکوان: باشە براکەم، فەرموو.

خواحافیزمان لەیەك کردو کتێبەکەی دامێ بەناوی (وقاية الإنسان من الجن والشيطان) نووسەرەکەی (وحيد عبد السلام بالي) کتێبێکی زۆر نایابە.

# سوتاندنی حەزقیل

لەدوای ئەوەی لای عەلی یەمەنی تەواو بووم گەڕامەوەماڵەوە، ژیانی ئاسایی خۆمم دەکرد. ماوەیەکی زۆر هیچ دیاردەیەك لەو باس و خواست و خۆ نیشاندانی حەزقیلە ڕووی نەدا و کەش و ڕەوشەکە زۆر ئاسایی بوو لەلام.

بەفرێکی زۆر باری بوو جادە زۆر خز بوو لە کار دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە لە نزیك شارەکەی خۆمان کۆنترۆڵی ناسنامەی شۆفیری دانرا بوو، سەیارەکان ڕیزیان بەستبوو زۆر بە هێواشی دەڕۆشتین لەپڕ دەرگای پێشەوەی کردەوە و دانیشت.

حەزقیل: ماکوان چییە، لەگەڵ عەلی باسی چیتان دەکرد؟

ماکوان: جا- کە ئەزانیت چووم بۆ لای عەلی و دەشزانیت باسی چیمان کردووە ئیتر بۆ دەپرسی.

حەزقیل: نا- نازانم خۆ من زانستی غەیبی (علم الغیب) نازانم.

ماکوان: ئەتەوێت چی بەدەست بێنیت لە من؟

ئەتەوێت بچیتە لاشەی منەوە، ئیزعاجم بکەیت؟

حەزقیل: نا من چۆن شتی وا دەکەم. ئەوە عەلی یەمەنی بۆی باسکردویت، درۆ دەکات.

ماكوان: تۆ درۆ دەكەیت. تۆ درۆزنیت. عەلی فێری كرووم كە چۆن بتسوتێنم (ئەڵبەت نەشم دەزانی چۆن دەسوتێت هەر قسەیەك بوو كردم)، فێری كردووم چۆن ڕسوای دنیاو قیامەتت بكەم، ئادەی پێم بڵێ تۆ سەر بەكام ئایین و دینیت؟

هەستم كرد زۆر ترسا كە تورە بووم لەدڵی خۆمدا وتم: ئەی ترسێنم، لە ڕاستیشدا منیش ترسام وتم نەكو- لە پڕ پەلامارم بدات، ناچار زۆر بە هێواشی دەڕۆشتم، خۆشم ئارام كردەوە، نەكوئەویش تورەبێت، هەستم كرد زۆر ترسا كاتێك وتم دەتسوتینم.

حەزقیل: دەڕۆم

ماكوان: بۆ كوێ دەڕۆیت؟ بۆ هەر جێگایەك بڕۆیت لە دەستم دەرناچیت، تۆ قەرینی منیت.

حەزقیل: عەلی چی فێر كردی؟

ماكوان: ئەوە كێشەی تۆ نییە! پێم بڵێ كێ تۆی ناردووە؟ بۆچی دەتەوێت بچیتە لاشەی منەوە؟

حەزقیل: من نامەوێت لەڕاستیدا بچمە لاشەی تۆ، بەڵام گروپەكەمان منیان هەڵبژاردوە بچمە ناو لاشەی تۆ.

ماكوان: گروپی چی؟

حەزقیل: ئێمە گروپێکین لەبەردەست ساحیرێکی فارس کار دەکەین، ئەویش لە کەسێکی هیندییەوە فێر بووە، گەورەکەی ئێمەش لە جنۆکەکان داوای کردووە بچمە لاشەی تۆوە.

ماکوان: بەخوا ئەگەر راست قسە نەکەیت ئێستا دەچم بۆ لای عەلی و بەیەکەوە ئەتسوتێنین، زۆر بەو قسەیە دەترسا منیش هەستم دەکرد وەك منداڵ بترسێنم وابوو، بەڵام چەکێکی باش بوو بەدەستمەوە خوای گەورە لەوکاتەدا ئەو قسەیەی خستە دڵمەوە.

حەزقیل: ماکوان بەڕاستی قسەت بۆ دەکەم، بەڵام تۆش واز لەعەلی یەمەنی بێنە.

ماکوان: من واز لە عەلی ناهێنم، ئەگەر تۆ راستگۆ بیت من ئیشم بە عەلی یەمەنی نییە، تەنها پێم بڵێ تۆ کارت چییە بەمن و بۆ ناردویتیان بۆ لای من؟

حەزقیل: واز لە عەلی یەمەنی بێنە هەموو شتێکت پێدەڵێم؟

ماکوان: بەخوا تۆ بۆ سوتاندن باشی، هەر ئێستا دەچم بۆ لای عەلی، با جارێ تەلەفونێکی بۆ بکەم .. خێرا تەلەفونم دەرهێناو جەرەسم لێدا بۆ عەلی و دوای چۆنی چاکی، وتم ئەبو حەسەن ئەڵێی چی دەست بکەین بە سوتاندی حەزقیلی هیچ و پوچ!

عەلی یەمەنی بە تەلەفون: جا لەوە ئاسانتر هەیە کەی ویستت بە یەك چرکە دەیسوتێنم (هذا الامر سهل).

ئەتووت عەلی ئاگای لەمنە کە وای وت، حەزقیل وتی دائەبەزم ئەڕۆم زیرەی کرد.

ماکوان: نا، دەی قسەم بۆ بکە و ئاقڵ بە با نەچم بۆ لای عەلی

حەزقیل: ماکوان سویند بە الله هەموو قسەیەکت بۆ دەکەم بەس ئێستا نا- دەبێت بڕۆم، چونکە ئاگایان لێمانە و با سەیارەکەشت وەرنەگێڕن.

ماکوان: کەوتی با سەیارەکەشت وەرنەگەڕێنن زۆر ترسام، وتم باشە کەی دێیتەوە بۆلام؟

حەزقیل: بە نزیکترین کات

ماکوان: وەعد؟

حەزقیل: وەعد بێت.

حەزقیل دابەزی و لە ئاوێنەکەوە هەر چاوم لێبوو تا خۆی کرد بە کۆڵانێکدا لەبەر چاوم ون بوو.. منیش ڕێك تەلەفونم کردەوە بۆ عەلی و وتم لە کوێیت؟ دێم بۆلات؟

چووم بۆ لای عەلی.

عەلی: ماکوان ئەوکاتەی تەلەفونەکەت بۆ کردم حەزقیل لەگەڵتا بوو ؟

ماکوان: بەڵێ.

عەلی: زانیم، بۆیە وا وەڵامم دایتەوە.

ماکوان: ئەبوحەسەن هەڕەشەی کرد لێم گوایە سەیارەکەم وەردەگەڕێنن؟

عەلی: درۆ دەکەن ناتوانن، بەس خۆ فشکردنەوەیە. مادام هیچت بەدەستیان نەخواردوە و هیچت لێوەرنەگرتوون طەلیسم نەکراویت، ناتوانن.

ماکوان: با ماسیم لێوەرگرتوە ئەوکاتەی ماسییەکانم لێسەند ژەمێکم خواردووە لێی و ئەوی تریشی لە موجەمیدەدایە؟

عەلی: شتێك کە ساغ بوو دەسەڵاتیان بەسەریدا نییە مەگەر تام و بۆنی بگۆڕن، ئاو، شیر، خواردنی کاڵ ناتوانن دەستکاری بکەن ئاساییە وەك گۆشتی حەیوان ومریشك و ماسی ..هتد

ماکوان: ئەی چی کاریگەری ئەوانی هەیە بەسەریەوە؟

عەلی: هەموو جۆرە مەشروبێك، جۆرەکانی سرکە، ترشیات، خواردنی کوڵاو سەر دانەپۆشراو، خواردنی ساردبووە بوو، خواردنەوەی کۆن وەك شەربەتی زۆر کۆن و گیراوە، قاپ نەیشۆیت دووجار خواردنی تێدا بەکار بهێنیت و هەرشتێك لە ئەصلی خۆی دەربچێت. ماست کە دا نەپۆشرابێت، پەنیر سەری نەنرابێتەوە..هتد

ماکوان: ماسی ئاساییە؟

عەلی: ئاساییە

هەرچەندە عەلی وتی ئاساییە، بەڵام کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە هەموو ماسییەکانم فڕێدا.

عەلی: بۆ زانیاریت ئەبوو ئاناء ئەوانە زۆر ترسنۆکن هەمیشە ئەوان لە مرۆڤ دەترسن هیچ توانا و دەسەڵاتێکیان بەسەر مرۆڤدا نییە ، مەگەر مرۆڤەکە خۆی بواری بۆ بکاتەوە، هەر مرۆڤەکانن خۆیان وا دەکەن بچنە لاشەیان؟

ماکوان: بەچی بواریان بۆ دەکرێتەوە؟

عەلی: بەهەڵواسینی ڕەسمی ڕووت لە ماڵدا واتا پیاو و ژنی نامەحرەم، گوێگرتن لە گۆرانی و مۆسیقای زۆر، نەکردنی نوێژو زیکری خوای پەروەردگار، خۆدانەپۆشین، ترسان لە جنۆکە و باوێشکدان و دەستنەگرتن بەدەمەوە .. لەهەمانکاتدا نەوتنی- (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم).. پژمین و نەوتنی الحمد لله.. سەیرکردنی فیلمی ڕووت، خۆ ڕووتکردنەوە بۆ پیاو و ژن، چوونە تەوالێت و شت خواردن و خواردنەوە لە تەوالێتدا، ناشکوری کردن و سوپاس گوزاری نەکەیت، لەسەر نانخواردن بسم الله- نەکەیت، جنێو دان بە دایك و باوك، یاخود شەڕە جنێوی نێوان خەڵکی بەدایك و خوشکی یەکتر، گاڵتەو گەپی زۆر ...وە هەروەها زۆر شتی دیکە.

ماکوان: جا عەلی گیان بە حسابی تۆ بێت جنۆکە لەلاشەی ئەو خەڵکەدا دووگۆڵی دەکات، کێ هەیە لەمانە بەدوور بێت، یەك دوانێك لەو صیفاتانەی نەبێت، ئاخر با تۆزێك واقعی بین، خۆ من زۆربەی ئەوانەم تێدانیە کەچی هاتوە بۆلای منیش؟

عەلی: (بە پێکەنینەوە) .. مانای وانیە هەرکەس ئەو کارەی کرد ئیتر یەکسەر بچنە لاشەیەوە، واتا بەردەوامی لەسەر ئەو کارە خراپانەی کە باسمان کرد، دەست نیشانی ئەو قەرین و شەیتانانەی کە ئامادەن بۆ ئەو

کارە، خۆ مەرج نیە هەموو جنۆکە و شەیتانێك بچنە ناو لاشەی خەڵکی، چوونە ناو لاشەی خەڵکی بۆ جنۆکە و شەیتانەکان کارێکی هەروا ئاسان نییە، بگرە قورسترین کارە و زۆر پێیان ناخۆشە، چونکە زۆر ئازاری ئەوانیش ئەدات، بەڵام کە یەکجار چوونە ناو لاشەی کەسێك ئیتر هاتن وچوون ئاسان دەبێت!

ماکوان: باشە گریمان وا هاتە لاشەی منەوە ئەی ئەگەر ئەو تەحەکوم بکات و من بۆ خۆی موسەخەر بکات، ئەی قەزاو قەدەری خوای چی بەسەر دێت؟

یاخود من تاوانم نیە لەو حاڵەتەدا، ئەگەر کاری خراپەش بکەم لەدەسەڵاتی مندا نیە، وایە؟

یان بابڵێین ئەگەر جنۆکە لە لاشەی مندا بێت لە ڕووی شەرعییەوە من هەرچی بکەم ئەحکامی لەسەر دانامەزرێت من بڵێم چی خۆ من نەمکردووە جنۆکەکان کردوویانە بۆ نمونە: ئەگەر سەیارەکەم بفرۆشم ئەو فرۆشتنە باطلە؟

یاخود خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ئەو کەسانەی کە ریبا دەخۆن شەیتان چۆتە لاشەیانەوە.

﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾﴾ [البقرة]

واتە: ئەوانەی کە سوو دەخۆن، هەڵسوکەوتیان وەك ئەو کەسە وایە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێت (هەر لە دنیادا سرووشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە (لە حاڵێکدا کە): خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردوەو سووی حەرام کردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێ گەیی و وازی هێنا، ئەوەی دەستی کەوتووە، بۆ خۆی، کاری (لێپرسینەوەشی) دەکەوێتە لای خوا، بەڵام ئەوەی دەست بکاتەوە بە سووخۆریی، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیادا دەبەنەسەر.

ئەی ئەمەیان چییە وچۆن تەفسیری دەکەیت؟

یاخود پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لێبێت) دەفەرمویت: شەیتان بە ناودەمارو خوێنی مرۆڤدا دێتو دەڕوات ئەی ئەمەم چۆن بۆ تەفسیر دەکەی؟

یان هەردەچنە لاشەی موسڵمانەوە ئەی بۆ ناچنە لاشەی خەڵکی تر واتا بێجگە موسڵمان، بۆناچێتە ناو کافرێك مولحیدێك..هتد؟

ئاخر پێم بڵێ ئەی خوای گەورە نافەرموێت شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی نیە بەسەرتاندا، ئەی ئەم هیچوپوچە بۆ دەچیتە لاشەمانەوە؟ ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ

﴿وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٢٢﴾﴾ [إبراهيم]

واتە: (کاتێ هەمووشت تەواو دەبێت بەهەشتییەکان دەچنە بەهەشتەوە و دۆزەخییەکان دەخرێنە دۆزەخەوە) شەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قسەو (ڕوو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پێ ڕاگەیاندبوون منیش بەڵێنی درۆو نادروستم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەسوەسە سەوخەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناسی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە، بێ بیرکردنەوە بەقسەتان کردم، ئەمڕۆ) من ناتوانم بەهاناو هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبوو بەشەریك و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن.

ئەی ئەمە مانای وانیە هیچ تواناو دەسەڵاتێکی نیە؟

# ئەوەی من دیم یاخوا کەس نەیبنێت

لەدوای ئەوەی کۆمەڵێك پرسیارم ئاڕاستەی عەلی کرد، کە وەڵام بداتەوە، عەلی هەوڵیدا وەڵامی یەك بەیەکی پرسیارەکانم بداتەوە، بەڵام دیار بوو نەیدەویست لە خۆیەوە وەڵام بداتەوە. بۆیە چووە لای کۆمپیتەرەکەی و هەندێك کاتی بەسەر بردو منیش، بەدیارییەوە دۆش دامابووم.

عەلی وتی: بۆ وەڵامی پرسیارەکانت شتێکم دەستکەووتوە لە کتێبخانەی شامیلەدا، لە کتێبێك بەناوی (عالم الجنو الشیاطین، الدکتور عمر سلیمان الأشقر).

یەکەم: پرسیارت کرد لەوەی کە قەزاوقەدەری خوای گەورە ڕۆڵی چی دەبێت لەکاتی جنۆکە چوونە ناو لاشەوە؟

لەوەڵامدا دەڵێم بە پشتیوانی خوا ئەوەی کە ڕوودەدات بۆ خۆی قەزاو قەدەری خوای پەروەردگارە، قەزا واتا دروستکردن و بونیاتنان، قەدەریش واتا ڕوودان. ئەو کەسەی کە دەبێتە هۆکاری ڕوودانەکە مرۆڤەکە خۆیەتی! بەهۆکاری خراپەی خۆیەتی، یاخود دووریەتی لە ئاینی خوای گەورە، یان نەزانیەتی لە زانستی شەرعی بۆیە توشی ئەو قەدەرە دەبێت خۆی قەزای کردووە! پاشان بەهیچ شێوەیەك مرۆڤی موسڵمان موسەخەر نابێت بۆ جنۆکەو شەیتان، مەگەر خۆی مەبەستی بێتو لەتاوانەوە موسەخەری بکەن بۆ خۆشییەکانی خۆی ئاوا دەکەوێتە دەست شەیتان.

دووەم: دەڵێیت، من تاوانم چییە لەو حاڵەتەدا ئەگەر بێنە ناولاشەم، ئەگەر کاری خراپەش بکەم لەدەسەڵاتی مندا نیە؟

لەوەڵامدا دەڵێم: بەهۆکاری تاوان و خراپەکاری مرۆڤەکان خۆیانەوە ئەو کارانەیان تووش دەبێت، کەواتە خۆی بەرپرسە لەو حاڵەتە مرۆڤەکە هەنگاوی هەڵهێناوەتەوە بۆ ئەوەی جنۆکە بچێتە لاشەی، ئەی بۆ ناچێتە لاشەی موسڵمانی پابەند بەدینی خوای گەورە.

سێیەم: دەڵێیت، ئەگەر جنۆکە بێتە لاشەی منەوە ئەحکامی شەرعی لەسەر دانامەزرێت؟ ئایا ئەگەر هەر شتێك بفرۆشم، یاخود بۆنمونە ژن تەلاق بدرێت، یان بە پێچەوانەوە ژن داوای تەلاق بکات، ئایا وەك شێتییە قەڵەمی عەفوی بەسەردا دێت؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەشدا بە پشتیوانی خوا دەڵێم: نەخێر هەموو ئەحکامێکی لەسەر دادەمەزرێت، چونکە مرۆڤەکە ئەمری پێدەکەن و ئاگای لە خۆیەتی خاوەن توانای تەواوە، بەڵام هەر هۆکارەکەی خۆیەتی وای کردووە کە کەتۆتە ئەو بارە نارەحەتی و ئازارە دەروونیە ناخۆشەوە، چونکە شەیتان و جنۆکە کافرەکان بە دووشێوە کار دەکەن.

یەکەم جار بە وەسوەسە، دوایی بە مەسس واتا چوونە ناولاشە، ئینجا بە صرع (پەرکەم) ئازارو نەخۆشی زۆر، کەزۆر جار مرۆڤەکە بە قسەیان ناکات تووشی ئەو نارەحەتییەی دەکەن.

تەنانەت هەندێك لە موسڵمانان ئەم سێ قۆناغەی کاری جنۆکە و شەیتانەکان لەیەك جیاناکەنەوە هەمووی هەر بەوەسوەسە دەزانرێت، بەڵام لەڕاستیدا قۆناغن تا کۆتاییەکەی، بەکافرکردنی کۆتایی دێت، یاخود

دەیکەنە ساحیر. سەرەتا بەوەسوەسە: کەسەکە نوێژ ناکات ڕۆژوو ناگرێت، قورئان ناخوێنێت، بەنیەتێکی پاك زکری خوا ناکات، هەموو بێشەرعیەك دەکات، ئەمە خۆی هۆکارە بۆ خراپ بوون، لە کاتێکدا تووشی ناڕەحەتییەك دەبێت، ١٠٠ جنۆکەی لێکۆدەبێتەوە خراپی دەکەن و دەچیتە ناو لاشەی و موسەخەری دەکەن کەواتە خۆی تاوانبارە.

چوارەم: کەنمونەی ئەو ئایەتەت هێنایەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ٢٧٥﴾ [البقرة]

واتە: ئەوانەی کە سوو دەخۆن، هەڵس و کەوتیان وەك ئەو کەسە وایە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێت (هەر لە دنیادا سرووشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە (لە حاڵێکدا کە): خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردوەو سووی حەرام کردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێ گەیی و وازی هێنا، ئەوەی دەستی کەوتووە، بۆ خۆی، کاری (لێپرسینەوەشی) دەکەوێتە لای خوا، بەڵام ئەوەی دەست بکاتەوە بە سووخۆریی، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیادا دەبەنەسەر.

کەواتە وەك ئەوان وایە، نەك حاڵەتەکە لەوانیشدابێت، چونکە بوارە دەروونییەکە قورسەو وەك نەخۆش هەژماریان دەکات.

پێنجەم: پرسیارت کرد ئایا شەیتان بە ناو لاشەی مرۆڤدا دەڕوات؟

لەوەڵامدا دەڵێم: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) واقیعەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەچێتە ناو لاشەی مرۆڤ وەك خوێن بەناو دەمارەکانیدا دەڕواتو کۆنترۆڵی دەکات و بە خوێندنی زیکرو ڕووقیەی شەرعی دەڕوات، کەواتە دەبێت جیاوازی لە نێوانی دوو بواردا بکرێت وەسوەسە کە شەیتان دروستی دەکات، چوونە ناو لاشە کە وەك خوێن بەدەزولەو دەماردا دەڕوات لە کاتێکدا مرۆڤ دوورە لە ئاینی خوای گەورەوە.

شەشەم: دەڵێیت، بۆ هەر دەچنە ناو لاشەی موسڵمانەوە؟

لەوەڵامدا دەڵێم وانیە، بەڵکو دەچنە ناو لاشەی هەموو مرۆڤێکی لاوازەوە جا کافرە، موسڵمانە، مولحیدە، نەصرانییە یاخود یەهودییە. ئەوان ڕقیان لە مرۆڤە، بەلایانەوە ئاساییە کە سەرزەوی تێك بدەن چونکە ژیانی مرۆڤیان خۆش ناوێت، دەتوانیت تەماشای یوتوب بکەیت بە سەدان بەرنامەی تێدایە باسی جن دەکات بە زمانەکانی جیهانی و ئایینەکانی تر کەچوونەتە ناو لاشەی مرۆڤەکانەوە موسڵمانیش نین، زۆرترین حاڵەتی تووشبوو لە ئەوروپایە!

حەوتەم: دەڵێیت ئەی باشە خوای گەورە دەفەرموێت شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی نیە بەسەر مرۆڤەکاندا؟

لە وەڵامی ئەوەشدا دەڵێم: لەڕاستیدا وایە هیچ دەسەڵاتی نیە، ئەگەر مرۆڤەکە خۆی بۆ نەکاتەوە، مرۆڤەکان خۆیان ئەو دەسەڵاتە ئەدەنە

شەیتان. هەروەك خۆت ئایەتەکەت باسکرد خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت:

﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ [إبراهيم]

خوای گەورە ئاگاداری کردووینەتەوە کە کامە چاکەیەو کامە خراپەیە، کامە حەلاڵەو کامە حەرامە کە خۆمان دەیکەین و شەیتان ئیشی جوانکردنیەتی، ئێمەش بەدەمیەوە دەچین خۆمان دەسەڵاتی ئەدەینێ و بەقسەی دەکەین و شەیتان دەکەینە خوای خۆمان.

ماکوان: (بارك الله فيكم اخي عەلی) گیان دەستت خۆش بۆ وەڵامەکانت ئەم دوعایەشت بۆ دەکەم (جزاك الله خيرا و رزقك طيرا و زوجك من حور العين).

عەلی: ماکوان من دوو جنۆکەی هاوڕێی موسڵمانم هەیە پێت بناسێنم؟

ماکوان: وەڵا نۆرەی ئەمانەن، عەلی گیان خۆمان رەفیقمان کەمە ئینجا جنۆکەیش بکەین بە ڕەفیق و هاوڕێمان. کورە من گیرم بەدەست دانەیەکەوە خواردوە ئێستا تۆ دوانی ترم پێدەناسێنیت؟

عەلی: ماکوان ئەمانە موسڵمانن زۆر جنۆکەی باش و بەڕێزو خواناسن. ئێمەیان زۆر خۆش دەوێت ئەمانە ئەوەندە خواپەرستن وەك فریشتە خوا دەپەرستن، جا ئەگەر هاوڕێیەتی ئەم جۆرە جنۆکانە دەکەیت هەرگیز شەیتان نایەت بۆ لات؟

ماکوان: دەی باشە با ئەوانیش بناسین بانگیان کە؟

عەلی: لێرە نین لە یەمەنن دەبێت بڕۆین بۆ لایان.

ماکوان: باشتر عەلی گیان کە چووی بۆلایان سەلامی منیان لێبکە، من ئیشم پێیان نییە.

عەلی: بۆ نایەی بڕۆین بۆ یەمەن بۆ لایان؟

ماکوان: جا بۆچی بێم بۆ یەمەن بۆ بینینی ئەوان من ڕۆژانە حووسیەکان و جەماعەتی عەلی عەبدوڵلا ساڵح دەبینم لەشەیتان خراپتر دەکەن، لەگەڵ هێزەکانی سعودی و ئیماراتی..هتد

عەلی: بڕوا بکە.. ماکوان ناوچەکانی یەمەن شاخاوی و دارستاناوییە زۆر لە نەرویج جوانترن، ئینجا ئەوێ پڕیەتی لە جنۆکە. من کەسێك دەناسم یەکێکە لە گەورە ساحیرەکان لە یەمەن ئەچین بۆ لای ئەو تۆبەی کردووە الحمد الله.

ماکوان: عەلی گیان من نایەم تۆ خۆت بڕۆ بۆلای ئەو پڕیەتی لە جنۆکە. من گیرم بەدەست دانەیەکەوە خواردوە تۆش دەڵێی پڕیەتی (مليء بالجن) من ئێستا چی بکەم؟

عەلی: هیچ تۆ هەتا بە چاكی زیكرەكان و لەكاتی خەوتن ئایەتەلكورسی و نوێژەكانت لە كاتی خۆیدا بكەیت بە تایبەت بەیانیان و عیشاء، پارێزراو دەبیت لە خودی شەیتانی گەورەش.

ماكوان: گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بەردەوام خەریكی ژیانی ئاسایی خۆم بووم، نە حەزقیل دیار بوو نەكەس. سوپاس بۆ خوا ماوەیەكی دوورو درێژ چاوم بە چاوی نەكەوت.

بۆ ماوەی هەفتەیەك مۆڵەتم لە كارەكەم وەرگرت، هەندێك كاری تایبەتم هەبوو ئەنجامی بدەم.

من زۆر بە دارستان و شاخ و سەردەریا ئارەزوومەندم، حەزم بە سروشتی خوای پەروەردگارە، ڕۆژێكیان بە خێزانم وت: زۆرم خواردووە حەزدەكەم بڕۆم بگەڕێم تۆزێك بەو دارستانانەدا نایەیت بەیكەوە بڕۆین؟

خێزانم وتی ئیشم زۆرە بڕۆ بۆ جارێكیتر.

منیش وردە وردە كەوتمە ڕێ چوومە سەر شاخو ناو دارستان بە پێ بگەڕێم.. سبحان الله چیم دی.

هەرچی ئافرەتی جوان بوو لەناو ئەو دارستانەدا بوو، ئەهاتن دەڕۆشتن بەلامدا. پیاوێكم نەدی، هەمووی ئافرەتی ناسكو كچی شاز و شەدەلارو نازدار و جوان و باڵا بەرزو نازەنین بوون. هەمووی بەنازەوە پێئەكەنین بەدەمەوە. ئەی خوای پەروەردگار فریام كەویت، ئەم هەموو جوانە چییە؟ بەلاما دێن و دەڕۆن بە پێكەنین.

کەشوهەوای ناو دارستان و بناری دۆڵێکە دامێنی هەور داویەتی لەزەوی لەهەندێك جێگادا بۆنی دارستان و ئەو هەموو سروشتە جوانە بەو هەموو ئافرەتە جوانە هەمووی سەرسامی کردبووم. چەندە ئافرەتم ئەدی ئەوەندەش ئاسکی جوان و شاخ درێژم دەبینی. ڕێگام لێ هەڵە بووبوو نەمدەزانی ڕووەو کوێ بڕۆم.

وتم با پرسیارێك لەم کچانە بکەم ئەوە فێستیڤاڵە یان کەرنەڤاڵە؟ چییە ئەم ناوە بۆ بەو شێوە قەرەباڵغە؟

هەرچی هاوارم کرد بە نەرویجی وەڵام نەبوو هەر نزیك دەبوومە لەیەکێك لەو کچانە زیاتر دوور دەکەوتنەوە، بەئینگلیزی هاوارم کرد کەس وەڵامی نەئەدامەوە. ئاسکەکان ڕەوەزیان دەکرد، کچەکان بریقەیان دەهات. جارو بار بەدەستیان سەگی ڕەشم دەبینی ، ئیتر ترسام خۆشم نەمدەزانی لەکوێدام. ئەوەی لە خەیاڵی مندا نەمابوو یان بیرو هۆشم بەلایدا نەدەڕۆیشت قورئان خوێندن بوو. هەستم دەکرد سنگم زۆر تووند بووە، هەناسەم بۆ نادرێت، ناچار وەستام بیرم کەوتەوە خۆ من قورئان دەزانم ئایەتەلکورسیم خوێند، وەك ئاوێکی بەخوڕ لە سەرمەوە بۆ بنی پێم خۆشیو ڕەحەتی بەگیانمدا هات، ئینجا مەعوزەتەینم خوێند واتا- قل اعوذ برب الفلق و قل اعوذ برب الناس.. قل هوالله الاحد.. ٣ جار لەسەر یەك.

هاتمەوە دۆخی ئاسایی و ڕێگای خۆمم دۆزییەوە بە زوویی گەڕامەوە، نزیك بوومەوە لە ئاوەدانی لەڕێگا حەزقیلم دی ٤ مانگ دەبوو نەمدی بوو، تەماشام کرد ئاناء ی کچمی بەدەستەوەیە!

## سەسیل و كەڕامات و دوو كتێبی نوێ

لە گەشتەكەم گەڕامەوە، ئاناءی كچمم بەدەستی حەزقیلە وە بینی، بەپەلە ڕامكرد. ڕاكردنێك ئەوەندە خێرا ڕامكرد هەرچی مووی گیانم بەرزببوویەوە، ئەوەندە بە توڕەیی ڕامكرد وتم هەر دەیخنكێنم.

كە نزیك بوومەوە ئەویش ڕایكردو نەما.

خێرا تەلەفونم بۆ ماڵەوە كرد، بە خێزانم وت: هیچمان پێویست نیە، هیچ خۆمم تێكنەدا، هەستم كرد خێزانم زۆر ئاساییە.

خێزانم: نەخێر

ماكوان: ئەی ئاناء چی دەكات؟

خێزانم: یاری دەكات

ماكوان: ئادەی بمدەرێ با قسەی لەگەڵ بكەم، وتم ئاناء گیان هیچت ناوێت بۆ بكڕم؟ بۆ ئەوەی دڵنیابم ئەوەی كە دیم ڕاست نەبوو.

ئاناء: بابە، وەڵا بۆیەی نینۆكم دەوێت، كێكم دەوێت، دۆندرمەم دەوێت، مەساسەم دەوێت، میزەڵانم دەوێت.. سێ چوار شتی تریشی وت بە نەرویجی كە من ناوەكانی نازانم بەكوردی چییە.

هەناسەیەكی خۆشیم هەڵكێشاو سوپاسی خوای پەروەردگارم كرد، لە دڵی خۆمدا وتم: من دەبێت پەیوەندی بكەمەوە بە عەلی یەمەنییەوە ئەو ڕەوشەم بۆ تەفسیر بكات. هەر بەرگەی دووجاری تری وادەگرم.

تەلەفونم كرد بۆ عەلی یەمەنی چەند جار زەنگم بۆ لێدا هەڵینەگرت، نامەیەكی بۆ ناردم، نووسیبووی من لە یەمەنم ئەوا مانگێكە هاتوومەتەوە بۆ یەمەن، بەمنزیكانە دەگەڕێمەوە.

وەڵامی نامەكەم داوە بۆم نوسی ژمارەكەی یەمەنتم بدەرێ با تەلەفونت بۆ بكەم؟

وەڵامی دامەوەو نووسیبووی، من لە سعودیەم دوو ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە بۆ یەمەن ئەوكات ژمارەكەت ئەدەمێ.

بۆم نووسی ئیشم پێتە ژمارەیەكی سعودیەم بدەرێ قسەت لەگەڵ بكەم؟

ژمارەیەكی بۆناردم، ژمارەكە م لێداو دەستمكرد بە قسە كردن لەگەڵیدا، ئەوەی بەسەرمدا هاتبوو بۆم باس كرد.. لە ئافرەتەكان و لە ئاسك و..هتد، بینینی منداڵەكەم بەدەست جنۆكەكەوە، بەڵام ڕاست نەبوو.

عەلی: زانیاریم نیە بابگەڕێمەوە قسەت لەگەڵ دەكەم

هیچ هیوایەكم نەما نەمدەزانی چی بكەم، ڕۆژان دەڕۆیشت ژیان ئاسایی دەبووەوە.

ئێوارەیەك لە مزگەوت گەڕامەوە بەرەو ماڵ، پیاوێكی نوورانی جوان بە جلوبەرگی سپیەوە هاتە لام.

پیاوە نوورانیەکە: ماکوان کوڕم باشی، ئەو دەم و چاوەم تەنها لە فلیمی مێژوویدا بینی بوو شتێکی زۆر خەیاڵی هاتە بەرچاوم لە فیلمی عیسای کوڕی مەریەم دەچوو بە پیری، پیاوێکی ڕیشسپی درێژ و جوان و باڵا بەرز قژی لەسەر شانی بوو. بەزمانی کوردی قسەی لەگەڵ کردم.

پیاوە نوورانیەکە: من یەکێکم لە پیاو چاکانی خوا، پێشتر بۆ باوك و باپیریشت هاوکار بووین، من لەمەودوا هەمیشە لەگەڵتا دەبم، بێخەمبە ناهێڵم هیچ کەس ئازارت بدات.

ئەوەندە قسەی لەگەڵ کردم لە پڕ لەڕێگا دیار نەما و منیش لە خۆشیدا خەریك بوو سەیارەیەك بمکات بە ژێرەوە، هەزار جار سوپاسی خوام کردووە، دەموت خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ کەرامات نیشانی من ئەدەی.

من گەیشتومەتە ئەو ئاستە ببمە خاوەن کەرامات.

لەڕاستیدا زۆر دڵ خۆش بووم، تامەزرۆی بینینەوەی پیاوە پیرە جوانەکە بووم.

ئەی هاوار لەو خۆشیی و ئیمانەی لەدڵمدا دروست بووبوو!

بۆ ڕۆژی دوایی کابرای پیرە گەڕاییەوە بۆلام، بەڵام من دەڕۆیشتم بۆ سەرچاکردن لەناو بازاڕدا.

پیاوە نوورانیەکە: ماکوان دوو کتێبم بۆ داناوی، بەناوی (مەندەل و جەفرەش) کەی کاتت بوو بیانخوێنەرەوە.

ماکوان: قوربان بەرێزت ناوت چییە؟ چۆن بانگی جەنابتان بکەم؟

پیاوە نوورانیەکە: ناوم سەسیل کوڕی لەیلام ە.

ماکوان: ئەی جەنابت خەڵکی کوێت و چیت؟

سەسیل: من کەسێکی ڕوحانیم و وەك کەڕاماتێك خوا ناردوومی بۆ لای تۆ.

ماکوان: یاخوا بەخێر بێیت سەرچاوم، بۆ من ئەوەندە کەسێکی باشم؟

سەسیل: بەڵێ ماکوان تۆ یەکێکی لە ئەولیاو پیاو چاکانی خوا.

ماکوان: خوای گەورە لێمان قوبوڵ بکات، بەڵام بەخوا من ئەقڵم نایبڕێت خۆم پیاوچاك بم.

سەسیل: ماکوان کوڕی ئامینە، کتێبەکانت بدەمێ بیخوێنیتەوە؟

بەدەم قسەکردنەوە بەناو بازاڕدا دەڕۆیشتین، من بۆ لای دەلاك و ئەویش لەگەڵمدا دەهات، جلو بەرگی زۆر سەیر بوو، دەموچاوی زۆر نوورانی بوو. بۆم ساغ نەدەبووەوە کە کێیەو دەم وچاوی چۆن وەسف بکەم، شتەکان ڕوون نەبوو. جەزم دەکرد یەکێک ھەبینێت چۆنی و چاکییەکم لەگەڵ بکات، یاخود قسەیەکم لەگەڵ بکات، بەڵام هیچ ڕووینەدا.

ماکوان: سەسیلی بەڕێز ئەوکتیبانە چییە؟

سەسیل: ئەوە دوو کتێبی کۆنی پیاو چاکانن بەناوی مەندەل و جەفرەش، پارێزەرت دەبێت لە هەموو خراپەکارییەك و دەتوانیت زۆر لەنهێنی ناو ڕوحانی بزانیت، ئەوکاتەی کە فێری بووی و ناوەڕۆکی ئەم کتێبانەت زانی و خوێندەوە بە دەیان خزمەتکار لەگەڵت دەبن لە ڕوحانی و خزمەتت

دەکەن، زۆر دەوڵەمەند دەبیت و هەمووکەس دەستت ماچ دەکەن و دەبیتە گەورەو ئەولیاو شێخ و پیاوچاک و هەموو شتێکت دەبێت لەم دنیایەدا.

لەم قسانەدا بوو کە بینیم دە بۆ دوانزە کەس بە ڕێز و ئەدەبەوە دەستان لەبەر سکیاندا دانابوو رووەو من وەستا بوون بەچواردەورمدا، وتی ئەوانە خزمەتکاری تۆن و لەگەڵتا دەبن! بەڵام بە مەرجێك ئەو کتێبانە بخوێنەرەوە خۆشم دەبمە مامۆستات.

کتێبەکانی نیشان دام هەمان پەرتوکی حەزقیل بوو، هەمان خەت و خطوط و نووسینو ژمارەکان بوو!

ماکوان: جەنابی سەسیل.. ئەم کتێبە باسی چی دەکات؟

سەسیل: ئەوە ناوی پیاوچاکانە و زۆرێك لە تەفسیری ئیسلامی باطنیانەیە، کە هەموو کەس نایزانێت تەنها پیاو چاکان نەبێت، ئەوە زانستی باطنییە؟

ماکوان: ئەی بۆ قورئان نەخوێنم؟ ناوی پێغەمبەران و پیاوچاکانی تێدایە، ئەوە باشتر نیە لەم کتێبانە؟

سەسیل: بەدڵنیاییەوە قورئان باشترین کتێبە، بەڵام ئەمە تەفسیر و زیاتر راڤەی قورئانە دەیکات، بەڵام بە باطنی تەنها پیاوچاكان دەیزانن.

ماکوان: نووسەرەکانی ئەم دوو کتێبە کێییە ؟

سەسیل: پیاو چاکان؟

ماکوان: ناوی ئەو پیاو چاکانە بڵێ بێزەحمەت؟

سەسیل: من دەبێت بڕۆم و تۆش نزیکی دوکانی دەلاکەکەیت و قسە دەکەینەوە ماکوان کوڕی ئامینە!

ماکوان: ئەی کتێبەکانم نایدەیتێ جەنابی سەسیل؟

سەسیل: بۆ جارێکی تر ماکوان بڕۆ قژت چاك بکە یەکتر دەبینینەوە، ئەنگوستیلەیەك و تەزبیحێکیشت بۆ دێنم لەگەڵیدا بەدیاری، بەڵام دایمە دەبیت بخور دابگرسێنی بۆی.

بێ ئەوەی خوا حافیزی بکات دیار نەما، ئەم کابرایەش بووە مەراقی گیانم، هەرچی قسەکانیم تەماشا دەکرد و لێک ئەدایەوە، لە برای باوکی حەزقیل دەچوو.

بەدەموچاو جوان بوو، بەڵام ئەمیش بەساختەچی ئەهاتە بەرچاوم! ئەو دڵخۆشییەم نەما کە خۆم لە پیاو چاکان بم، لە دڵی خۆمدا وتم ئەم هەموو پۆخڵەواتە دێتە لای من. تۆ بڵێی منیش لەم پۆخڵەواتانە بم؟

خوایە گیان پەنا دەگرم بەتۆ فریام کەوە بێکەسم، تەنها لە تۆ داوادەکەم، لە گەلی یەکتاپەرست بم و دوور نەکەومەوە، لە ئەهلی تەوحید بم یارب العالمین، پەنا دەگرم بە تۆ لەشیرك و شەیتان.

دوای سەر چاکردنەکەم بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی عەسر چووم ، لە جەماعەت عەلیم بینی گەڕابووەوە لەیەمەن، وام زانی هەموو دنیا هی منە.

ماکوان: عەلی بۆ خاتری خوا ئێستا کاتی سەفەرە، وەرە چیم دیوە بۆت باس بکەم، ئەوەی بینیبووم بۆم گێڕایەوە، باسی ئەم سەسیلەشم بۆ گێڕایەوە.

عەلی: یەکەسەر بە پێکەنینەوە وتی: ئەوە شەیتانە، ئەوە شەیتانی گەورەیە، ئاگات لە خۆت بێت، نە پیاو چاکەو نە تەڕەماش هەڵبەت ئەو وتی نە (بطیخ )ە.

هەر کەسێك ناوی دایکی هێنا لە جیاتی ناوی باوکی ئەوە ساحیرو شەیاتینە و جنۆکەیە کاهین و مشعوذە، چونکە ساحیرەکان و جنۆکەکان و هەموو ناوی دایك بەکاردەهێنن لە جیاتی باوك. هەمیشە لە ناوی دایك دەپرسن نەك باوك، بەناوی دایکەوە خەڵکیش بانگ دەکەن.

عەلی: ئەبو ئاناء قسەم لەگەڵ جنۆکەکانی هاوڕێم کرد لە یەمەن باسی تۆم بۆ کردن سەلامیان لێدەکردی، بەم نزیکانەش دێن بۆ لامان! وەرە.. با بڕۆینە دەرەوەی مزگەوت زۆر شتت بۆ باس دەکەم.

لەوێ لە ساحیرێکم وەرگرتوە بەناوی (داود محمد فەرحات) ئێستا تۆبەی کردووە، باسی تۆشم بۆ کرد ژمارەکەم هێناو قسەی لەگەڵ دەکەین، بەڵام کێشەی داود ئەوەیە لە دێیەك دەژی نە شەبەکەی تەلەفونی تێدایە، نە ئینتەرنێتیش، دەبێت خەڵك بنێرم بۆلای تا کاتی لەگەڵ دابنێین بۆ قسە کردن.

## بۆچی جنۆكە دەچێتە ناو لاشەمان

لە دوای ئەوەی لەگەڵ عەلی یەمەنی لەمزگەوت هاتینە دەرەوە ، بەرەو ماڵی ئەوان چووم لەڕێگادا ئەوەم بۆ باس كرد ئیتر توانای ئەوەم نەماوە لەو ڕەوشە ماندوو بووم ، چونكە لە نێوانی نا ئارامی دەروونی وترس و بیمدا دەژیم و لەسەروو هەموویانەوە لەگەڵ مەخلوقێكدا مامەڵە دەكەم كە جێگای باوەڕی هەموو كەس نییە، لەوانەیە بڵێن ماكوان شێت بووە، جا بۆیە ئەبوحەسەن هەوڵ ئەدەم ئەوەی وەریدەگرم لە قورئان و سوونەتدایە، ئیتر بڕوا بەهیچ نەكەم جا ئەوی بۆت دەكرێت هاوكاریم بكە لەو پێوەرە دەرنەچێت.

ئینجا ئەمەوێت بزانم بۆچی ئەم جنۆكانە لە منیان پێچاوە، لە ناو ئەم جیهانەدا ڕوویانكردۆتە من، پەیوەندییان بە منەوە چییە ؟

عەلی: ئەبو ئاناء مەرج نییە پەیوەندی بە جنۆكەو دنیاو جیهانی ئەوانەوە بێت، لەوانەیە مرۆڤەكان بیانەوێت ئازاری تۆ بدەن و شێتت بكەن، یاخود جنۆكە بخەنە ناو لاشەتەوە، یان بیانەوێت بتكەن بە ساحیر!

ماكوان: جا من خراپەم بۆ كێ بووە، بۆ ئەیانەوێت ئازارم بدەن، هەست ناكەم دوژمنێكی وا گەورەم هەبێت، ئینجا من بۆ خۆم دەزانم بوون بە ساحیر كافر بوونە، یەكێكە لە تاوانە گەورەكان، ئەی چۆن من دەبم بەساحیرو خۆم كافرو بێدین دەكەم.

عەلی: نازانین جاریٚ کیٚ ناڵیٚت ئافرەتیٚك حەزی لیٚت نییە و بیەویٚت سیحرو جادووت لیٚبکات و نیٚوانی تۆ و خیٚزانت تیٚکبدات، چونکە ساحیرەکان هەمیشە نیٚوانی خەڵکی تیٚك ئەدەن، خۆ ناتوانن نیٚوانی خەڵکی باش بکەن، لەبەر ئەوەی ئەوانە جیهانی شەڕو خراپەکارین. خوای پەروەردگار لە قورئاندا ئەوەمان بۆ باس دەکات کە کاری یەکەمی ساحیرەکان جیاکردنەوە ژن و میٚردە لەیەکتری وەك دەڵیٚن: ڕەشکردنە لەبەرچاوی یەکتری، ئایەتەکە دەفەرمویٚت: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ١٠٢﴾ [البقرة]

واتە: هەندیٚ لەو (جولەکانە) شویٚنی ئەوە کەوتن، کە شەیتانەکان دەیانخویٚندەوە دەربارەی دەسەڵات و حکومەتی سولەیمان، (ئاشکرایە) کە هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافر بوون و خەلکیان فیٚری سیحرو جادوو دەکرد، هەروەها مەردومیان فیٚری ئەوە کرد کە بۆ هاروت و ماروت (کە دوو فریشتە بوون) لە بابل (دابەزیٚنرابوون بۆ تیٚگەیاندنی خەڵکی لە سیحرو جادوو)، ئەوانیش کەسیان فیٚری هیچ شتیٚك نەدەکرد تا پیٚیان نەوتایە: ئەم کارەی ئیٚمە بۆ تاقی کردنەوەیەو خۆت کافر

مەکە. (کەچی هەندێك هەر کۆڵیان نەداو) لەو فریشتانەوە شتی وا فێر دەبوون کە ژن و مێردی پێ لەیەك جودا بکەن، (هەرچەندە) ئەو جادوگەرانە ناتوانن هیچ زەرەرێك بە کەس بگەیەنن، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێ، ئەو خەڵکە سەرگەردانە هەمیشە فێری شتێك دەبن کە زیانیان لێدەداو سوودی نییە بۆیان، بێگومان دەشزانن ئەوەی کاڵای وا بکڕێ و شتی وا فێرببێ لەو دونیا هیچ بەهرەیەکی دەست ناکەوێت، (بەڕاستی) ئەو شتەی ئەوان خۆیان پێ فرۆشتووەو کەوتونەتە داویەوە شتێکی زۆر ناپەسەندە ئەگەر بزانن و تێبگەن.

یان کەسێك بیدینەو ڕقی لێتەو دەیەوێت ئازارت بدات، یاخود کاریگەریت هەیە لەسەر خەڵکی، ئەیانەوێت ئەو کاریگەرییە نەهێڵن، یان دەزگەیەکی موخابەراتییە، شتی تریش زۆرە.

ماکوان: ئەبو حەسەن.. هێواش.. هێواش.. تێمگەیەنە، شتەکەم لەسەر قورس مەکە، قسەکانت زۆر گەورە بوون بە جوانی با تێبگەم مەبەستەکەت لام ڕوون نییە.

عەلی: ئەو حاڵەتانەی کە تۆ باسی دەکەیت و بەسەرت هاتووە بۆت شیدەکەمەوە. حەزقیل کە سەرەتا خۆی نیشان داویت، ئەوە دڵنیابە بۆ ئەوەی بچێتە ناو لاشەت پێشتر کاری لەسەر کردوویت ، کە نەیتوانیوە ناچاربووە خۆی ئاشکرا بکات، هەڵتبخڵەتێنێت و لەڕێگایەکی ترەوە بچێتە ناو لاشەت، کاتێک کە ئەوەشی بۆ نەکراوە شەیتان خۆی هاتووە بۆ لات.

ماکوان: بۆچی ناتوانێت بچێته ناو لاشەمەوە، چوونه ناو لاشەی منەوە ئەوەنده قورسه ، ئەی ئەو شتانەی تر که دیومه چی بوون له ئافرەت و ئاسك و سەگ و.. هتد؟

عەلی: بەدڵنیاییەوە قورسه، تۆ له دوای نوێژ زیکرەکان و ویردەکان دەخوێنیت، ئەوە قەڵایەکی گەورەیە.

ڕۆژی بەلایەنی کەمەوە پێنج جار ئایەتەلکورسی دەخوێنیت ، بێجگە ئەوەش سەرباری هەمووی کەسێکی ئیماندارو خواناسیت، نوێژەکانت دەکەیت و ڕۆژوو و هەموو فەرزەکان جێبەجێ دەکەیت و حەجت کردووە. خۆت له حەڕام دەپارێزیت، ئەوە هەمووی قەڵغان و پەرژینه بۆ پاراستنی تۆ له خراپەکاران و شەیتانەکان، ئیتر شەیتان و جنۆکه تەنها ئەتوانن وەسوەسەت بۆ دروست بکەن، بەڵام ناتوانن بێنه ناو لاشەت. سەبارەت بەوەی که ئافرەتەکانت دیوه ئەوە هەموو شەیتان بوون، به ئافرەت و کچ و سەگ و ئاسکەوە، هەمووی هەڵخڵەتاندنی خەڵکی ئیمان لاوازه بۆ سەرسامکردن و چوونەوە بۆ ئەو جێگایانه، ئەمەشت زیاتر بۆ شیکاری دەکەم قسەکەم، پێبڕی و ئەم پرسیارەم کرد؟

ماکوان: به هۆکاری ئەوەی ناتوانن له من نزیك ببنەوە؟ ئەی ئازاری ماڵ و منداڵەکانم نادەن؟

عەلی: ئەشێت ئازاریان بدەن، بەڵام بەمەرجێك ماڵ و منداڵەکەت دوور له خوا بن، یان به گوێرەی پێویست پابەند نەبن به ئایینەوە و مولتەزیم نەبن، خۆیان بواری ئەوە بکەنەوە بۆ شەیتان و جنۆکەکان، بەڵام ئەگەر خواناس بوون هەروەك هەموو موسڵمانێکی ئاسایی ناتوانن نزیکت

ببنەوە، ئەگەر پەیمانت دانێ کاریان لەگەڵ بکەیت و شتت لێوەرگرتن و نزیکیان بوویتەوە کارت پێکردن و کاریان پێکردی، ئەوە ئەگەر خۆشت نەکوژن ماڵ و منداڵت لەناو دەبەن، چونکە خۆت ڕێگات بۆ کردوونەتەوە.

ماکوان: پەنا دەگرم بەخوا لەم جۆرە کارانە، خوای پەروەردگار بمانپارێزێت، ئەی ئەوشتانەی باست کرد لەسەر ئاسك و سەگ و ئافرەتەکان چییەو حەزقیل لەدوورەوە بە منداڵەکەی خۆمەوە خۆی نیشاندام؟

عەلی: شتێکی هەروا ئاسان نییە جیهانی شەڕەو تووشمان بووە، دەبێت خۆمان بپارێزین، چونکە ئەوان دوژمنایەتییەکی کۆنیان هەیە لەگەڵماندا تۆڵەمان لێدەکەنەوە.

دنیای ئەوان بۆ ئەوە دروست بوون کە لەگەڵ ئێمە شەڕ بکەن، پاشان ئەوەی کە تۆ بینیوتە زۆرێکی تر لە واقیعی خەڵکی تردا ڕوویداوە، بۆ نمونە هەمان کردار لە منداڵیدا لەگەڵ ساحیری گەورەی یەمەنی (داود محمد فەرحات) ڕوویداوە کە ئێستاش لە ژیاندایەو تۆبەی کردووە، لە مێژووشدا (حەسەنی کوڕی سەباح و ئیبنو عەطاش) دا کە دروستکەری باطنین [1]

لە شیعەی فاطمییەکانن، ئەوان گواستیانەوە بۆ واقعی سەرزەوی و لە جنۆکە و شەیتانەکانەوە وەریانگرتووە. باخیان دروست دەکرد ئافرەتیان تێ دەکردو خەڵکیان بەهۆکاری حەشیشە خومار دەکرد، بۆیەکەم جار گوڵی خاشخاش شیعەی فاطمی یان ئیسماعلی یان شیعەی حیشاشی پێدەڵێن دۆزیانەوە، لەڕاستیدا جنۆکەکان دۆزییانەوە، ئیمامی غەزالی لە

---

[1] -لە بەشی کۆتاییدا ئاماژەی پێدراوە.

کتێبی (فضائح الباطنية) باسی لێوە کردووە، کە بەکاری بهێنن بۆ خومارکردن و سەرخۆشکردنی خەڵکی بۆ ئەوەی هەرچی کاری پیاوکوشتن و تیرۆرە بیکەن و بە زوویی بگەڕێنەوە بۆ ئەو باخە، چونکە حەشیشەیان لێبڕاوە نەیاندەتوانی لەو باخە دوور بکەونەوە کە بچنە هەر جێگایەك بە زوویی بەگەڕێنەوە، پڕیان کردبوو لە ئافرەتی جوان. هیچ شیعەیەکی باطنی نەیدەتوانی لەو گروپە جیابێتەوە یان خۆی دەکوشت یان دەگەڕاوە بۆ باخەکەی (حەسەنی کوڕی سەباح و ئیبن و عەطاش)، ئەوان ئەو باخەیان بەکارهێنا، سەرەتا بیرۆکەکەی لە جنۆکە و شەیتانەکانەوە وەرگرتوە.

بەڵام باخو باخاتی جنۆکەکان خەیاڵییە، هیچت بۆ ناکرێت لەگەڵ ئافرەتەکان و حەیوانەکاندا، ئینجا زۆر جار مەرج نیە ئافرەتی جوان نیشان بدەن. زۆر جار لە کۆندا کە ئەهلی سەلەف گێڕاویانەتەوە لەوبارەیەوە جنۆکەکان خۆیان کردووە بە ئەسپی زۆر جوانی عەرەبی یاخود حوشتری بەوناوبانگ، یان جۆرە حەیوانێکی جوانی تر وەك ئەو ئاسکانەی تۆ دیوتە، یان بۆ خەڵکی تر خواردن و خواردنەوە نیشان ئەدەن وە هەروەها. ئەوەی کە تۆ و خەڵکی تریش زۆر بینیویانە کردەوەی شەیتانەو بۆ هەڵخڵەتاندنە.

ماکوان: ئەمانەی باستکرد بنەڕەتێکی هەیە لە قورئان و سونەتدا، جاران خۆیان کردووە بە ئەسپ ئێستا ناتوانن خۆیان بکەن بەسەیارە و فڕۆکە و شتی تر وەك ئامێری سەرنج ڕاکێش؟

عەلی: لە قورئان و سوننەت دا باسکراوە بەدڵنیاییەوە، بۆ نمونە ئەوەی کە دەڵێیت: ناتوانن خۆیان بکەن بە ئامێرو کەرستە ئەوە موستەحیلەو ئاستەمە و نابێت و ناتوانن، چونکە هیچ دەقێکی لەسەر نەهاتووە، بەڵام

بۆ ئەوەی بچنە سەر شێوەی ئاژەڵ و مرۆڤ بەدڵنیاییەوە دەتوانن یان لە ڕێگای پەیکەرێکەوە و یاخود دارێکەوە یان ڕەسمێکەوە دەنگ دەربکەن ئەمانە لە قورئان و سونەتدا بوونی هەیە.

بەڵگەی یەکەم لە قورئاندا کە شێوەی خۆیان دەخەنە سەر مرۆڤ لە سورەتی ئەنفالدایە و دەبینرێت خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾﴾ [الأنفال]

واتە: کاتێکیش شەیتان (بە وەسوەسەو خەیاڵ) هەموو کردەوە ناپەسەندو ناڕەواکانی بۆ ڕازاندنەوە،

وتی: ئەمڕۆ هیچ کەس دەرەقەتی ئێوە نایەت و دڵنیابن منیش پشت و پەنام بۆ ئێوە، جا کاتێک ئەو دوو لەشکرە یەکتریان بینی، دەستبەجێ شەیتان پاشەو پاش گەڕایەوەو وتی: بەڕاستی من بەریم لە ئێوە! چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، (دیارە کە شەیتان بینیوویەتی چۆن فریشتە دەستە دەستە دادەبەزن بۆ یارمەتی ئیمانداران، بۆیە لە ترسا وتی): بێگومان من لە خوا دەترسم، خوایش لە تۆڵەدا زۆر سەخت و بە زەبرە.

پاشان فەرمووده بەناوبانگەکەی ئەبوو هورەیرە کە شەیتان دەگرێت و لە کۆتاییدا فێری ئایەتەلکورسی دەکات[٢].

هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوەی خۆیان دەکەن بە ئاژەڵ لە قورئان و سوننەتدا هەیە[٣]

---

[٢]- هو معلق عند البخاري وهو موصول بسند صحيح عند النسائي - كما قاله الشيخ العلوان- وهو عنده في الكبرى ٣٥١/٩ ١٠٧٢٩- أَخْبَرَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ يَعْقُوبَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: وَكَّلَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ بِحفظ زَكَاة رَمَضَانَ، فَأَتَانِي آتٍ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ، فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ: لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: إِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ وَبِي حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ، فَخَلَّيْتُ عَنْهُ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، شَكَى حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالاً، فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، فَقَالَ: أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ، وَسَيَعُودُ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: إِنَّهُ سَيَعُودُ، فَرَصَدْتُهُ فَجَاءَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ فَقُلْتُ: لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: دَعْنِي فَإِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ وَلاَ أَعُودُ، فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺo: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، شَكَا حَاجَةً وَعِيَالاً، فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، فَقَالَ: أَمَا إِنَّهُ كَذَبَكَ، وَسَيَعُودُ فَرَصَدْتُهُ الثَّالِثَةَ فَجَاءَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ: لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ هَذَا آخِرُ ثَلاَثِ مَرَّاتٍ تَزْعُمُ أَنَّكَ لاَ تَعُودُ ثُمَّ تَعُودُ، قَالَ: دَعْنِي أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللهُ بِهَا، قُلْتُ: مَا هِيَ ؟ قَالَ: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ }اللهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ{ حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ، فَإِنَّهُ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبُكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ، فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ: مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَعَمَ أَنَّهُ يُعَلِّمُنِي كَلِمَاتٍ يَنْفَعُنِي اللهُ بِهَا فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، قَالَ: مَا هِيَ ؟ قَالَ لِي: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ مِنْ أَوَّلِهَا حَتَّى تَخْتِمَهَا} اللهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ{وَقَالَ: لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ وَلاَ يَقْرَبُكَ الشَّيْطَانُ حَتَّى تُصْبِحَ، وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الْخَيْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَمَا إِنَّهُ كَذُوبٌ وَقَدْ صَدَقَكَ، تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلاَثٍ، يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ فَقُلْتُ: لاَ، قَالَ: ذَلِكَ الشَّيْطَانُ.

[٣]- روى مسلم في صحيحه ،»عن أبي السائب مولى هشام بن زهرة أنه دخل على أبي سعيد الخدري في بيته، قال: فوجدته يصلي، فجلست أنتظره حتى يقضي صلاته، فسمعت تحريكا في عراجين في ناحية البيت، فالتفت فإذا حية، فوثبت لأقتلها، فأشار إلي أن اجلس، فجلست، فلما انصرف أشار إلى بيت في الدار فقال: أترى هذا البيت، فقلت: نعم، قال: كان فيه فتى منا حديث عهد بعرس، قال: فخرجنا مع رسول الله ﷺ إلى الخندق، فكان ذلك الفتى يستأذن رسول الله h بأنصاف النهار

لەپڕ تەلەفونکەی من لێیدا، خێزانم بوو

خێزانم: ماکوان لە کوێی؟ ئەتوانیت زوو بێیتەوە؟ ئاناء (تا)یەکی زۆری لێهاتووە!

ماکوان: ئێستا خێرا دەگەڕێمەوە و دەیبەین بۆ نەخۆشخانە.

عەلی: ماکوان زۆر هەڵەمان کرد ئەو قسەنەمان کرد، جنۆکەکان گوێیان لێبووە خوابکات هیچی خراپ ڕوو نەدات، نەدەبوو بەو شێوەیە قسە بکەین دەبوو هەندێك ڕێڕەوی تایبەتیم بگرتایەتە بەر لە زیکر و ویردەکان لە بیرم چووە، نەمزانی چیمان ووتوە، دڵنیابە ئاگایان لێمان بووە.

کە عەلی وای وت ئیتر من شێت بووم بەپەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە عەلیش لەگەڵمدا هات.

---

فيرجع إلى أهله، فاستأذنه يوما، فقال له رسول الله ﷺ: خذ عليك سلاحك، فإني أخشى عليك قريظة، فأخذ الرجل سلاحه ثم رجع، فإذا امرأته بين البابين قائمة، فأهوى إليها الرمح ليطعنها به، وأصابته غيرة، فقالت له: اكفف عليك رمحك وادخل البيت حتى تنظر ما الذي أخرجني، فدخل، فإذا بحية عظيمة منطوية على الفراش، فأهوى إليها بالرمح فانتظمها به، ثم خرج فركزه في الدار، فاضطربت عليه، فما يدرى أيهما كان أسرع موتا، الحية أم الفتى، قال: فجئنا إلى رسول الله ﷺ فذكرنا ذلك له، وقلنا: ادع الله يحييه لنا، فقال: استغفروا لصاحبكم، ثم قال: إن بالمدينة جنا قد أسلموا، فإذا رأيتم منهم شيئا فآذنوه ثلاثة أيام، فإن بدا لكم بعد ذلك فاقتلوه، فإنما هو شيطان»(صحيح مسلم:كتاب السلام ؛ باب قتل الحيات وغيرها)

## شێخ شاهین و جانتایەك پارە و شەیتان

بە پەلە گەڕامەوە ماڵەوە چوومە لای (ئاناء)ی کچم تاکەی ٣٩پلە بوو، منداڵ کاتێک پلەی گەرمی لەشی بچێتە چل پێویستە ببرێتە لای دوکتۆر، ماچم کرد.

خێزانم: ساردەمەنی زۆر خواردووە قورگی هاتۆتەوە یەك! هۆکارەکەی ئەوەیە زۆریشم پێووتوە، بەقسەی نەکردم تا ئاوا نەخۆش کەوت.

ڕووم کردە عەلی ئێمە کەدەچینە لای دکتۆر دوای چەند ساتێك یەکسەر بڕوای پێدەکەین وادەزانین ئەو سەرتۆپە.

دوای ماوەیەك بڕوا بەوەش دەکەین کە ساختەچیەو کڵاو دەکاتە سەرمان دوای ئەوە بڕوا بە هاوڕێکانمان دەکەین، وادەزانین کەسمان نیە بێجگە ئەوان ئینجا بڕوا بەدراوسێکانمان دەکەین وادەزانین هاوکارمانن لە هەموو شتێکدا لە کۆتایدا بڕوا بە دارو بەرد و گژو گیا دەکەین.

کەچی ئەوەندە سەرسەختین بڕوا بە خوای موتەعال ناکەین، تەوەکول بەوناکەین یاڕەبی خوایە پەشیمانم. تەوەکولم هەر بە زاتی تۆیە لێم خۆشبە تۆم هەبێت هەموو کەون هیچە. لە تۆ دووربم مێروولەیەك دەمخات.. یا مەعبودم تەنهاو تەنها بڕوام بەزاتی تۆیە.

هەندێك ڕوقیەی شەرعیم بەسەردا خوێندو عەلیش بەسەریدا خوێندی و تەلەفونم کرد بۆ کارەکەم و ئاگادارم کردنەوە لەوەی کە ناتوانم بچم بەهۆکاری کچەکەم تای لێهاتووە. ئەو ڕۆژە مۆڵەتەم وەرگرت و ترسام

لەوەی نەکو تاکەی زیاد بکات، بەڵام سوپاس بۆ خوا نیو کاتژمێری نەبەرد دوای ڕوقیە شەرعییەکەی من و عەلی چاك بوویەوە، شیفای بۆ هات لە لایەن پەروەردگاری شافییەوە و پاشانیش دایکی شەربەتی تای پێدا، سوپاس بۆ خوا ئاناء باش بوو.

لەگەڵ عەلی یەمەنیدا نانمان خواردن بەیەکەوە، پاشان ئەویش ڕۆیشتەوە، لەماڵی خۆمان باسی هیچمان نەکرد لەبەر ماڵو منداڵ.

ڕۆژەکانی ژیانم ئاسایی بوویەوە، تا ئێوارەیەکی ڕۆژی شەممە بوو لەماڵ دانیشتبووم، کەسێك پەیوەندی پێوەکردم بەژمارەیەکی دیار و ناخۆ بەناوی شێخ شاهین، دوای سڵاو کردن داوای ئەوەی کرد کە دەیەوێت بمبینێت.

ماکوان: سەبارەت بەچییە بینینەکەمان؟

شێخ شاهین: کێشەیەکم هەیە لەگەڵ برادەرێکدا هاتووین بۆمان چارەسەر بکەیت.

ماکوان: تەشریف بێنن بۆماڵەوە لە خزمەتاندا دەبم؟

شێخ شاهین: مەمنون دەبین ئەگەر بێیت بۆ قاوەخانەیەک لە بازاڕ لەوێ دانیشتووین.

ماکوان: بەڵی باشە بە خۆشحاڵییەوە لە خزمەتاندام، دوای ئەوەی گەیشتمە قاوەخانەکە نەمدەزانی شێخ شاهین کێیە، بە دەستییەکەی خۆم تەلەفونم بۆ کرد و وتم لە کوێدای جەنابت با بێمە خزمەتتان، هات بەدەممەوە چیم بینی خوایە! پیاوێکی زل لە دەبابە دەچوو، ڕەش، ڕیش و سمێلی پاك تاشی

بوو، موستیلەیەکی زلی نقێم مارۆنی لەدەستا بوو. بەرەو ڕووم هات لە دەیناسوڕ و مانوت و شتی وا دەچوو. ئەوەندە زل بوو خەریك بوو ڕاکەم. بەپەلە وەك ئیحترام هات بۆ لام.

شێخ شاهین: سڵاو کاکە ماکوان چاك عەزێتمان دایت بەڕاستی زۆر مەمنونی بەڕێزتانم، فەرموو بابڕۆینە سەر ئەو مێزە دابنیشین لە تەنیشت مێزەکەوە دوو جانتا دانرابوون.

ماکوان: زۆر سوپاس کاك شێخی بەڕێز، عەفوو بەڕێزتانم نەدیوە لەم شارە، لە کوێ دەژین؟

شێخ شاهین: کاکە ماکوان لە بەریتانیاوە هاتووم! لەشاری لەندەن دەژیم و یەك دوو جار لە کۆڕو سمینارەکانتا بووم لە بەریتانیا، جارێك هاتین بۆ لیدز و جارێکیش لە لەندەن.

ماکوان: خۆشحاڵ بووم، سەیرە جەنابتم لەناو خەڵکدا نەدیوە، (لەڕاستیدا ناوی کۆڕەکان هەردووکی ڕاست بوو، بەڵام ئەو کەسایەتییەم نەدیبوو لە کۆڕەکەمدا ئەوەندە زلو زەبەلاح بوو، ئەو دەمو چاو وهەیکەلە ون نەدەبوو هەرگیز لە بیر نەدەچووەوە) بەهەر حاڵ خۆشحاڵ بووم دەی قوربان با بچینەوە بۆ ماڵەوە ئیسراحەت بکەین، بۆ لێرەی بەتەنهاو ئەو کێشەیە لەگەڵ خەڵکی تردا کێیە؟ با ئەویش بێت دەچینەوە ماڵەوە؟

شێخ شاهین: کاکە ماکوان زۆر سوپاسی لوتفت دەکەم، کیشەکەم لەگەڵ تۆدایە.

ماکوان: من، بۆ قوربان! خۆ خوانەخواستە پارەیەك یان حەقێکت ئەگەر لامە بدەمەوە؟ خەیاڵم بۆ لای پاڵتاکدا چوو، وتم بڵێ لە پاڵتاکدا ژووری هەبوو بێت و دڵم عاجز کردووە بە قسە، ئێستا هاتوە تۆڵە بکاتەوە، پێش ئەوەی قسە بکات دەستم دایە پەرداخە ئاوەکە بە هێواشی بردم بۆ دەمم، وتم: نەوەکو پەلامارم بدات لە ژێر دەستی دەرناچم، با هیچ نەبێت ئەوپەرداخە لەسەریدا بشکێنم.

شێخ شاهین: کاکە ماکوان! جەنابت پیاوێکی خۆشەویستی و ئاقڵی و لە ناو خەڵکدا زۆر ناسراویت، ئێمە گروپی (چاوی ئازادین) چەند جار هەوڵمان داوە جەنابت ببیتە ئەندام لە لامان، بەڵام دەرەفەت نەڕەخساوە، یاخود نەت ویستوە بێیتە لامان لە کاتێکدا هەمووی پیاوی چاك و خواناسە لەلامان و خەڵکی خۆت ئاساییە!

ماکوان: (سبحان الله- یەکسەر هەستم کرد، لە جەماعەتی حەزقیل و سەسیلە)، بەڵام هیچ خۆم تێکنەداو پێمووت: لەناو ئەو پیاوچاکانەدا کەسێکی تێدانیە من بیناسم؟ ئینجا پەیڕەو و پرۆگرامی ئەم گروپە چییە، کوردییە بۆمافی ڕەوای میللەتەکەمە، یاخود بۆ چالاکی ئیسلامییە، بۆ چییە کاکە شێخی بەڕێز؟

شێخ شاهین: کاکە ماکوان! ئەم گروپە گروپێکی کۆمەڵایەتییە لە هەر جێگایەك نوینەرێکمان دەوێت، دەبێت ئەو کەسانەی دەبنە نوێنەر، پیاوی خۆت ئاسایی بن و شارەزابن و کۆمەڵایەتی بن. لە ناو خەڵکیدا دیار بن. بۆ چارەسەری کێشەی خێزانییە و یاخود تەعزیە و خۆشی و شادییە یان حەفلەیەکە بەدەم خەڵکەوە بین بە گشتی، ئەمە کاری ئەم گروپەی ئێمەیە.

ماکوان: وەڵڵا یاشێخ ئەمە شتێکی باشە. من لەم شارەی خۆمان زۆر کۆمەڵایەتی نیم، چونکە زۆربەی کوردەکان خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتن زۆربەیان بێدینن و خوا هەر ناناسن، من پەیوەندیم لەگەڵیاندا نییە، لە بازاڕیشدا لەدوورەوە هەموو دەڵێن ئەوەیە مەلا ماکوان. منیش ئەوانەی ئەهلی مزگەوت نەبن کەمتر تێکەڵیان دەکەم! بڕوا ناکەم من بەکەڵکی ئەو نوێنەرایەتییە بێم، ئینجا من بۆ خۆم پیاوێکی توڕەم، کە توڕە بووم دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکەم. بڕوا ناکەم بەکەڵکی ئەو کارە بێم، لەسەرووی هەموویەوە من ئیش دەکەم وەك میسری، کاتژمێر ٧ بەیانی دەڕۆم ٩ شەو دێمەوە!

شێخ شاهین: نا بە پێچەوانەوە کاکە ماکوان! تۆ دەبیتە شێخ، چونکە کوڕە شێخی وخەڵکی دێنە لات و دەستت ماچ دەکەن، تۆ ئەمر دەکەیت و ئەوان جێبەجێی دەکەن، کێ حەددی هەیە سەیری ناوچاوانت بکات، تۆ کوڕی پیاویت و لە پیاوچاکانی. کێ دەتوانێت ئازاری تۆ بدات، تۆ شێخی هەموومانیت، من لەم شارەی تۆدا دەیان کورد دەناسم کە تۆیان خۆش دەوێت.

ماکوان: کاکە وەڵڵاهی تۆ هەڵە تێگەیشتوویت لە بنەماڵەی باو وباپیرانمدا لە هەردوو سەرەوە یەك شێخی تێدانیە، باوکم کۆنە شیوعی بووە و لەپۆلی شەشی سەرەتاییەوە ئەندامی چالاکی حیزبی شوعی بووە تا لەکۆتایی تەمەنیدا لەڕێگای مامۆستا شارەزووری سەید ئەحەمەد پێنجوێنییەوە خواهیدایەتی دا ، دایکیشم کۆمەڵە بووە یەکەم بەیاننامەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان دایکم لە شاری پێنجوین هەڵیواسیوە، ئیتر شێخی چی و تەڕەماشی چی؟ من تا ماوەیەك لەومەبەر سەرسەریترین کەس

بووم! خوای گەورە هیدایەتی دام و ئێستا تۆزێك ئارام بوومەتەوە، ئیتر نە پیاو چاكین نە هیچ وە منیش باش خۆمان دەناسم تۆ نامان ناسیت، ئینجا من لە ژیانمدا نەمهێشتوە كەس دەستم ماچ بكات و دەستی هیچ كەسێكم ماچ نەكردووە، بێجگە باپیرم و یەك دووكەسی تر كە مامۆستام بوون، چونكە قابیلیان بووە ئەوانیش زانستیان فێر كردووم. بەنیسبەت ئەوەشەوە كە دەڵێیت كێ حەددی هەیە، وەڵڵا كاكە حەددیان هەیە كە تورە بوون ئیتر لەوانەیە ١٠٠ شەقم تێهەڵدەن چییە ئاساییە. هەر لەبەر ئەوەی پێچەوانەی قسەكانی ئەو قسە بكەم.

شێخ شاهین: دەستی دایە یەك جانتا و بەدەم قسەكردنەوە وتی: ئەوە تەوازعی خۆتە. جانتای كردەوە پڕ بوو لە پارەی تێكەڵە لە پاوەند، لە دۆلار، لە یۆرۆ وكرۆن! جا كاكە ماكوان گروپەكەشمان ئەوەیان بەدیاری بۆ ناردوویت، بۆ ئەوەی واز لە كار بێنیت و خەریكی كاری گروپەكەی ئێمە بیت.

ماكوان: كە پارەكانی نیشان دام، دڵی بردم، هۆشم ڕۆشت بۆ پارەكان زۆر زۆر بوو، ناحەقم مەگرن. ئێ باشە ئیشەكە چییە؟

شێخ شاهین: شێخی گەورەمان پیاوی خواناس و خاوەن كەرامەت سەسیل فێرت دەكات.

ماكوان: ئەها، ئەم پارەیە كرێنی دینەكەی منە بە ژینەكەی ئێوە، ئەو سەسیلەی تۆ باسی دەكەیت شەیتانە.

شێخ شاهین: چۆن وادەڵێیت، ئەوە پیاوچاكی خوایە لە ڕوحانییە پاكەكانە، كەڕامەتی هەیە، خوای گەورە ناردوویەتی تا پیاوچاكان كۆبكاتەوە.

ماكوان: پێم عەیب بوو لەو جێگایە ئەگینا ئەو قسەیەی پێویستی بە شینە جرطێكی قایم بوو، بەس بۆ كەسایەتییم نەدەگونجا، بەڵام لەڕاستیدا پڕبەدڵ و دەمم حەزم دەكر د یەك جرطی بۆ لێبدەم كە وتی پیاو چاكان كۆ دەكاتەوە، بەڵام نەمكرد بەداخەوە زۆر ڕقم لەو پیاوە بوو هەر كەبینیم وامزانی ئەوكەسە باوكمی كوشتوە، ئەوەندە پیس بوو بۆنی عەرەقی لێدەهات، ئینجا شێخەكەم لێكردەوە، كاكە شاهینی بەڕێز من ناتوانم ئەوكارانە ئەنجام بدەم بڕۆ بە گروپەكەت بڵێ ماكوان لەبیر كەن.

شاهین: ماكوان بەخوا دەتكوژن؟

ماكوان: ئەگەر توانیان دەستیان خۆش بێت.

شاهین: من تا دوو بەیانیش لێرەم هەر بە خزمەتت دەگەینەوە.

ماكوان: بڕوا ناكەم كاك شاهین، چونكە من ئیش وكارم هەیە دەچمە سەر كاری خۆم دەی جارێ بە ئیجازەت و خۆشحاڵ بووم.

لە قاوەخانەكە هاتمە دەرێ لە نزیك ئەو بازاڕەدا خۆم قایم كرد و چوومە ناو سەیارەی هاوڕێیەكم، بە هاوڕێكەم وت بڕۆ وێنەی زلترین و ناشرینترین پیاوم بۆ بگرە لەو قاوەخانەدایە. ناردم كەمێكی پێچوو هاتەوە تەماشا دەكەم ڕەنگی زەرد بوو.

ماكوان: ئەوە چییە بۆ مردوویت؟

هاوڕێكەم: كاكە پێی زانیم خەریكبوو بمكوژێت.

ماكوان: باشە سەركەوە با بڕۆین بەدەنگی بەرز ئایەتەلكورسیم خوێند.

هاوڕێکەم: چیدەکەی ماکوان خۆت ئەتەقێنیتەوە؟

ماکوان: نا جنۆکە بە شوێنمانەوەیە با خۆمانیان لێ بزر بکەین و شوێن ئەو پیاوە زلە بکەوین.

هاوڕێکەم: ئەوشتە زلە کێیە؟

ماکوان: ئەوە مودیری موخابەراتی کۆنی عێراقە کیمیایی کردووە بەسەر هەڵەبجەدا وەك عەلی حەسەن مەجید وایە تاوانبارە، پارتی ناردوومی بۆ ئەوەی تەعقیباتی بکەین!

هاوڕێکەم پارتی بوو، کەوام وت ئیتر جوڵا لەبەر خاتری پارتی.

هاوڕێکەم: سەگبابی وا چی لێبکەین بیکوژین بۆ ڕیگای بارزانی.

ماکوان: نا دەیکوژین لە ڕای خوا گۆشتەکەی تەوزیع دەکەین.
هاوڕێکەم: ڕادەبوێری ماکوان؟وەڵامم نەدایەوە دوای شێخ شاهین کەوتین، خۆیکرد بە هوتێلێکدا زانیم لە کوێ دابەزیوە.
بە هاوڕێکەمم وت ئیتر تۆ بڕۆ، گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لەدوورەوە بینیم لە ژێر پردەکەی نزیك ماڵی خۆمان سەسیل دانیشتبوو.
چووەمە لایوو دەستمان بە قسەکردن کرد.

# چۆنیەتی ڕێنمایی کردنم بۆ ئەوەی ببمە شێخ و خاوەن کەرامات

ورده رده هاتم ڕووەو لای پردەکەی ماڵی خۆمان بێزار بوو بووم لەو ڕەوشە. سەسیل م بینی دانیشتبوو لە ژێر پردەکەو چاوەڕێی منی دەکرد بگەمە لای، کە گەیشتمە لای و نە سڵاوم لێکرد و نە هیچ هەر وەك ئەوەی نەم دیبێت.

تاگەیشتمە لای زەدەخەنەی لەسەر لێو بوو، کە جێمهێشت هیچ قسەی نەکرد.

پردەکەم جێهیشت و هیچم لەگەڵدا نەووت، لە پێشمەوە پەیدا بوو.

سەسیل: شێخ ماکوان باشی، بۆ قسەمان لەگەڵ ناکەیت؟

ماکوان: ئەی پیاو چاک، نازانم پیاوی یان ژنی؟ یاخود جنۆکەی شەیتانی؟

هەرچیت بۆ سەلام ناکەیت، بڵێت السلام علیکم یان لاڵ دەبیت؟

سەسیل: شێخ ماکوان ئەوە سەلامی سەرزەوی ئێوەیە، سەلامی ئاسمانی ئێمە شێوەیەکی ترە، بۆیە نەمکرد.

ماکوان: ڕاست ناکەیت ئەوە سەلامی ئیسلام و خوای موتەعالە و سەلامی ئەهلی بەهەشتە، تۆ درۆ دەکەیت شەیتانی.

عەلی یەمەنی فێری کردم ئەگەر بڵێم: (بسم الله الذي لا إله إلا هو)، جنۆکەو شەیتان کوێر دەبن نات بینن، هەرچەندە ئەم دوعایە بۆ کاتی لەبەرکردنی جلوبەرگە، بۆ ئەوەی هیچ شەیتانو جنۆکەیەك نەت بیننو لە ئاستدا کوێر بن. فەرمودەکەش ڕاستە، تاقیم کردەوە بەدەنگی بەرز وتم: (بسم الله الذي لا إله إلا هو)، هەر ئەوەندە لە دەمم دەرچوو لە بەرچاوم نەما و سوپاسی خوام کردو دیسانەوە ئایەتەلکورسی و معوذتین و سورە ئیخلاصم خوێند بە ئیسراحەت چوومەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام جارێ شەیتانێکی مرۆڤ ماوە.

هەروەها عەلی یەمەنی لە کتێبەکەی (وحید عبدالسلام بالي) ئەوەی نیشاندام کە هەر دەرگاو پەنجەرەیەك ناوی خوات لێهێنا هیچ شەیتان و جنۆکەیەك ناتوانێت بیکاتەوە، ئەوەندە بڵێیت بسم الله. هاتمەوە دەرگام کردەوە وتم: (بسم الله) دامخسست بەهەمان شێوە پەنجەرەکانیش کە هیچ شەیتان و جنۆکەیەك ناتوانێت بیکاتەوە.

بۆ ئێوارەی یەکشەممە شاهین پەیوەندی پێوە کردم بەتەلەفۆن: کاك ماکوان ئەتوانین یەکتر ببینین؟

منیش تەلەفونەکەم داخستەوە: خێرا پەیوەندیم کرد بەعەلی یەمەنییەوە: دێیت لەگەڵمدا بڕۆین بۆ لای کەسێك لەتەرەفی ئەوانەوە هاتووە؟

عەلی: کاتم نییە و سەرقاڵم بە کارێکی تایبەتەوە لە ماڵ نیم و لە شارەکەی خۆشمان نیم.

ماکوان: هیچ هیوایەکم نەما دیسانەوە شاهین تەلەفونی کردەوە؟

شاهین: کاک ماکوان تەلەفونەکە داخراوە! ئەتوانی بۆ نیو کاتژمێر یەکتر ببینین، چونکە من بەیانی دەچمەوە بۆ لەندەن؟

ماکوان: کاک شێخ شاهین بڕوابکە زۆر سەرقاڵم ناتوانم ببورە، مەشغوڵی ماڵو منداڵم.

شاهین: ماکوان تەنها نیو کاتژمێر دەتوانم بتبینم تەنها نیو کاتژمێر؟

ماکوان: شاهین! بۆ ماکوان لە تۆ بووە وا بانگم دەکەیت ئەمە ئەدەب و ڕێزەکەتە؟ ئەوە تۆ خەڵکی کوێت؟

شاهین: ببورە کاك ماکوان گیان تەنها وەك خۆشەویستی بە ماکوان بانگم کردی، من خەڵکی کەرکوکم تورکمانم و لە شیعەکانی گەڕەکی تسعینم!

ماکوان: بەهەر حاڵ بزانم دەرفەتێك نادۆزمەوە تەلەفونت بۆ دەکەمەوە.

شاهین: بەس کاک ماکوان توخوا با ڕەسم گرتن و قسە تۆمارکردنی تێدا نەبێت، ئەوەی نێوانی من و تۆ کاری مەحرەمانەیە.

ماکوان: ئەگەر سیقەت نییە با من نەیەم، خۆ من داوام لێنەکردوویت تۆ هاتوویت بۆلام، زۆر مەمنون نەبیت نایەم.

لەڕاستیدا من بیانووم دەگرتوو بەدوای هەنجەتێکدا دەگەڕام کە نەچم بۆلای.

شاهین: لەخزمەتاندام کاک ماکوان گیان، تۆ برای گەورەمانی و چاومانی.

ماکوان: باشە کاک شاهین ئاگادارت دەکەمەوە پاش کەمێکی تر.

دەمویست من جێگایەك هەڵبژێرم نەك ئەو، تەلەفونم کرد بۆ کوڕێکی هاوڕێم داوام لێکرد هاوکاریم بکات ئەویش ئامادەیی نیشاندا کامێرەیەکم دایە وبردم بۆ جێگایەك لە نزیك وێستگەی شەمەندەفەری شار، لەوێ قاوەخانەیەکی لێبوو ڕۆژانی یەك شەممە دەکرایەوە، دامانناو بە خاوەن قاوەخانەکەم وت ئەو کورسی و مێزە بۆ من میوانێکم هەیە، دەچم دەیهێنم و کەس لەو جێگایە دانەنیشێت، بە هاوڕێکەشمم وت تۆ تەنها گوێدەگریت و بە تەلەفونەکەت وێنەمان دەگریت و بە ڤیدیۆش ئەوەندەی توانیت بیگرە.

هاوڕێکەم: باشە.

من دەرچووم بۆ ناو بازاڕ لە ڕێگا تەلەفونم کرد بۆ شاهین.

ماکوان: کاک شاهین لە کوێیت دێم بە شوێنتا؟

شاهین: کاک ماکوان جەنابت دەزانی لە کوێم لەو هوتێلەکەم کە دوێنی بەدوامەوە بوویت لەگەڵ هاوڕیکەت!

ماکوان: ئەوە باسی چی دەکەی کاکە لەکوێیت، بۆ تۆچیت بە دواتەوە بم، لەکوێت بابێم بۆ لات؟

شاهین: وەرە بۆ هوتێل کلاسیك لە نزیك سەنتەری شارە.

ماکوان: نەمزانی چۆن زانیویەتی، بەڵام دڵنیا بووم لەوەی کە جنۆکەو شت پیان وتوە! چووم هەڵمگرت و چووین بۆ ئەو جێگایەی دەست نیشانم کردبوو.

یەکسەر چوو تەوقەی کرد لەگەڵ و پێی وت برادەر، کاك ماکوان دەڵێت ئیشەکەمان تەواو بووە بابڕوات.

هاوڕێکەشم یەکەسەر تەماشی منی کرد وتی: باشە برا من دەڕۆم، زۆر ئیحراج بووم، زانیم جنۆکەکان ئاگای لە ئێمە بووە هەواڵیانداوەتە ئەو شاهینە سەخیفە.

بە هاوڕێکەم وت پەلە مەکە ئێستا ئەتگەیەنم، وتی نا پێوویست ناکات خۆم دەڕۆم دوایی قسە دەکەینەوە.

بەهەر حاڵ هاوڕێکەم ڕۆیشت و منیش هیچ خۆم تێکنەدا، شاهینیش هیچی نەووت لەوبارەیەوە شاهین: دەستی کرد بە قسە، کاک ماکوان حەزناکەیت ئاوا هەموو شتێك بزانیت؟

ماکوان: وتم نەوەڵڵا! ئەوەندە گرنگ نییە بۆم ئەو شتانە، دەزانم ئەوە جنۆکەیە هاوکاریت دەکەن. ئەوان تۆیان موسەخەر کردووە، تۆش دنیاو قیامەتت لەدەست داوە.

شاهین: براکەم منیش وەك تۆ موسڵمانم، بەڵام ئەوانە هاوکاریم دەکەن هەرچیم بوویت بۆم دەکەن منیش هەرچیان بوویت هاوکاریان دەکەم!

ماکوان: تۆ چیت ئەوێت لەمن، بۆم باس بکە بەوردی، بزانم دەتوانم بیکەم. ئەگەر نەمتوانی نابێت گلەیی بکەن.

شاهین: بەدڵنیاییەوە دەتوانیت، ئەگەر پێت خۆشە بە سەسیلیش دابنیشێت لەگەڵماندا بەس من و تۆ دەیبینین، ئاساییە؟

ماکوان: ئاساییە، قسەکەم تەواو نەکرد لە دەرگای قاوەخانەکە خۆی کرد بە ژووردا. هات بە پێکەنینەوە دانیشت.

سەسیل: السلام علیکم، من هەر وەڵامم نەدایەوە و تەنها وتم: اهلا وسهلا، شاهینیش لە جێگای خۆی نەجوڵا، تەنها وتی سەیدی بەخێر بێیت! ڕوومکردە شاهین و وتم بەردەوام بە؟

شاهین: کاك ماکوان هەڵمان بژاردویت بۆ ئەوەی لەناوماندا ببیتە شێخ و خاوەن کەرامات. دەتکەینە گەورەی خۆمان، چیت دەوێت بۆ دەکەین؟

ماکوان: من هیچ لە کەرامات و ئەوەی باسی دەکەن نازانم، بەچی دەمکەنە گەورەی خۆتان؟

شاهین: فێرت دەکەین.

ماکوان: چۆن فێرم دەکەیت؟

شاهین: تەنها چەند مانگێکت بەسە بۆ فێربوون، ناهێڵین پێویستیشت بە هیچ هەبێت.

ماکوان: دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی ببمە شێخ؟

سەسیل: من پێت دەڵێم.

ماکوان: بۆت نیە هیچ قسەیەك بکەیت، من لەگەڵ بەشەر قسە دەکەم نەك لەگەڵ تۆ.

سەسیل: باشە توڕەمەبە با شاهین قسە بکات.

شاهین: باشە كاك ماكوان من قسە دەكەم. سەرەتا پێویستە خۆت پێشكەش بە ئێمە و بە پیاو چاكان بكەیت، لە نێوانماندا پەیماننامەیەك بنووسین و هەمووومان ئیمزای بكەین.

پاشان جەنابت چل شەو دەچیتە خەڵوەتەوە لە جێگایەكدا بۆت دیاری دەكەین و قورئان دەكەیت بە دووكەرتەوە لە ناوەڕاستەوە لە سورەتی كەهفەوە، بەشی لای راستی سورەتی كەهەف دەكەیت بە نەعل و دەیكەیتە پێت و بەشەكەی تریشی پەڕ پەڕ دەكەیت ئەو چل رۆژە نە خۆت دەشۆیت نە غوسڵ دەردەكەیت نە خۆت پاك دەكەیتەوە، ئەگەر پیساییت كرد دەبێت بە لاپەرەی قورئانەكان خۆت پاك بكەیتەوە! ئەویش بۆ پیرۆزی تۆیە، بۆ ئەوەی بە قورئان پاك و پیست پیرۆز بكەین، لاشەت بە قورئان پاك بكرێتەوە تا پیرۆز دەبیت.

ماكوان: ئێ چیتر..

خەریك بوو دەتەقیم خەریك بوو هەرچی لە قاوەخانەكەدایە لەسەریدا بیشكیم بەس ئارامم گرت، تا بزانم چی تری پێیە و چیتر دەڵێت!

شاهین: دوای ئەوە بۆ ماوەیەك گۆشتی مردارەوە بوو دەخۆیت. لە گۆشتی سەگ و پشیلە وبەرازو پیسایی خۆت و پیسایی خەڵكی تر و پیسایی و ریخی ئاژەڵ دەخۆیت، بۆ بەهێزكردنی تۆیە ئەمە وەك وەرزشێكە.. جاران هێزی (مغاویر)ی دەیانكرد. بۆ ئەوەی ببیتە سەركردەو قائیدمان.

ماكوان: چی تریش؟

شاهین: ئەگەر ویستت پلەت بەرز تر بێتەوە دەتوانیت گۆشتی مرۆڤیش بخۆیت و لەمنداڵەوە دەست پێدەکەیت.

ماکوان: جا ئەم گوشتە ناسك ونەرمە لەکوێ هەیە؟

شاهین: خۆمان بۆت پەیدا دەکەین، پاشان دوو کتێبی گرنگ هەیە دەیخوێنیت کە ناویان مەندەل و جەفرەشە؟

ماکوان: ئەی دوای ئەوەی کە ئەوانەم کرد چی دەکەم؟

شاهین: ئەبیت بە شێخ و موردت دەبێت کە لەبەرچاویاندا چەقۆلە خۆت ئەدەی، فیشەك بەخۆتەوە دەنێت و یان شیش دەکەیت بە خۆتا، تۆ کەڕاماتت دەبێت و هیچت لێنایە.

ماکوان: ئەی ئەگەر شتم لێهات، گرنتی چییە؟

شاهین: تەماشای من بکە، یەك چەقۆی دەرهێنا لە گیرفانی بەقەدەر نیو خەنجەر دەبوو، سێ جار دای لەخۆی لەبەر چاومدا هیچی لێنەهات دەچووە ناو لاشەی وەك ئیسفنج و دەهاتە دەرەوە.

ماکوان: کاکە ئەوەی تۆ باسی دەکەیت نەکەڕامەتەو نە هیچ، ئەوە سیحرو جادووی شەیتانە.

شاهین: نا- کاك ماکوان ئەوە کەڕاماتە، سیحریش دووشێوەی هەیە چاك و خراپ لەخۆییەوە بە عەرەبی جلفەی عێراقی قسەی دەکرد ئەیووت ئەوە قورئانەو فەرموودەیە. تەبعەن هەمووی درۆ بوو.

ماكوان: بەهەر حاڵ، كاكە ئەوەی باسی دەكەیت بە من ناكرێت با جارێ ئەم شەیتانەی تەنیشتم ڕاو بنێم، دیسانەوە دەستم كرد بە ئایەتەلكورسی خوێندن و معوذتین سورەتی ئیخلاص و چەند جار وتم بسم الله الذي لا إله إلا هو، ئینجا چەند جارێكیش وتم: لا اله الا الله وحده لاشريك له له الملك و له الحمد يحي ويميت وهو على كل شي قدير.

سەسیل لە تەنیشتمانەوە نەما و ڕایكرد، بە شاهینیشم وت: كاكی من بڕۆ تا تووشی كێشەیەك نەبووم بە تۆوە یان ئەتكوژم ئەچمە زیندان، یان ئەمكوژی و دەچیتە زیندان، دەی بڕۆرەوە بۆ مەملەكەتی خۆت بۆ لەندەن. یان من ئاگام لە خۆم نییە بەدەنگی بەرز قسە دەكەم، خاوەن قاوەخانەكە زانیوەیەتی كە من كێشەم هەیە لەگەڵیدا و چەقۆكەی بەدەستییەوە بینیوە تەلەفونی كردووە بۆ پۆلیس، خوای گەورە كردی پۆلیس خۆی كرد بە ژووردا وهاتنە لای من.

وتی: پێناسەكەت، دامێ و بە نەرویجی قسەم لەگەڵ كرد.

پۆلیس: ئەم كەسە كێیە؟

ماكوان: نایناسم، دەڵێت لە لەندەنەوە هاتووم بەدوای كارێكەوەیە پرسیار لەمن دەكات و هەردووكامان خەڵكی عێراقین قسەو باسمان كردووە لەو بارەوە.

پۆلیس: هیچ كێشەیەكت نییە لەگەڵیدا؟

ماكوان: نەخێر

ڕووی کردە شاهین وتی پاسپۆرت؟

شاهین: بەئینگلیزی من پاسپۆرتم پێنییە، ماکوان قاچاخچی منە. ئەو منی هێناوە بۆ نەرویج و داوای پارەکەم لێدەکات؟

# حەزقیل و ئازیز و هێرۆ وماڵیان

لەدوای ئەوەی شێخ شاهین منی کردە قاچاخچی لەبەردەم پۆلیسەکاندا، پۆلیس منیان برد بۆ فەرمانگای پۆلیسی ئەو شارە ناوی پارێزەرەکەمیان وەرگرت و دوو کاتژمێر کردیانمە زیندان، پاشان بانگکرام لەلایەن پارێزەرەکەمەوە.

پۆلیس: ماکوان تۆ ئازادی، لە زینداندا بیری ئەوەم دەکردووە بەلای کەمەوە هەفتەیەکم پێدەچێت، بۆ وا زوو ئازاد بووم ئەوە فەزڵی خوایە! خۆم دانابوو دنیایەك قسە بکەم و بەڵگە بخەمە روو کە من هیچ پەیوەندیم بەوەوە نییە، خەریکی گەڕان بووم بەدوای بەڵگە و قسە دا کەچی خوای گەورە ئەوەندە ئاسانی کرد هەرئەوەندەی قاوە خواردنەوەیەکی پێچوو.

پارێزەرەکەم: ئەم کەسە ناوی -جوادە- لە وڵاتی ڕۆمانیاوە هاتووە بۆ نەرویج درۆ دەکات لە بەریتانیاوە نەهاتووە، لە فرۆکەخانەوە چاویان لەسەری بووە، ئێستا زیندانیان کردووە دوای چەند ڕۆژێکی تر دەینێرنەوە بۆ ڕۆمانیا- وڵاتی قەرەجەکان.

ماکوان: (بە پارێزەرەکەم) ناتوانم ببینم تۆزێك داخی دڵی خۆمی پێبڕێژم؟

پارێزەرەکەم: باش نییە، ئیهمالیکە.

هاتمەوە بۆ ماڵەوە، وتم سوپاس خوا ڕزگام بوو لەم کابرایە، لە هێستری چەموش دەچوو.

سەری ساڵ بوو لە کار گەڕامەوە. داواملێکرابوو ئەو ڕۆژە کار بکەم، چونکە ئەوروپییەکان حەزدەکەن لەو ڕۆژەدا مۆڵەت وەرگرن، بۆ منیش وەك هەموو ڕۆژەکانی تر وا بوو..

وتم: کار دەکەم و پارەکەشی دووبەرانبەری وەك ڕۆژانی ئاساییە بۆ من.

پێشتر خێزان و کچەکەمم بردبوو بۆ ماڵی باوکی، کەس لە ماڵ نەبوو.

وتم کەس لەماڵ نییە، ئەمشەو بۆخۆم گوێ لە شێخی شەعراوی دەگرم لە تەفسیری قورئانەکەی، خۆم سەرقاڵ ناکەم بە درووستکردنی نانەوە، چونکە ڕەستەی شەعراوی زانستی لێدەچۆڕێ.

نزیکەی کاتژمێرێك لەدەرەوە گەڕام و لە بازاڕ نانم خوارد ، لە ڕێستورانتەکە چاوەڕوانی چایەك بوو بۆم بهێنن ئافرەتێک هاتە لام،

وتی: جەنابت کاك ماکوانی؟

ماکوان: بەڵێ ماکوانم، بەڵام کە تەماشام کرد خەریك بوولاڵ بم. باش بوو نەموت ماکوان کێیە نایناسم! دەستی هێنا تەوقە بکات، وتم بەخوا دەست نوێژم هەیە، دنیا ساردە ناتوانم بیگرمەوە فەرموو ئەمرکە.

بەڵام جوانییەکەی سەرسامی کردم وا هەستم دەکرد لە تابلۆکانی لیۆناردۆ داڤنچیدا بینیومە. هەستم دەکرد ئەوە پەری دەریایە کە باسی دەکەن. کەدانیشت لە خۆشیا خەریك بوو بڵێم نانم نەخواردوە با بەیەکەوە نان بخۆین.

بەڵام نەمتوانی نانی تر بخۆم، چاو جوان، باڵا هەر جوان، میکیاج هەر جوان.. جلو بەرگ هەر جوان، دەست و پەنجە هەر ناسك و جوان، بەڵام لەو ساتانەدا بیرم کەوتەوە خۆ من موسڵمانم پابەندم بەدینی خواوە لەناو خەڵکیدا ناسراوم، ئەی کوا ڕەوشتی ئیسلامی!

سوپاس بۆ خوا هاتمەوە سەر خۆم و لەدڵی خۆمدا وتم .. اعوذ بالله من الشیطان الرجیم.

ئینجا هاتمەوە بە خۆمداو وتم فەرموو.. لەخزمەتاندام خوشکی خۆم ئەمرکە، بەڕێزتان ناوی منتان زانی ئەی ناوی جەنابت چییە؟

ئافرەتەکە: کاک ماکوان من ناوم... ئازیزە.

ماکوان: فەرموو ئازیز ی بەڕێز؟

ئازیز: کاك ماکوان من گۆرانیبێژم زۆر دەمێکە حەزم دەکرد کەجەنابت بناسم لە ڕێگای فەیسبوکەکەتەوە و سایتەکانەوە هەندێك هۆنراوەی بەڕێزتانم لایە، ویستومە بیکەمە گۆرانی ئەگەر ئیجازەم بدەیت.

ماکوان: منیش وتم وەك موجامەلەیەك بەڕاست من هۆنەرم- بە شاعیرم دەزانی. ئەوە چ شیعرێکە جەنابت ئاوا سەرسامی بوویت بیکەیتە گۆرانی؟

ئازیز: کاك ماکوان بڕوا بکە ئەوەندە جوانە و ئەوەندەم هۆنراوەکەت خوێندۆتەوە لەبەرم کردووە.

ماکوان: بەڕاست؟ وەڵڵا من هیچ شیعرێکی خۆم لەبەر نییە، تەنها شیعری هەڵەبجە نەبێت ئەویش لەبەر ئەوەی بە خۆشی خەڵکی هەڵەبجە و

کارەساتی کیمیاباران نوسیوومە و یەکەم شیعرە کە نووسیومە بۆیە لەبەرم کردووە، دەنا- هیچ شیعرێکی خۆمم لەبەر نییە! ئادەی بزانم کام هۆنراوەی منە؟

ئازیز: هۆنراوەکەت بەناوی (نیشتیمانێك لە ماچی دەم)ە.

ماکوان: بە پێکەنینەوە، بۆ من شتی وام هەیە عەیب و شوورەیی؟

ئازیز: بەڵێ کاک ماکوان بۆت بڵێم؟

ماکوان: ئادەی

ئازیز: دەستی پێکرد بەخوێندنەوەی، بەڵام بە چ شێوەیەك! ئەوەندەی تر هۆنراوەکەی جوانکرد.

نیشتیمانێك لە ماچی دەم
کێ ئەتوانێ وەکو من بێ؟
لەیاخیبووندا درەخشان بێ
بۆ خۆشەویستی تۆ بەرز بفڕێ
یاسەمین لە ڕۆژدا بچڕێ
کێ ئەتوانێ وەکو من بێ؟
بۆ عەشقی چاوانی تۆ دەکەوێتە کێ بڕکێ
لە گوڵە وەنەوشە دڵۆپەی ئەوینی دەوێ
ماچی دەمی بکاتە نیشتیمان بۆ دەمێ
چاوانی جێگای خەوی تۆ بێ
کێ وەکو منی پێ دەکرێت؟

بابێتە لام پێم بڵێ
لەوانەی عەشقی تۆیان دەوێ..
لە منداڵان، لەیاخیان؟
لە ونبوان، لەشێتان و عاشقان؟
كاميان سۆزو هەست و نەستی لەمن دەچێ
كێ لەوانەی كە زۆر ياخين..
وشەی وەك من بەكاردێنێ
كێ وەكو منی پێ دەكرێ؟
ئەوەی لە دەريای سۆزتا ون بوو بێ
گەر ڕاست دەكات.. دەنگ هەڵبڕێ
يان ئەوەی لە عەشقی تۆ شێت بووە دەناڵێنێ
گەر ئازايەو ڕاست دەكات
با يەك دڵۆپە لە زەريای ئەوينی منت پێ بەخشێ
وا ياخی بووم!
نيشتەجێی ناو خۆشەويستی ئەوينت بووم
نيشتيمانی خۆشەويستی
پايتەختی عەشقی ون بووی منە
يەك ماچم ويست لە ناوی دا
حلولت بووم، وابەستەت بووم، تێكەڵت بووم
ئەم ماچە سەرشێتە چی بوو منی شێت كرد
منی نيشتەجێی خۆشەويستی تۆ كرد
فرياكەون دەرمبێنن وانغرۆ بووم لەناو ماچا!
وشەكانم بخوێنە..
ئەبينی من چۆن لەناوچووم

دەبینی چۆن ون بووی ناو سۆز و ئەوینت بووم
ئێستا دەڵێم..
کێ وەکو من عاشقت بووە با بێتە لام
شێوەی وشەم.. سەیر بکات
گەر لە من چوو..
ئەوا هەموو شیعرم دەکەمە خۆڵ
بەسەر لاشەی خۆمدا دەیپژێنم
کێ وەکو من بڵێسەی سەندووە و نێڵەی دێ
کڵپەی عشقت جۆشم ئەدا
وا هەموو گیانم ئەسووتێنێ
ئەوا با دەریایەك عشق، لەگەڵ دڵۆپەك فرمێسکی من بەرانبەر کا
دڵنیابە کە دەدۆڕێ
کەم یاری بە ڕۆحم بکە
کەم بگری، کەم پێکەنە، کەم بڕۆ
کەم گۆرانی شەوانم بۆ بڵێ
بۆ کوێ بڕۆی لەم گەردوونە
نیشتیمانی سنگی منە جێی ئۆقرەتە

ماکوان: ڕاستەکەی ئەوە شیعری منە، ساڵی ٢٠٠٣ لە دیمەشق دانیشتبووم لە جێگایەك بە تەسجیل دایانا بەدەنگی نزار قەبانی. شیعری ئەو بوو شیعرێکی زۆر جوانی خوێندەوە بەدەنگی خۆی، منیش شیعرەکەم لا جوان بوو یەك دووجار بە خاوەن دوکانەکەم وت: هەڵیکەرەوە با گوێم لێبیت.. ساڵی ٢٠٠٩ منیش لەمێشکمدا دامڕشتەوە ئەو هۆنراوەیەی قەبانی بە تامو بۆنی خۆم.

ئازیز: زۆرێکی تر لە هۆنراوەکانتم لەبەرە، وەك سروە و گوارەی شیعر و.. تاد.

ماکوان: وەڵا ئازیز ی بەڕێز تۆ بەسەلیقە تری تاکو- من، بەهەر حاڵ لە خزمەتدایە و بڕۆ بیکە بە گۆرانی، بەڵام شتێك هەیە بیزانە، لەوانیە تۆ باش بزانیت من کەسێکی ئیسلامی و پابەندم بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، جەنابیشت ماشاء الله سیمای دینداریت پێوە دیار نیە، ئایا هەست ناکەیت لەسەر منیش و جەنابیشتان بکەویت؟

ئازیز: کاک ماکوان .. من موسڵمانم، ئیسلامم خۆش دەوێت! من کافر نیم بەخوا.

ماکوان: نا- کەسەکەم مەبەستم ئەوە نیە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە پێت بڵێم سیمای پابەند بوونی ئیسلامەتیت پێوە دیار نییە، وەك حیجاب دەنا سوپاس بۆ خوا کە موسڵمانیت، ئەی شکور نوێژ دەکەیت؟

ئازیز: ئەی چۆن هەموو ڕەمەزانێك نوێژ دەکەم و بەڕۆژوو دەبم، ئیتر خۆشت دەزانی دڵ حسابە.

ماکوان: باشە ئازیزی بەڕێز بەهەر حاڵ بڕۆ بیکە بە گۆرانی بیبە بۆ خۆت، بەڵام ناوی من مەنووسە لەسەری.

ئازیز: بۆ کاك ماکوان گیان؟ با ناوی تۆش بنووسین لە تایتڵدا.

ماکوان: مەنووسە ماکوان کەریم، بەڵکو بنوسە. (M.A.X)

ئازیز: دەزانم زیاتر ئەو ناوەت بەکار هێناوە بۆ شیعرەکانت نەمزانیوە واتای چییە؟

ماکوان: ئەوە کورتکراوەی ناوی خۆم و باوك و باپیرمە بەلاتینی، واتا خەم.

ئازیز: جوانە، دەستی کرد بە چا خواردنەوە لەسەر مێزەکەی من.

ماکوان: لەدڵی خۆمدا وتم دانیشتەکەمان خۆشەو، ئەگەر پیاو و ژنێك دابنیشن نامەحرەم بن، بەدڵنیاییەوە سێیەم شەیتانە. منیش لەگەڵ شەیتاندا ڕەفیقم زۆرە با هەڵسم بڕۆم باشترە!

ماکوان: ئازیز ئەگەر ئیجازەی من بدەیت بڕۆم لەبەر ئەوەی ماندووم و لەکاریش هاتوومەتەوە، شیعرەکەشت پێشکەش بێت؟

ئازیز: نا کاك ماکوان گیان کچێکی پوورم هەیە زۆر موعجیبی شیعرەکانی تۆیە کە وتم کاک ماکوانم بینیوە وتی: ئێستا دێم بۆ لاتان، کەمێک چاوەڕێ بکە، ئێستا دێتە ئێرە، من ئەو خوشکەم لەگەڵدایە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بێنە لامان دانیشن؟

ماکوان: بەڵێ.. بەڵێ، بەخۆشحاڵییەوە با بفەرموون.

لەپەنایەکدا دانیشتبون من نەمدیبوون، بانگی کردن خوشکەکەی لە خۆی جوانتر بوو، هاوسەرەکەشی هات و تەعاروفمان کرد. منیش بۆ موجامەلە وتم ئێوە لە عەشیرەتی جوانانن.. ماشاء الله، تبارك الله أحسن الخالقين، خوای گەورە جێ دەستی خۆی هەمیشە دیاری دەکات بەسەرمرۆڤەکانەوە.

باسی ئەوە کرا خەڵکی کوێیت و لە کوێ دەژیت و ئەی ئێوە لەخوێندن چیتان تەواو کردووە؟ هەندێك موجامەلە و قسەو باسی ئاسایی.

لەپڕ یەکێك لە کرێکارەکانی ڕێستورانتەکە هات بۆلام کە دەمناسی وتی کاك ماکوان سەیارەکەتیان قوپاند، نەکو ڕاکەن فریاکەوە یەکێك سەیارەکەتی هەلاهەلا کردووە.

منیش ئیزنم خواست لە و بەڕێزانەو بەپەلە هاتمە لای سەیارەکەم و تەماشام کرد سەیارە جوانەکەی خۆی و منیشی وێران کردووە! کە چوومە پێشەوە قسە لەگەڵ خاوەن سەیارەکەی تردا بکەم کە خەتای کردووە و بە بیمەکانمان بڵێین کێ تاوانبارەو بۆ ئەوەی سەیارەکان چاك بکرێتەوە.

وتم بزانم کێیە؟ کە چوومە پێشەوە تەماشام کرد کچێك دانیشتوە ئەگری. ئەوەندە جوان بوو هەر دڵۆپێك فرمێسکی سەیارەکەی من دەهێنێت. بەو گریانەوە بە خەفتبارییەوە بەو دەموچاوە تەماوییەوە ئەوەندە جوان بوو خەریك بوو بڵێم بابە بۆ دەگیریت؟! من سەیارەکەی تۆش چاك دەکەمەوە، وەرە بانانیشت بۆ بکرم.

نزیك بوومەوەلێی و پێم وت بە نەرویجی ئازارت پێنەگەیشتوە بتگەیەنمە نەخۆشخانە؟

کچەکە: بەکوردی بەڵێ ئاساییم کاک ماکوان، بەس ئەو سەیارەی کە لێمداوە نازانم هی کێیە؟

ماکوان: وتم بەڵێ من خاوەنیم، بەس فیدات بێ، فەرموو دابەزە.

کچەکە: من هێرۆم، کچی پوری ئازیزم.

لەم قسانەدا بووین خزمەکانی کە لە ڕێستورانتەکەدا یەکترمان ناسی ئەوانیش هاتنە دەرەوە، وتیان هێرۆ ئەوە چی بووە؟

هێرۆ: لە سەیارەکەی کاك ماکوانم داوە.

بەختیار (هاوسەری خوشکی ئازیز): کاك ماکوان بابڕۆین دانیشین من هەموو کارەکە چاك دەکەم، چونکە ئەو سەیارەیە بەناوی منەوەیە و منیش (سوپەر بیمەم هەیە) هەمووی چاك دەکەم، ئێستا تەلەفون دەکەین بۆ بیمەکان، ناوی بیمەکەی منی وەرگرتو خۆی کارەکانی چاك کرد.[٤]

هەموو دانیشتینەوە بەیەکەوە.

ماکوان: دەی هێرۆ خان خۆشحاڵم بەناسینتان!

هێرۆ: کاك ماکوان زۆر ببورە، نەدەبوو ئەوە ڕوویدات؟

ماکوان: ئاساییە خوشکی من ئەوە قەدەری خوای پەروەردگارە، لەوکاتەدا خێزانم تەلەفونی بۆ کردم، وتی: ماکوان نانت خواردووە هەر هەواڵی پرسی، چونکە خێزانم دەزانێت نانم بۆ دروست ناکرێت کە بەتەنها بم، بۆیە هەواڵی پرسیم بزانێت نانم خواردوە، منیش ووتم خەریکی نان خواردنم.

[٤] - سیستەمی بیمەو دابینکردن لە ئەوروپا وەك سیستەمی کوردستان نیە، لە ئەوروپا ئەگەر هەر ڕووداوێکی هاتوچۆ ڕوویدات کۆمپانیای بیمەکان چاکی دەکەنەوە، چونکە مانگەنە هەموو بەشداربوان لە کۆمپانیای بیمەکاندا.

خێزانم: نایەیت بۆ ماڵی باوکم؟

ماکوان: بڕوا ناکەم بێم.

کە زانیان خێزانم لەماڵ نییە..

ئازیز: کاك ماکوان با بڕۆین بۆ ماڵی ئێمە، دایکم چاوەڕێمان دەکات و لەوێش ئیستراحەت بکەین و دیسێرت( ) دەخۆین، خۆ خێزانیشت لەماڵ نیە.

هێرۆ: وەڵڵا ڕاست دەکات کاک ماکوان منیش دێم.

بەختیار: زۆر باشە دەبێت هەر بچینە ئەو شارەی ئێمە، تا سەیارەکان چاك دەکەنەوە من سەیارەیەك بۆ تۆ بەقەرز وەربگرم.

ماکوان: بەڕێزان من ناتوانم بێم لەبەر ئەوەی ئیلتیزاماتم هەیە، بەخوا ناتوانم.

بەختیار: کاك ماکوان هەر دەبێ بێیت، چونکە دەبێت خۆت سەیارەکە بهێنیتەوە؟

لەم قسانەدا بووین دووسەیارەی گەورەیان نارد، هەردوو سەیارەکەیان برد، ئیتر منیش ناچار بووم، چونکە پێویستم بە سەیارەی تر بوو بۆ ئیشوکاری ڕۆژانەم تا ئەوەی خۆم چاك دەکرایەوە.

ماکوان: (بەناچاری)، باشە.

دەرچووین بە سەیارەکەی کاك بەختیار، شتێکی زۆر سەرسوڕمانم بینی خێزانی کاك بەختیار چووە پێشەوە دانیشت! ئێ کەوا بێت، دەبێت من لە دواوە بم لە نێوانی هێرۆ و ئازیزدا دابنیشم یان یەکێکیان لەپەنامدا بێت، ئەمەش لە رووی دینی و عەشایەری و کە من بۆ خۆم سوپاس بۆ خوا عەشایەرم و عورفیشەوە ناگونجێت.

ماکوان: کاک بەختیار کارم پێتە بێزەحمەت، ئەگەر لوتف بفەرموویت بە خێزانی بەڕێزت بڵێیت بچێتە دواوە دابنیشێت.

بەختیار: نا کاک ماکوان تۆ تازە یەکێکی لە ئێمە، بەڵام بەسەر چاو ئێستا پێی دەڵێم.

ماکوان: خەریك بوو بڵێم بابە من هەمووی کاتژمێرێکە ئێوە دەناسم! بەڵام وتم بەڕێز هەموویان خوشک و کەسی منن.

باش بوو ژنەکەی بەختیار دابەزی، لەناو ژنان دانەنیشتم چوومە ناو پیاوان.

نیو کاتژمێر ڕۆشتین، تاچووینە شارێکی بچووك بەردەم ڤێلایەك کاتێک چووینە ژوورەوە سەگێکی ڕەش خۆی هەڵدا بۆ باوەشم.

ئازیز: کاك ماکوان ئەوە سەگی منە ناوی- بیتایە.

ماکوان: بەڕێز گیان بەس من زۆر حەزم بەسەرو چاوی سەگ نیە، لەبەر ئەوەی نوێژ دەکەم نامەوێت دەمی بەرم بکەوێت؟

لەم قسانەدابووین

حەزقیل خۆی کرد بە ژووردا.

ئازیز: باوکە.. باوکە باوەشی پیاکرد.

خەریك بوو دڵم بوەستێ.

## حەزقیل سەسیل و سەمای كچەكان

حەزقیل لە پڕ خۆی كرد بە ژووردا.

ئازیز: باوكە.. باوكە، چوو باوەشی پێدا كرد.

كە لێم نزیك بووەوە سیمای ڕوخساری گۆڕا بۆ كەسێكی تر! بەڵام باڵاو سیمای پێشتری ڕێك ئەو بوو. كە هاتە لامەوە زیاتر سیماكە بە تەواوی گۆڕا، زۆر ترسام

ئازیز: بابم ناوی موستەفایە.

ماكوان: خۆشحاڵم قوربان، دەستی خستە ناو دەستمەوە بە گەرمی تەوقەی لەگەڵ كردم و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی.

موستەفا: كاك ماكوان زۆر خۆشحاڵم بەناسینتان، پێشتر من دەچوومە پاڵتۆك و گوێم لە كۆڕو سمینارو قسەو باسەكانت بووە، لەگەڵ كاك مەلا كرێكار. هەر لەو دەمەوە حورمەتی زۆرم بۆت هەبووە.

ماكوان: زۆر خۆشحاڵم كاك موستەفا گیان (زوو زووش دەموچاوی دەگۆڕا لەبەر چاوم دەبووە حەزقیل، دوای ئەوەی كە تەركیزم زیاتر دەكرد دەبووەوە بە كاك موستەفا)، جەنابتان دیارە موسولمانیت و دینداریت خۆش دەوێت؟

موستەفا: بەڵێ كاك ماكوان گیان سوپاس بۆ خوا موسڵمانین.

ماکوان: ئەی کە خۆشحاڵم کاک موستەفا گیان، وەڵڵا من نوێژی عەسرم نەکردووە جەنابتان نوێژتان کردووە؟ با نوێژەکانمان بکەین و جەنابت پێشنوێژیەکەمان بۆ بکە، ماڵی جەنابتانە.

موستەفا: کاک ماکوان گیان من نوێژ ناکەم، هەر موسڵمانم، دڵ حسابە.

ماکوان: دەی باشە قوربان من نوێژم نەکردووە ئیجازەم بدەرێ نوێژەکەم بکەم لێرە.

موستەفا: فەرموو- هەڵسام بۆ دەست نوێژ، دوای ئەوە داوای بەرماڵێکم کردنەبوو لە ماڵەکەدا و وتم قیبلە لە کوێدایە؟ کەس نەیزانی و ناچار داوای شتێکی پاکم کرد کە لەسەری نوێژ بکەم، نوێژم کرد.

دوای چوومە ژووری دانیشتنەکە بارێکی تێدابوو، لەناو بۆفیەکی شوشە دا پڕ بوو لەشەراب و جۆری مەی و مەشروب.

ماکوان: قوربان جەنابت مەشروبیش دەخۆیتەوە؟

موستەفا: بەڵێ کاک ماکوان شەراب دەخۆمەوە بۆ دڵم زۆر باشە.

ماکوان: کاك موستەفا هیچ شتێکی حەرام لەسەر زەویدا شیفا نییە بۆ مرۆڤ. ئەی جەنابتان کە موسڵمانن بۆ وازی لێنایەنن! دووبارە دەموچای دەگۆڕا بۆ حەزقیل کە زۆر تەماشام دەکرد ئاسایی دەبووەوە. لەدڵی خۆمدا وتم ئەمە شتێکی تێدایە.

موستەفا: وەك عەرزمکردی کاك ماکوان دڵ حسابە من خراپەم بۆ کەس نیە و لەماڵی خۆمدا دەخۆمەوە زەرەرم نیە. بڕوا ناکەم خوا..ش پێیناخۆش بێت.

ئازیز و هێرۆ هاتن بۆ لامان سڵاویان کرد. خۆیان گۆڕی بوو بە حسابی خۆیان جلی ماڵیان کردە بووە بەر کە خۆیان کرد بە ژووردا من وامزانی لێیان تێکچووە دەچن بۆ حەمام لەتاواندا چاوم نوقاند! ئازیز هات لە نێوانی باوکی و منەوە دانیشت و هێرۆش بەرانبەرم. ئەی پەروەردگار چیم دی، چاو بەرز دەکەمەوە هەر وەی! نایکەمەوە قسەم بۆ دەکەن و سەرم داخستوە جوان نییە، ئینجا منیش بەرگەی ئەو هەموو جوانی و ڕووتییە ناگرم کە لای ئەوان ئاساییە و لای منیش قوڕ بەسەرییە.

دەستم بەدەست نوێژە، بەڵام شەیتان و نەفس و هەوا و هەوەس و ئارەزوو هەریەکە لەلایەك حەیران و گۆرانی بۆ دڵم دەڵێن و قسەم بۆ دەکەن. پێم دەڵێن دە چاو بەرز بکەرەوە تەماشای ئەو سنگ و باڵ و قاچانە بکە. خۆ تۆ پیاوی؟ خوولەکێکە هەر ئەم ئێوارەیە کەس ئاگای لێنیە، قسەی خۆش بکە تۆ شاعیری، ئەوان موعجیبی تۆن ئەم فورسەتە لەدەست مەدە؟

لەملاشەوە دەست نوێژو سیمای ئیسلامەتی و ریشە تەنکەکەم و زیکرەکانم پێم دەڵێن: تۆ کەی لەو جۆرەکەسانەی لە مەجلیسی ئاوادا دابنیشیت و تۆ و پیاوی ناو مەجلیسی زیکرو پیاوچاکانو زانستی، دەم بەزیکرو قورئان خوێنی، نوێژخوێنی پاشانیش عەشایەری چۆن بچیتە ماڵێك بەچاوی خیانەت تەماشای حووڕمەتی ماڵەکە دەکەیت.

دەستم دایە تەلەفونەکەم و تەلەفونم کرد بۆ عەلی یەمەنی: بەعەرەبی دەستم کرد بەقسە کردن.

ماکوان: کاک موستەفا جەنابت دیارە عەرەبی زانیت؟

موستەفا: نەوەڵا کەسمان عەرەبی نازانین ئێمە هەر ڕقمان لە عەرەب و فارس و تورکە.

لەدڵی خۆمدا خۆشحاڵ بووم وتم باشتر، عەلی یەمەنی تەلەفونەکەی هەڵگرت منیش چوومە دەرەوە وتم: عەلی هەرچیت کردووە بگەرە لام، تووشی کێشەیەکی زۆر گەورە بووم.

لە وەڵامدا وتی بۆ لەکوێیت؟ چەند کەسێک لەگەڵ خۆم بێنم لە جەماعەتی مزگەوت؟ وای دەزانی شەڕم تووش بووە لە گەڵ مولحیدو نەرویجی و خەڵکی تردا.

ماکوان: هەر خۆت وەرە ڕزگارم کە، من لە بەهەشتم بەڵام لای حەزقیل و کۆمەلێک کچی جوان! فریامکەوە.

عەلی: ئەدرەسەکەم بۆ بنێرە.

ماکوان: یەك خولەک، بانگم کرد لە کاك موستەفا. قوربان ئەدرەسی ماڵەکەتان چیە بمدەرێ،

ئازیز .. لە جیاتی باوکی هات ئەدەرسەکەی دامێ کە پێی دەوتم دەمووتەوە دڵم بە پەلەپەل لێئەدا. بۆ وام لێهاتووە نازانم، خۆ پێشتر

ئافرەتم دییوە بەس هەرگیز ئەوەندە خۆم بە جۆش و خرۆش نەدیبوو؟ بەهەر حاڵ ئەدرەسەکەم دایە عەلی.

ماکوان: ئەگەر بۆتکرا بە فڕۆکە وەرە! وتی باشە هەر ئێستا دێم، ناچار چوومەوە دانیشتم لای کاك موستەفا، دێسێرت هات و دەستمان کرد بە خواردنی هەندێك قسە وباسی ئاسایمان کرد لەگەڵ موستەفای باوکیان، بەختیاریش لەگەڵماندا نەهاتبووەوە، چونکە خەریکی وەرگرتنی سەیارە بوو بۆ من تا سەیارەکەی خۆم چاك دەبێتەوە. باوکیان لە پڕ هەڵسا وتی من کارێکم بۆ پێش هاتووە دەچم ١٠ خولەکم پێدەچێت ئێستا دێمەوە.

ڕۆشت لە پشتەوە حەزقیلە، ئەگەر دەڵێم سەگبابینە ئێوە هەمووتان جنۆکەن ناکرێت! ئەگەر پشتملی موستەفا دەگرم و دەڵێم سەگباب چی دەکەیت لێرە؟ ئەترسم کچەکان سکاڵام لای پۆلیس لێبکەن و بڵێن ئەم کابرایە دەستدرێژی دەکات! ئەی پەروەردگار چی بکەم. جوانی و ڕووتی ئەم کچانەش وایکردووە کە هەرچی ئایەتەلکورسی و قورئان دەخوێنم لە نیوەیدا ئاگام لە قورئان و ئایەتەلکورسی نامێنێت. مێشکم دەڕوات بۆ هەزارو یەك شت، دڵم بەپەلە لێئەدات. هەرگیز ئەو حاڵەتەم بەسەر نەهاتووە، لەدوای ئەوەی موستەفا لە دەرگاکەوە لە دوورەوە خواحافیزی لە من کرد دیسان دەموچاوی کت و مت حەزقیل بوو. پیاو لەو ماڵەدا نەما، تاکە پیاوێك هەبوو ئەویش من بووم.

ئازیز: کاك ماکوان، جەنابت بۆ وا بێدەنگی؟ و سەرت داخستوە و بیری چی دەکەیت؟

ماکوان: هاوسەرەکەم، حەزم دەکرد ئێستا لەگەڵمدا بوایە؟

ئازيز: ئەوەندە خۆشت دەوێت؟

ماكوان: ئەی چۆن ئازيز.. خۆ نەمدۆزيوەتەوە لە هەموو ناڕەحەتييەكدا لە گەڵمدا بووە. ئەی ناكرێت هەناسە هەڵبكێشم لەكاتی ئەو خۆشييانەی كە ئەوم لەگەڵدا نيە، بێگومان حەزم دەكرد ئێستا ئەويش لەگەڵماندا دابنيشتايە.

هێرۆ: كاك ماكوان جەنابت عاطفی دياری؟

ماكوان: نەوەڵا هەستم لەتە بلۆكە، بڕوام بە عاطفەو شتی واش نيە؟

هێرۆ: ئەی چۆن بيری خێزانت دەكەيت؟

ماكوان: ئەوە پەيوەندی بە عاطيفەوە نيە، بەڵكو پەيوەندی بە خۆشەويستی و ڕەحمەتی خوايی و بەندايەتييەوە هەيە لە نێوانی من و هاوسەرەكەمدا، چونكە من كە هاوسەرەكەمم خۆش دەوێت واتا لەبەر خوايە. كاتێك داوای ئاوی لێدەكەم مانای ئەوە نيە كە خێزانمە و ئەركی سەرشانيەتی، بەڵكو بە دەستی ئەو چێژی هەيە و ئەويش ئەوە دەزانێت تێركردنی تينويەتی من بەو ئاوە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت لە قيامەت.

ئازيز: كاك ماكوان تۆ هەر گيز عاشق نەبوويت؟

ماكوان: نەوەڵڵا بە قسەی بێماناشی دەزانم! مَن قسە لە عاشق وەرناگرم چونكە شێتە!

ئازيز: ئەی ئەو هۆنراوە جوانە عاشقانەت چۆن نووسيوە؟

ماکوان: ئەی ئەوە خەیاڵە دنیای شیعر خەیاڵ و فەنتازیایە.

هێرۆ: شیعرت بۆ هیچ ئافرەتێك نەنووسیوە؟

ماکوان: نەخێر

هێرۆ: بۆ هاوسەریشت؟

ماکوان: بەڵێ یەك هۆنراوەم بۆ هاوسەرم نووسیوە، بەڵام باسی عیشقم نەکردووە بۆ ئەو باسی ژیانی راستی و واقیعی خۆم و هەستی خۆمم بۆ کردووە. دوای مارەکردنی بۆم نووسیوە.

ئازیز: ئەی هۆنراوەی سروەت بۆ کێ نوسیوە؟

ماکوان: بۆ کەس، بەس خەیاڵ و فەنتازییەك بووە بە مێشکمدا هاتووە.

ئازیز: بڕوا ناکەم.

ماکوان: ئازادی، بەڵام تەلەفونێك بکە بۆ بەختیار بزانە چی کردووە، ئەگەر ئەزیەت نییە ئازیزی بەڕێز؟

ئازیز: هەڵسا رۆشت، بەتەنها مامەوە لەگەڵ هێرۆ، جلێکی لەبەردایە لە جلی سەماکارەکان دەچێت لە دە لاوە دڕاوە.

هێرۆ: کاك ماکوان تۆ پرسیارت لە ژیانی ئێمە نەکرد، بۆ ئەوەندە شەرمن دیاری؟

ماکوان: من شەرمن نیم هێرۆی خوشکم، ئەوەی جەنابت باسی دەکەیت من دەمێکە تێمپەڕاندوە. بپرسم حەزت لەچ ڕەنگێکە؟ دوایی تۆش بڵێیت پەمەیی، منیش بڵێم وەك تۆ! ئینجا حەز لە چ فیلمێك دەکەیت؟ وەك یەك دەرچین هەمووشی درۆ! بۆ نزیك بوونەوە لە تەرەفی بەرانبەر.

بپرسم ئارەزووت چییەو بۆ شووت نەکردووە بۆ تەڵاق دراوی؟ من هەرگیز لە ژیان و کەسایەتی کەس ناپرسم ئیشم پێی نیە، بەڵام زانست، فیکر، هونەر و ئەدەب لەگەڵ خەڵکی خۆیدا پێم خۆشە باسی بکەم.

من سرووشتم وایە حەزم بەو جۆرە باسانەیە، حەزم بە باسی پەمەیی و ناسك بوونەوە لەبەرچاوی جنسی لەطیفدا نییە، هەر ئەوەشە وای لێکردووم کەمترین مامەڵەم لەگەڵ ئافرەت بێت.

هێرۆ: ئەی چۆن هاوسەرەکەت ماوە لەگەڵتا بەم شێوەیە؟ من دوو هاوسەرگیریم کردووە نەمتوانیوە بژیم لەگەڵیاندا.

ماکوان: هێرۆ گیان خۆ زیندانم نەکردووە، ئازادە لە ئەورووپایە هەرکات منی بەدڵ نەبوو ئەتوانێت بڵێت ماڵئاوا. خۆت باش دەزانی لێرە هەمووکەس ئازادە، پاشان دیارە کەسایەتی منی بەدڵە بۆیە خۆشحاڵەو لەگەڵمدا ماوەتەوە.

هێرۆ: ئەی بۆ لە شیعرەکانتا وا دەرناکەویت؟

ماکوان: وەڵڵاهی هێرۆی بەڕێز من بەس لای تۆ و ئازیز شاعیرم، ئەگینا کەس ئەوەندە بە قوڵی نەچۆتە ناو شیعری من.

ئازیز: لەدوورەوە گوێ لە قسەکانمانە و دەڵێت؟ کورە ماڵت ئاوابێت کە شیعرەکانت دەخوێنمەوە دەمباتە دنیایەکی تر.

ماکوان: سوپاس بۆ موجامەلەکەت، بەس بەخوا وانیە، من شتی خۆم باش دەناسم.

ئازیز: ئێستا دێم شیعری سروەت بۆ دەخوێنمەوە، بزانم تۆ خۆش خوێندۆتەوە لە ئەنیستیتۆی کوردان لە بەرلین یان من خۆش دەیخوێنمەوە؟

ماکوان: چۆن دەزانی من لەبەرلین خوێندومەتەوە ئازیز؟

ئازیز: خۆم لەوێ بووم.

ماکوان: بەڕاستە؟ ئازیز تۆش کەمنیت.

ئازیز: بە پێکەنینەوە.. هەندێك شتی هێنا بیخۆین لەگەڵ قاوەداو موزیکێکی گیتاری بەهمەنی ئێرانی خستە سەرو خوێندنەوەیەك شیعری سروەی خوێندەوە ئەوەندی تر منی موعجیب خۆی کرد.

سروە سروەیەکی بەیان دێت بە ڕووما
پەڕەی گوڵە خونچەکان دێت ماچم دەکا
ڕامام بۆ ئەو سۆزە، ڕابردووم بیر دەخاتەوە
ئەو دەنگە یاری بە ڕۆحم دەکا
ئەی تۆی ئازیزی دڵم چیت دەوێت لێم
لەم غوربەتەی دڵم و قیبلەی بێ نازی عەشقەم

وا لەم تەنهاییە بوویتە نمای گیانم
خۆ ڕابووردوو بە گیانمادا دەچۆڕێ، کەچی واتۆش بویتە یادگارم
ئەوەندە بارانت باراند لەسەر دڵما وەك مرواری
واچەکەرەی ئەوینت خەریکە سەوز دەبێت دەکا یاری
ئەی نازانیت من نەزرم کردوە نابێت خۆشەویستم هەبێ
من بڵێسەی کۆنە عشقم گرتوە و نێڵەم دێ
بۆ ئەوەندە دەپرسیت لە ڕۆژی لەدایك بوونم
دەبینوسە لای خۆت کەی تۆم ناسی ئەوکاتە من لەدایك بووم
وەك ئۆقیانوس بەسەر ڕازما شەپۆل دەدەی
ئارمانم دەگوشیت و بۆ خۆتی دەبەی
ئەوەندە مەپرسە لەبەرزی باڵام ئەی باڵا
ئەگەر ویستت بیکە بە خاچێك و خۆتی پیاهەڵبواسە
ئەوەندە لە ڕەنگی گلێنەم مەپرسە
وەرە لەناویدا دابنیشەو ئارام بە
جاران من دەروێشی ئەڤین بووم
بەڵام کە ئەو تەریقەتی جێهێشت منیش بێ لانە بووم
ئێستا ئەو ڕۆح و منیش لاشەیەکی دابڕاوین
چاوەڕوانین لەم بەرزەخەدا لەم کفنە دا دابماڵرێین
زامم هەرشتەی ئازارەو وا دەم پێچێ
کەچی تۆ نازی ماچت لێم دەوێ
سەر هەڵبڕە سەیری بریسکەی ئەو ئەستیرانە بکە چۆن دەنازن
هەموو لە ڕێگای ئەوین باڵایان گرتوەو وا لاسارن
من ناتوانم وەك ئەوان بم و باڵا بگرم
لەبەر ئەوەی من بەدوای کچی ئاودا وێڵم

تۆش ئاگری بڵێسەت دێ
کەچی من کوڕی خاکم و وا گیانم شەقار شەقار دەبێ

هێرۆ: کاک ماکوان شەو لێرەبە ئازیز گۆرانی خۆشمان بۆ دەڵێت لەگەڵ کەمانچەکەی، ئەم شەو دەیکەینە ئاهەنگ.

ئازیز: ئەگەر وابێت هێرۆ سەمایەکی جوانی عەرەبی و فارسی دەزانی ئەم شەو سەمامان بۆ بکە! هەرچەندە.. من دووشیعرم خوێندەوە بۆ کاک ماکوان هەر نەیوت دەنگت چۆنە باگوێم لەدەنگت بێت؟

ماکوان: وەڵڵا دەستان خۆش خوشکەکانی من، من زۆر حەزم بەو (جەو)انە نییە، بۆیە باسی دەنگی بەڕێزیشتم نەکرد، دڵنیام تۆ کە شیعرەکانی منت خوێندەوە زۆر خۆش بوو، جا بە دڵنیاییەوە بۆ گۆرانی هەر مەپرسە.

بەس دەزانی دەنگی تۆ بەگۆرانی بۆ من جائیز نیەو نامەحرەمە و حەڕامە، لەبەر ئەوە هەرگیز پێت ناڵێم ئا گۆرانییەکم بۆ بڵێ، نەتۆ تووشی تاوان دەکەم و نە خۆشم. بەنیسبەت، ئەوەی هێرۆ سەمامان بۆ بکات من چۆن کەڕامەتی ئەو کچە بەڕێزە دەشکێنم، من وەك ئاغا دابنیشم ئەویش سەما لەبەردەمی مندا بکات. پاشانیش لە ڕووی شەرعییەوە هەر جائیز نییە من هەرگیز لە کۆڕی وادا دانانیشم. ئەی ئازیز قسەت لەگەڵ کاک بەختیار کرد چی کردووە؟

ئازیز: بەڵێ هەموو ئیشەکانی چاك کردووە ئێستا دێتەوە.

ماکوان: دەستت خۆش، ئاگام لێبوو هێرۆ دەم و چاوی دابەیەکدا و منیش هەر چاوەڕێی (عەلی)م بۆ ئەوەی هیچ نەبیت ببین بە دوو پیاو لەوە

دەترسام هەواو هەوەس غەدرم لێبکات بە تەنها، قسەو باسەکانیشمان زۆر بەرەو لووسی دەڕوات

هێرۆ: کاک ماکوان تۆ زۆر وشکی؟ بەڕاستی هەرگیز وام ڕانەدەبینی لە جەنابتان؟

ماکوان: بۆ هێرۆ گیان خوانەخواستە هیچ بووە؟

هێرۆ: ئاخر سەما و ڕەقس کردن هونەرە، پەیوەندی چییە بەسەر کەڕامەتی منەوە من ئەگەر بڕەقسم کێشە چییە ؟

ماکوان: کێشە زۆرە بە چ مافێك ئەم لاشە جوانەی خۆت لای مندا دەلەرزێنیت و ەرقس دەکەیت و پێدەکەنیت و من ئەوروژێنیت، ناوی دەنێیت هونەر؟ بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی بێکەڕامەتی مرۆڤ نیشان ئەدات لەگەڵ ڕێزم بۆ جەنابت، ئەی تۆ هەست ناکەیت ئەمەی کە دەیکەیت خراپە، ناترسی لەوە وا من ئارەزووم جوڵاو پەلامارم دایت. یاخود بۆ هەر کەسێکی دیکە ئەو سەمایە بکەیت؟

هێرۆ: بۆ کاك ماکوان تۆ ئاوایت؟ ئەوەندە خێرا ئەوروژێیت؟ من لەبەرچاوی چەندین کەس سەمام کردووە لایان زۆر ئاسایی بووە، هەر باسی ئەو بیرکردنەوەی تۆشیان نەکردووە بەلامەوە سەیرە تۆ وادەڵێیت؟

ماکوان: هێرۆ خوشکم من باسی پیاو دەکەم. خۆشم بە پیاو دەزانم ئیتر نازانم ئەوانەی باسی دەکەیت پیاو بوون یان هەرناویان نێر بووە. ئەوندەی من بزانم پیاوان کە تەماشا سەمای ئافرەتان دەکەن هیچی بۆ هونەر نیە.

هێرۆ: قاقای پێکەنین و ئازیزیش زیاتر پێدەکەنێت.

لەپڕ لەدەرگا دراو دەرگاکە کرایەوە لەلایان دەموچاوی حەزقیل و بەدوایدا سەسیل هاتنە ژووەرە ئازیزیش دەڵێت بابە بەخێر بێیتەوە! ئینجا وەرە ئەو دڵەت شەق نەبات و لە داخا تەلەفونم دەرهێنا بۆ عەلی و وتم لەکوێیت؟

عەلی: پێنج خولەکی تر دەگەمە ئەو ناونیشانە.

# دۆزینەوەی جادوو سیحرەكان لە ماڵی ئازیز

كاك موستەفا باوكی ئازیز هاتە ژوورەوە كە نزیك بوەوە لە من ڕوخساری حەزقیلی نەما و دانیشت و عوزر خوایی هێنایەوە، بەڵام كوا سەسیل؟ دیار نەما! دڵنیام لە نزیكمانە.

منیش بۆ دڵنیایی خۆم وتم كاك موستەفا هەر خۆت هاتیتەوە؟

موستەفا: بەڵێ كاك ماكوان گیان، بۆ؟

ماكوان: كاك بەختیارت لەگەڵ نەبوو؟ (بۆیە ئەو پرسیارەم كرد وتم بزانم هەر خۆی بووە یان باسی ئەم سەسیلەش دەكات)

موستەفا: نا هەر خۆمم بووم، من لە جێگایەكی كە بووم نازانم بەختیار لە كوێیە.

ماكوان: كاك موستەفا جەنابت چیت دەكرد لە كوردستان؟

موستەفا: كاكە ماكوان لە ژێر پردەكەی سلێمانی خەریكی فرۆشتنی وشكە بووم.

لە توركیا و ئێرانەوە وشكەمان دەهێناو پێستەی حەیوانمان دەبرد بۆ هەردوولا.

ماكوان: بەڵێ، هیوام تەمەن درێژیتەو ساغ بیت خوا هیدایەتتان بدات. ( ناوی هەندێك كەسایەتم لێپرسی لە سلێمانی هەموویانی ناسی و وتم

ئەگەر جنۆکە بیت نازانێت و هەندێك ناونیشانی باسکرد هەمووی تەواو بوون).

موستەفا: زۆر سوپاس کاکە ماکوان چاوی منی.

لەو کاتەدا داوامکرد بچم بۆ تەوالیت، بۆ ئەوەی بزانم سەسیل نابینم و یاخود بێتە لام.

تەوالێتەکەیان نیشاندام چوومە ناوی زکری چوونە تەوالێتم بە عەمدەن نەخوێند. وتم بزانم سەسیل پەیدا نابێت، چونکە شوێنی مانەوەی شەیتان وجنۆکەکان تەوالێت و حەمامە.

چوومە ژوورەوە لەبەردەم ئاوێنەکە وەستام، چاوەڕێ بووم بێت دیار نەبوو. باش بوو لە پڕ تەلەفون لێداو هاتمە دەرەوە لە تەوالێتەکە.

عەلی گەیشتبووە جێگاکە، داوای ئیزنم کرد لە موستەفا و چوومە دەرەوە بۆ لای عەلی و چوومە ناو سەیارەکەی هەمووشتێکم بۆ گێڕایەوە.

ماکوان: باسی تۆم کردووە لای ئەمان، بەڵام نەموتووە لەشارەکەی خۆمە. هەر وتومە کەسێکی ڕەفیقم هەیە لەم شارە وەك هاتووم با ببینم، حەزم نەکرد بەتەنها بم.

پاشان کەدەچینە ئەوێ بزانە ئەو سەرو چاوانە جنۆکەن یان مرۆڤن، چونکە من گومانم هەیە لە هەموویان. زۆر باسی دەماوچاوی موستەفا و حەزقیلم بۆکرد. بزانم ئەو حاڵەتە چییە؟

وابڕیارماندا کە شتێکی ویست پێم بڵێت تەلەفونەکەی دەربهێنێت و بچێتە دەرەوەو بە تەلەفونەکەی خۆی تەلەفونێك بۆ من بکات و بەدوایدا منیش بڕۆمە دەرەوە.

دوای سڵاوکردنمان چووینە ژوورەوە نزیک ٥:٣٠ ی ئێوارە بوو. لەهەمانکاتدا بەختیار گەڕایەوە و وتی کاك ماکوان سەیارەکەم بۆ وەرگرتوویت لەدەرەوەیە.

سەیارەکەی تۆش چەند هەفتەیەکی پێدەچێت.

وابزانم عەلی یەمەنی ١٠ خولەک دانەنیشت تەلەفونەکەی دەرهێناو چووە دەرەوە، چەند خولەکێکی پێچوو تەلەفونی کرد بۆ من.

عەلی: وەرە خێرا

منیش چوومە دەرەوە

عەلی: ماکوان ئەو ماڵە مەعبەدی شەیتانە، هەموو ماڵەکەجنۆکەی تێدایە و بەخۆشیان نازانن. وەرە بابڕۆین.

ماکوان: بۆ کوێ بڕۆین پەلە مەکە با بڕۆین خواحافیزی بکەین، ئاخر نابێت هەروا ڕاکەین؟

عەلی: ماکوان ئەو ماڵە موسڵمانن؟

ماکوان: ئەی چۆن هەموو دەڵێن موسڵمانین، بەس نازانن ئیسلامەتی و دینداری چییە هەر قسەیە و ئیلتیزامیان نیە، ئەی ئەو گۆڕینی دەمو چاوە بە چی تێدەگەیت دەمێك موستەفایەو دەمێك حەزقیلە؟

عەلی: ئەو پیاوە دەمێکیە جنۆکە لەلاشەیدایە و مەسی کردووە، جا ئەو جنۆکانە بۆ ترساندنی تۆ و چەواشەکاریانە وا نیشان ئەدەن. دەنا ئەوە هەر موستەفایە. بەس لەبەرچاوی تۆ وادەکەن بۆ ترساندنت و سەرلێ تێکدان و وەسوەسەیە.

ماکوان: جا ئەوە ڕاستیە؟ مەبەستم ئەوەیە لە قورئان و سوننەتدا شتی واهەیە؟

عەلی: من نەمدیوە لەقورئان و سوننەتدا، بەڵام ئەزموونی ئەو پیاوچاکانەیە کە جنۆکەو شەیتانیان لەلاشەی خەڵکی دەرکردۆتە دەرەوە.

ئێمە دەتوانین یەك شت بکەین، نوێژی مەغریب دەخوێنین بەدەنگی بەرز، ئەگەر پەلاماریاندایین یاخود قیژاندیان بەسەرماندا ئەوا ئەوماڵە پڕیەتی لە جنۆکەو دەردەچینە دەرەوە.

ماکوان: بۆ پەلامارمان ئەدەن؟ کێ ئەیدا ئەوان یان جنۆکە و شەیتان؟

عەلی: ئەگەر جنۆکەیان تێدابێت ئەوان هانی ئەو ماڵە ئەدەن پەلامارمان بدەن، بەس جنۆکە ترسنۆکە زۆر ئەو توانایەیان نیە، لەوانەیە بەسەرماندا هاوارکەن دەرمانکەنە دەرەوە.

ماکوان: ئەی ناکرێت بە یەکێکیان بڵێین پێشتر؟

عەلی: ئاخر نازانین کامیان جنۆکەیان تێدایەو کامیان تێیدانیە، ئەگەر بزانن کارەکەمان فەشەل دێنێت و قسە ناکەن و ئازاری ئەو مرۆڤانە نادەن بۆ دەرکردنمان.

ماکوان: ئەی ئەو جنۆکانە ئاگایان لە قسەکانی من و تۆ نییە، پێیان بڵێن و ئاگاداریان بکەنەوە؟

عەلی: نا، چونکە من زیکرەکانم هەمووی خوێندوە و لە ڕێگاش دووبارەم کردۆتەوە.

ماکوان: زۆر باشە بابڕۆین.

موستەفا: فەرموون با نانەکەمان بخۆین؟

عەلی: یەمەنی یەکسەر ئاگاداری کردمەوە، وتی نان خواردن لەم ماڵە باش نییە.

ماکوان: (زۆر بە هێواشی) من کێك و قاوەم خواردوە لەم ماڵە ئاساییە؟

عەلی: ئاساییە.

ماکوان: با نوێژەکانمان بکەین، ڕووم کردە کاک موستەفا و وتم من و عەلی نوێژی مەغریب دەکەین بە جەماعەت. ئیجازەمان بدەن دوایی دێین نان دەخۆین.

موستەفا: فەرموون

دەستنوێژمان گرت و عەلی ئیمامەتی کردو منیش قامەتم خوێند و نوێژمان دابەست و دەستی کرد بە خوێندنی قورئان بەدەنگی بەرز دوای سورەتی فاتیحەو خوێندنی چەند ئایەتێک لە سورەتی ئەحزاب (٥٠- ٥٤) لە پڕ قیژە هەڵسا، بوو بە دوو قیژە بوو بەجنێودان خەریك بوو من نوێژەکە ببڕم و ڕاکەم. عەلی زیاتر دەنگی بەرزکردەوە لەڕەکعاتی دووەمدا ئایەتەکانی سورەتی یوسفی لە ئایەتی ٢٨ تا پەنجا خوێند. وردە وردە دەنگ کز بوو قیژە نەما، بەڵام جاروبار هەر هاوار دەکراو وەك شێر دەینەڕاند و قیژە دەهات.

لەکاتی نوێژکردنماندا بەشێوەیەك وەستاین وامانکرد پشتمان نا بوو بە دیوارەوە نەشماندەزانی قیبلە لە کوێیە ڕوومانکردبووە ئەوان. چاوم لە موستەفا بوو لەو سەر زەوییە ڕاکشابوو وەك شێر ئەینەڕاند وەك مار لوولی دەخوارد، ئاگام لە بەختیار بوو ئاسایی بوو نەیدەزانی فریای کامیان بکەوێت.

نوێژمان تەواو کرد

عەلی: نەچی بەلایاندا، ئیشارەتی کرد بۆ بەختیار کە نەهێڵێم بەختیار تەلەفون بۆ ئامبوڵانس بکات.

چوومە لای بەختیار بە دەنگی بەرز هاوارمکرد بەسەریدا لەجێگای خۆت دانیشە ئەوە جنۆکەیە لەلاشەیاندا ئێستا عەلی چارەی دەکات. کەوام وت لە جێگای خۆی دانیشت.

عەلی هەڵسا چووە لای موستەفا و قسەی کرد لەگەڵیدا بەعەرەبییەکی فوصحە، کە موستەفا عەرەبی هەر نەدەزانی، گوێم لە دەنگێك بوو لە موستەفاوە دەردەچوو بەعەرەبیەکەی فوصحەی زۆر چاك.

عەلی: تۆ چی دەکەیت لە ناو لاشەی ئەو پیاوەدا؟

جنۆکەکە: من ٢٣ ساڵە لەناو لاشەی ئەم پیاوە دام.

عەلی: دەرچۆ لە ناو لاشەی دەنا بە روقیەی شەرعی دەرت دەکەم و دەتسوتێنم. تۆ دەزانیت لە دنیاو قیامەتیش زەرەمەند دەبیت، تۆ دەزانی زوڵم دەکەیت لەو پیاوە بۆ چوویتە لاشەیەوە، داوات لێدەکەم دەرچیتە دەرەوە لە لاشەی، ئیمان بێنەو ببە موسوڵمان و لەخوا بترسە.

جنۆکەکە: من ئەمرم پێکراوە بچمە لاشەی، هەر من نیم زۆرین کە چوینەتە ناو لاشەی زیاد لە ٢٠ جنۆکەین!

عەلی: هەرچەندێکن من ئێستا دەرتان دەکەمە دەرەوە، دەستی کرد بە خوێندنی قورئان[٥]

دوای نزیکەی بیست خولەک موستەفا هەڵسایەوە هەموو گیانی عارەق بوو، وەك خۆی شۆردبێت، عەلی قسەی لەگەڵ دەکرد هیچ تێنەگەیشت

[٥]- خوێنەر دەتوانێت لەم لینکەی خوارەوەدا گوێ لە خویندنی قورئانەکە بگرێت، کە کام ئایەتانە پێویستە بخوێنرێت. چەند جار لێبداتەوە بۆ ئەوەی فێری بێت https://www.youtube.com/watch?v=٨_GQClgD_kw

عەلی: ماکوان پێی بڵێ تۆبە بکات جنۆکەکان لە لاشەی دەرچوون، ئەگەر ڕازییە بچینە لای منداڵەکانی جنۆکەش لەلاشەی ئەوان دەرکەین؟

ماکوان: کاک موستەفا هەست بەچی دەکەیت؟

موستەفا: دەستی کرد بەگریان وتی ئەوە چیی بووە؟

ماکوان: جنۆکە لە لاشەتاندا بوو عەلی دەریکرد و دەڵێت: تۆبە بکە بۆ ئەوەی نەگەڕێنەوە بۆ لاشەت بڕۆ خۆت بشۆ دەست بکە بە نوێژکردن؟

موستەفا: بەخوا نوێژ نازانم لەبیرم چۆتەوە.

بەدەم گریانەوە لیك بە دەمیدا هاتبووە خوارەوە (تەمەنی نزیکەی ٥٥ ساڵ بوو).

عەلی: ماکوان با بچین لەلاشەی ئەوانیشدا دەریبکەین، بە باوکیان بڵێ؟

موستەفا: کوامنداڵەکانم؟ با بڕۆین بۆلایان، بەختیار بزانە کوان؟ بۆ دەنگیان نەماوە.

بەختیار: چوونەتە ژوورەکەی سەرەوە.

عەلی: ماکوان پێیان بڵێ بینە لامان و خۆیان داپۆشن، ئەگەر ئارەزوومەندن جنۆکەکانی لاشەی ئەوانیش دەردەکەم.

ماکوان: کاك موستەفا عەلی دەڵێ منداڵەکانی جنۆکە لەلاشەیاندایە، ئەگەر پێیان بڵێیت بێنە خوارەوە جنۆکە لەلاشەی ئەوانیش دەردێنێت؟

موستەفا: مەمنونیش دەبم؟ ئاواز، ئازیز، هێرۆ .. باوكم وەرنە خوارەوە كوا دایكتان؟ خۆی چووە سەرەوە بۆ لایان و خێزانی هێنایە خوارەوە.

عەلی: ماكوان پێی بڵێ خۆی داپۆشێت نەكو ببوورێتەوە؟

ماكوان: سەیران خان چەرچەفیك لە خۆتەوە بئاڵێنە. (چوو كردی).

عەلی: لێی بپرسە بزانە بێنوێژ نییە؟

لێم پرسی.. وتی: نەخێر

عەلی دەستی كرد بە خوێندنی قورئان، دیسان هاواری دەكرد بەزەییم پێدا دەهاتەوە، عەلی دەستی كرد بە قسەكردن لەگەڵ جنۆكەكەدا ئەو ژنە بە عەرەبییەك قسەی دەكرد كە عەرەبیش نەیدەتوانی وا قسە بكات!

عەلی: وەرە دەرەوە لە لاشەی ئەو ئافرەتەو زوڵمی لێمەكە ئەوەی تۆ دەیكەیت زوڵمە.

(قورئانی زۆر خوێند بەسەریدا؟!)

جنۆكە: ناچمە دەرەوە تا ئەم تەلیسمانە مابێت؟

عەلی: كامەیە تەلیسمەكان؟ لەكوێدایە؟

جنۆكە: لە ناو سەرینەكەدا دانراوە؟

عەلی: ماكوان بە هاوسەرەكی بڵێت بچێت بیهێنیت؟

کاك موستەفا چوو سەرینەکەی هێنا، بەردەوام لەجنۆکەکەی دەپرسی لەکوێدایە وتی ئەو ئافرەتە خۆی خستویەتییە ناوی لەڕێگای ساحیرێکەوە و بۆ ئەوەی نێوانی خۆی و پیاوەکەی خۆش بکاتو ژنی بەسەردا نەهێنێت! لەڕێگای ئەو تەلیسمانەوە چووینەتە ناو لاشەیان.

عەلی: هەڵیدڕن ئەو سەرینە بزانن ڕاستدەکات.

ماکوان: کاك موستەفا دەتوانم ئەو سەرینە بدڕێنم؟

موستەفا: بەڵێ فەرموو..

سەرینەکەم دڕاند و وەرقەیەکم تێدا دەرهێنا، عەلی ئایەتی بەسەردا خوێندو لەناو قاپێکدا سوتاندی. ئافرەتەکە لە مریشکی سەربڕدراو دەچوو وا پەلەقاژێی دەکرد. بە من و عەلی و موستەفا وبەختیار بۆمان نەدەگیرا تا ئەو وەرقە سووتا، هێمن بوویەوە.

وەرقەکە وێنەی پیاو و ژنێکی تێدا دروست کرابوو[٦]

عەلی: جنۆکەی تری تێدایە، دیسانەوە دەستی کردەوە بە قورئان خوێندن جنۆکەیەك بە ئیسپانی قسەی دەکرد. عەلی بە ئینگلیزی پێی وت تێناگەین دەڵێی چی بە عەرەبی قسە بکە یان نەرویجی یان ئینگلیزی، یاخود کوردی.

جنۆکەکە دەستی کرد بە قسە کردن بە کوردی، منیش وتم عەلی بە کوردی قسە دەکات وتی ماکوان تێناگەم تەرجومەم بۆبکە؟

---

٦- ٢

ماکوان: چی پێ بڵێم؟

عەلی: پێی بڵێ بێتە دەرەوە لە لاشەی ئەو ژنەدا، زوڵمی لێنەکات.

قسەی تری زۆر کرد بۆچی چۆتە لاشەی هەموویم پێووت.

عەلی: ماکوان جنۆکەی کافرەکان زۆر درۆزنن بەهیچ شێوەیەك بڕوایان پێناکرێت.

جنۆکە: تەلیسمی لە خۆی کردووە، دوو تەلسیمە لە ناو ملوانەکەی کچەکانییەتی بیدڕێنن دێمە دەرەوە.

عەلی: با وەسفی ملوانکەکانمان بۆ بکات؟

جنۆکە: دوو ملوانکەی صەلیبە بە قایش دووراوە لە شێوەی نوشتەدا لە ناو صەلیبەکدایە.

عەلی: ماکوان پێی بڵێ لەکوێدایە؟

جنۆکە: وا لە ژووری ئازیز یەکێکیان لە گیرفانی چاکەتێکی کۆنیدایە نایکاتە بەری ئەوی تریش لە ژووری دایکیەتی لە ناو ئاڵتونەکانییەتی و ئاڵتونەکانی لەناو قاسەیەکدایە لە ژێر بێدی خەوەکەیاندا.

عەلی: بابڕۆن بیهێنن.

بەختیارو موستەفا بزانین ڕاست دەکات، موستەفا چوو هەردوو مەلوانکە صەلیبەکەی هێنا بە چەرم دوورابوون ڕاست بوو کتومت جێگاکانی راست بوو، دایە دەست من و بە کەتەر دڕاندم تەلیسمەکانم بەدەستی خۆم

سووتاند و سەیران خان هاتەوە سەر خۆی و تینوی بوو عارەقێکی زۆری کردبوو لە پڕ لە دەرگا درا و بەدەنگی بەرز هاوار کرا: تا پێنج دەبژێرین نەیکەنەوە دەیشکێنین، ئێمە پۆلیسین.

# شەيتان كێيیە و جنۆكە چییە

موستەفا بە پەلە رووەو دەرگاكە چوو، دەرگای كردەوە و وتی: فەرموون؟

پۆلیس: لە ماڵی ئێوەوە تەلەفون كراوە كە گوایە دووكەس دەستدرێژی كردۆتە سەرتان ئایا راستە؟

موستەفا: درۆیە ئەو دووكەسە میوانن و خۆمان میوانداریمان كردوون؟

پۆلیس: بەڵام كاتێك تەلەفون بۆ ئێمە كراوە گوێمان لەدەنگی قیژەو و هەندێك زمانی بێگانە بووە، پاشان كچێك تەلەفونی بۆ ئێمە كردووە ناوی هێرۆیە.

موستەفا: راستە هێرۆ لێرەیە، با بانگی بكەم بزانم بۆ چی وایكردووە؟

پۆلیس: كارێكی باشت كرد كە وتت لێرەیە، پێویست ناكات تۆ قسەی لەگەڵ بكەیت، ئێمە خۆمان قسەی لەگەڵ دەكەین! ئەم كەسانە كێن لێرە؟

موستەفا: ئەمانە میوانن و خزمن و زاوامن.

داوای پێناسەی لە هەر سێكمان كرد. رەوشەكەیان بە ئاسایی نەبینی، لەلایەكەوە سەرینێك هەڵدڕاوە و كەتەرێك لەوێدا كەتووە، لەناوشوشەیەكدا وەرەقە سوتێنراوە.

هێرۆ و ئازیز و هاتنە خوارەوە پۆلیسەکە چوو لایان، سەیری من و عەلی یان کرد لە نێوانی خۆیاندا قسەیان کرد، پاشان ڕوویان کردە من و وتیان بۆ لەمماڵەی؟

ماکوان: خۆیان منیان بانگهێشت کردووە، عەلی هاوڕێی منەو من بانگم کردووە بۆ ئێرە.

عەلی: من ماکوان دەناسم ئەو منی بانگ کردووە بۆ ئێرە، نیازمان بووە پاش کەمێکی کە بڕۆین وتویانە دەبێت نان بخۆن ئەنجا بڕۆن.

پۆلیس: بەڵام ئەو کچە لەو ژوورەی سەرەوە واناڵێت! یەکێکیان زۆر دەترسێت و ئەوی تریش دەڵێت: ویستویانە دەست درێژی بکەن.

ماکوان: جا ئەوە خاوەن ماڵەکەیە لێی بپرسە! بۆ زانیاریت ئەو ئافرەتەی کە وای ووتوە زیاتر ئەو منی بانگێهشت کردووە، حەزی کردووە نان بخۆین بەیەکەوە بۆ وای ووتوە، سەیرە بەلامەوە بەدڵنیاییەوە درۆ دەکات.

موستەفا: زوو هات بەدەمەوە، درۆ دەکات و شتی وا ڕووی نەداوە سەیرە بەلامەوە وادەڵێت!

پۆلیس: بەهەر حاڵ ئێمە لە کێشەکە تێناگەین، ناچار دەبین بەم سێ کەسە بڵێین بچنە دەرەوە لەم ماڵە. هەرئەوەندەمان پێدەکرێت.

موستەفا: بە تووڕەییەوە ئەمە ماڵی منە، هێرۆ کە تەلەفونی کردووە دەتوانێت بچێتە دەرەوە. ئەمانە نارۆن ئەم کوڕانە میوانن زۆر بەڕێزن و

ماڵی منەو من خاوەن بڕیارم تێیدا، نەك ئێوەی پۆلیس و هێرۆ! بڕۆن بە هێرۆ بڵێن بابچێتە دەرەوە ئەگەر دەست درێژی لێكراوە.

ماكوان: كاك موستەفا هێمن بە ئێمە هەر دەڕۆین، با ڕەوشەكە هێمن بێتەوە كێشە نیە، بەڵام هەوڵبدە خۆت بشۆ و غوسڵ دەربكە، چاومان بەیەك دەكەوێتەوە..

ڕوومكردە پۆلیسەكە پێمووت ئاساییە ئێمە دەچینە دەرەوە با كێشە دروست نەبێت، پۆلیسەكان زۆریان پێخۆش بوو، لەگەڵ عەلی خواحافیزمان كردو ئەو سەیارەكەی خۆی لێخوڕی منیش ئەوەی كە بەختیار بۆی هێنابووم، بەڵام ئاگام لێی بوو موستەفا دەستی كردووە بە گریان هەستم كرد دەترسا، پۆلیسەكان خەریك بوو دەڕۆشتن، بەڵام من گەڕامەوە بۆلای موستەفا و عەلی لەدوورەوە وەستاو دیسان پۆلیسەكانیش وەستان تەماشای منیان كرد، بەڵام من گوێم پێنەدان و چوومەوە بۆ لای كاك موستەفا.

ماكوان: هیچ نەترسی من تازە كوڕی تۆم ئەوە ژمارەی تەلەفونی منە بینوسە لای خۆت، ئەمجارە تۆ وەرە بۆلای ئێمەو لە خزمەتاندا دەبین، لە هیچ نەترسیت دەم بەزیكرو نوێژەكانت بكە. بە تەلەفون هەموویت پێدەڵێم، تەلەفونم بۆ بكە دەستی كرد بە گریان و باوەشی پێداكردم.

موستەفا: ماكوان گیان دەستم لێبەرمەدە؟ جارێكی تر بەگریانێكی بەكوڵ وتی توخوا دەستم لێبەرمەدەن.

ماكوان: دڵنیابە ئێمە خزمەتكاری جەنابتو خانەوادەكەتین، ئەوەش بزانە من هیچم لەدڵ نەگرتووە. كچەكانی تۆ خوشكی من و زۆر ئاسایی

وەرمانگرتوەچ من و چ عەلی دڵنیابە، دانەوییەوە دەستم ماچ بکات! نەمهێشت سەریم ماچ کرد، دوعای خێرم بۆ کرد و ماڵئاوایم کرد، وتم بە تەلەفون فێرت دەکەمەوە چۆن نوێژ بکەیت، کەچووینە ماڵەوە نیو کاتژمێری تر تەلەفون بکە.

دەرچووین سواری سەیارەی خۆم بووم، پۆلیسەکانیش ئاماژەی سەلامیان بۆ کردم و منیش سەلامی ماڵئاوایم لەوان کردەوە. هەموو لە ماڵی کاك موستەفا ڕۆشتین. پێش عەلی کەوتم عەلیش بەدوامەوە هات تا گەڕاینەوە بۆ شارەکەی خۆمان، بە تەلەفون بە عەلی م وت: بابڕۆین نانێك بخۆین برسیمە چووینە دوکانێکی پیتزا و داوام لەعەلی کرد کەس لەماڵ نییە دەچین بۆ ماڵی ئێمە ولەوێ دەیخۆین و تا شەو درەنگان بەیەکەوە دەبین و یان هەرلەوێ بخەوە.

عەلی ڕازی بوو هێشتا نەگەیشتبووینە ماڵەوە کاك موستەفا تەلەفونی کرد.

موستەفا: کاکە ماکوان من خۆم شۆردووە لەسەر بەرماڵ دانیشتووم دوو رکعات نوێژم کردووە.

عەرزی کاك موستەفام کرد، قوربان پاڵتاك بکەرەوە ناوی ماکوان لای خۆت زیاد بکە، کامێرات بۆ دەکەمەوە فێرت دەکەم چۆن نوێژ بکەیت.

موستەفا: ماکوان گیان تۆ دەمێکە لای من ئادد کراویت، لەهەر ژوورێك بوویتایە دەهاتمە لات، بەڵام من نوێژ هەمووی دەزانم تەنها تەحییاتم لەبیر چۆتەوە؟

ماکوان: کێشە نیە با بچمەماڵەوە لەخزمەتتا دەبم، بەپەلە لەگەڵ عەلی دا هاتینەوە بۆ ماڵەوە، کامپیوتەرەکەم داگیرساندو تەلەفونم کردەوە بۆ ژمارەکەی کاك موستەفا و کامێرام بۆ هەڵکرد و بینیم کڵاوێکی سپی کردۆتە سەر!

ماکوان: کاک موستەفا من تەحییاتەکەت بۆ دەخوێنم، جەنابت دەنگەکەم تۆمار بکە بۆ ئەوەی گوێی لێبگریتەوە و بەردەوام بە لەسەری ئیتر بیرت دەکەوێتەوەو لەبەری دەکەیت، پێم وایە ئاوا باشتر بێت؟

موستەفا: زۆر باشە کاکە ماکوان گیان، ئەوە جەماعەت دەیانەویت قسەت لەگەڵ بکەن.

هێرۆ و ئازیز: کاك ماکوان زۆر داوای لێبووردن دەکەین لەو وەزعە، خۆشمان نازانین چی ڕوویداوە؟ سەیران خان زۆر دەترسا، هەر دەیووت ماکوان گیان ئەوە چی بووە بۆ وامان لێهات؟

عەلی: ماکوان باسی هچیان بۆ مەکە تاکاتێکی تر.

ماکوان: هەر زۆر ئاساییە هێرۆ ی بەڕێزو ئازیزی خوشکم، سەیران خان تۆ هەر دایکی ئێمەیت و بەداخەوە نانی دەستمان نەخواردی، ئەمجارە بۆ کفتە شۆربا دێینەوە خزمەتتان!

ماڵئاواییم کرد لێیان وپاڵتاکم داخستەوە، پاشان لەگەڵ عەلی دانیشتین بۆ نان خواردن.

ڕووم کردە عەلی، وتم: تێم بگەیەنە شەیتان و جنۆکە بۆ وا دەکەن، بۆ دەچنە ناو لاشەی مرۆڤ و ئاوا شەڕمان پێدەفرۆشن؟

عەلی: لەڕاستیدا ئەوان هەر دەبێت وا بکەن، پێش ئەوەی مرۆڤ لەسەر زەویدا بژی؛ ئەوان لەسەریدا ژیاون، ئەم زەوییە ئەوان خاوەنی بوون، بەهۆکاری خراپەکاری خۆیان و شەڕی نێوانیان خوای گەورە لەناو ئەم زەویەداو ئەم هەسارەیەدا دووری خستنەوە، هەندێکیان بۆ کەناری دەریاکان و ناو دەریاکان و هەندێکی تریش بۆ بیابانەکان و هەندێکیش دەربەدەر بوون بۆ ماڵەکانی ئێمەو هەندێکیتر بۆ وێرانەکان و کەلاوەکان و هەندێکی تر بۆ ئاسمانەکان و سەر هەسارەکانی تر.

ماکوان: ئەمەوێت پرسیارێك بکەم زۆر جار دەڵێن: ئەو جنۆکەیە عاشقی فڵانە کەس بووە؟ جا نێر بێت یان مێ بێت بە پێچەوانەشەوە، یان دەڵێن: جنۆکە عاشق دەبێت، یاخود دەڵێن: جنۆکەی هێناوە یان شووی بەجنۆکە کردووە! یان منداڵی لێی بووە! ئەمە ڕاستە ؟

عەلی: قسەیە هەیە دەڵێن جنۆکە عاشق دەبێت، بەڵام درۆیە و هیچ بەڵگەیەکی قورئان و سوننەتی لەسەر نیە، جنۆکەکان خۆیان وادەڵێن! کە دەچنە ناو لاشەی مرۆڤەکان، ماکوان- ئەوە بزانە جنۆکە مەخلوقێکی زۆر درۆزنن بەگشتی و زۆر خۆش باوەڕیشن، ئەوە قسەی خۆیانە دەڵێن عاشق بووین، بەڵام درۆ دەکەن، لەڕاستیدا جنۆکە ناتوانێت شوو بە مرۆڤ بکات، چونکە دوو خەلقی جیاوازن، ئەگەر ئەوە راست بێت، هەر ئافرەتێك سکی پڕبێت، ئەوکات دەڵێت: من دەسەڵاتم نەبووە جنۆکە وای لێکردووم، لەبەر ئەوە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، من ڕەئیەکەم لە ئیبنو تەیمییە و ئیبن وقەییم وەرگرتوە، ئەوان هەمان ڕایان هەیە کە مرۆڤ و جنۆکە هیچ

پەیوەندی خۆشەویستی و سێکسی و کۆمەڵایەتی لە نێوانیاندا نیە. جا لەبەر ئەوە درۆیە کەسیان عاشقی کەسیان نابێت. ئەوان ڕقیان لە ئێمەیە وەك مرۆڤ.

ماکوان: بۆ ڕقیان لێمانە؟

عەلی: چۆن ئێمە نەوەی ئادەمین، پێمان دەوترێت ئادەمیزاد. ئەوان پێش ئێمە دروست بوون بەهەزاران ساڵ، لە نەوەی یەکەم جنۆکەن کە دروست بوون بەناوی سومیا- چۆن باوکی مرۆڤ ئادەم ە، باوکی جنۆکەکانیش ناوی سومیایە.

ماکوان: باشە من ئەم زانیارییەی جەنابتم لە قورئان و سونەتدا نەدیوە؟ لەکوێ هێناوتە؟

عەلی: لە تەورات.

ماکوان: تەورات کەی بڕوا پێکراوە؟

عەلی: خۆ ئەگەر بڕوای پێناکەیت ناتوانیت بەدرۆی بخەیتەوە، چونکە کتێبی ئاسمانییە.

ئەگەر کێشەی نەبێت لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا هیچ کێشەیەکی تێدانیە، واتا ئەگەر بەیەکدا نەکێشێت لەگەڵ تەوحیدو بنەماکانی بیروباوەری ئیسلامی لە یەکتاپەرستی، زانیاری لە ئیسرائیلیات وەربگرین زۆر سادەیەو شەرعیش ڕێگەی پێداوە.

پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت: هیچ کێشەیەك نیە لە بەنی ئیسرائیل وەربگرین واتا زانیاری (...وحدثوا عن بني إسرائيل ولا حرج..) بوخاری ڕیوایەتی کردووە، کورت و پوخت لە گێرانەوە مێژووەکانیاندا دەتوانین نە بەدرۆیان بخەینەوە و نەبڕوایان پێبکەین.

ماکوان: شتی وا چۆن دەبێت تێناگەم؟

عەلی: واتا نابێتە سەرچاوە بۆ ئێمە نە بەدرۆی دەخەینەوە، چونکە ئەشێت ڕاست بێت، نە بڕواشی پێدەکەین ئەشێت درۆ بێت، ئەمە مەزهەبی ئەهلی عیلمە؟ ڕوونە!؟

ماکوان: زۆر ڕوونە، دەست خۆش.

عەلی: کەواتە سەرەتا کە جنۆکە دروست بوون لە نەوەی -سومیا- ن، و بە باوکی جن ناسراوە، پاشان ئەم جنۆکە بوون بە دوو بەش بەشێکی چاك و بەشێکی زۆر خراپ، هەروەك ئاماژەم پێدا بەشە چاکەکە زۆر کەم بوون، تا فریشتەکان هاتنە خوارەوە لە گەڵیاندا جەنگان و سنووریان بۆ دانان بۆ ئەوەی چیتر پێ ڕانەکێشن لە ئاستی خۆیاندا بن.

شەیتانە یاخود ئیبلیسە کە وجودی هەیە لەبنەڕەتدا ناوی -عەزازیلە- لەوسەردەمەدا منداڵ بووە لە یەکێك لە شاخەکاندا مەلائیکەتەکان لەکاتی جەنگدا دۆزیویانەتەوە بردوویانەتە ئاسمان و لەوێ لەگەڵ فریشتەکاندا ژیانی بردۆتە سەر بە بەندایەتی و وەك ئەوان خەریکی بەندایەتی بووە بۆ پەروەردگار، بۆیە خوای گەورە خستویەتییە پلەی فریشتەکان و فەرموویەتی بە فریشتەکان سوجدەی ڕێز بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوجدەیان بردوە شەیتان نەبێت، خۆ شەیتان لە فریشتە نیە واتا مەخلوقی

مەلائیکەت نیە، بەڵکو جنۆکەیە بەڵام بۆ خوای گەورە فەرمانی پێدەکات بەوەیش کە سوجدە بەرێت؟

لەبەر ئەوەی ئاستی بەرزبۆتەوە بۆ ئاستی فریشتەکان و خوای گەورە چوار باڵی پێبەخشیوە، کاتێك خوای گەورە فەرمانی پێدەکات سوجدە بەرێت، بەفەرمانی خوای پەروەردگار ناکات.

خوای موتەعال لە قورئاندا بۆمان باس دەکات کە بۆچی سوجدەی نەبردوە بۆ ئادەم و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات.

کێشەی شەیتان لەوەدایە کە پێوەر بە ئەقڵی خۆی دەکات دەڵێت: من لە ئاگر دروست بووم ئەویش لە قوڕ، کەواتە من باشترم لە ئادەم بۆچی سوجدەی بۆ بەرم، لە کاتێکدا پێوەرەکەی هەڵەیە زۆرترین توخمی باش لەناو قوڕو خۆڵ دایە، ئاگریش راستە لە توخم پێك هاتوە، بەڵام وێرانکەرە هەرگیز ناگاتە چاکی لە توخمی خاکدا.

ماکوان: ناوی ئیبلیس و شەیتان هاتووە، ئەو دووناوە واتای چیە؟

عەلی: ئیبلیس واتە مەئیوس و بێزار و دوورخراوە، شەیتان زیاتر عەرەب بەکاری هێناوە، هەر شتێك لە بنەڕەتی خۆی دەرچوو عەرەب پێی ووتوە شەیتان.

بۆ نمونە عەرەب بەسەگی ڕەشی ووتوە شەیتان، چونکە دڕ بووە خەڵکی لە ترسدا ژیاندووە بۆیە ناونراوە بە شەیتان، یاخود هەندیك مار کە ترسناك و کوشندە بووبێت عەرەب پێی ووتوە شەیتان.

زۆر جار دەبینی لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێبێت) هاتووە کە سەگی رەش شەیتانە یاخود مار شەیتانە. ئەمە مەبەست پێی شەیتانی جنۆکە نیە، بەڵکو ئەو شەیتانەیە کە وەك وشە عەرەب بەکاری هێناوە، ڕاستە جنۆکە حەز بە هەموو شتێکی ڕەش دەکات، چونکە جنۆکە بەگشتی حەزی بە ڕەنگی رەشە جا هەرچی بێت لەناو ئەو ڕەشەدا دەردەکەوێت، ئەگەر شەو بیت کەمادەی ڕەشە یان سەگی ڕەش یاخود پشیلەی ڕەش وە هەروەها.

لە پڕ تەلەفون کرا تەماشام کرد ژمارەی کاک موستەفایە.

موستەفا: ماکوان گیان فریام بکەوە چیبکەم ماڵ و منداڵ دەترسن. هەموو لەدڵە ڕاوکێدان، دەڵێن دەچین بۆ لای دکتۆر خۆشیان نازانن چیانە، جا تکایە تۆ و کاك عەلی چارەیەکی دەردمان بکەن!

ڕوومکردەوە عەلی بۆم باسکرد.

عەلی: ماکوان ئاساییە بێن بۆ ماڵتان؟

ماکوان: زۆر ئاساییە.

عەلی: پێیان بڵێن وەرن بۆ ئێرە با لێرە بن ئەم شەو!

یەکسەر بە کاک موستەفام وت تەشریف بێنن بۆ ئێرە و لەخزمەتاندا دەبین، بە پشتیوانی خوا ئەو کێشەی دڵە ڕاوکێیە ناهێڵین.

موستەفا: ئەی ماکوان گیان بۆ ئێوە نایەن بۆ ئێرە ؟

ماکوان: وەڵاهی کاك موستەفا گیان ئێوە ئەو کیشەی کە ڕوویدا و پۆلیس هات تۆزێك قورسە بۆمان لەوانەیە چاو لەسەر ئێمە بێت، ئێوە تەشریف بێنن لە خزمەتاندایین ئەوەندە دوور نیە، ٢٠ خولەک ڕێگایە؟

موستەفا: بزانین چۆن دەبێت ئاگادارت دەکەمەوە؟

ماکوان: لەخزمەتداین، دووبارە لەگەڵ عەلی دەستمان کردەوە بە قسەکردن، باسی ئەوەم کرد باشە خۆ ئادەم لە بەهەشت دروستکراوە و شەیتانیش دوورخراوەتەوە لە ڕەحمی خوای گەورە، چۆن ئەم شەیتانە چۆتە ناو بەهەشت و ئادەمی هەڵخەڵەتاند، چۆن ئادەم لەبەهەشتدا بۆی نیە خواردن بخوات؟ ئەی ئەمەیان چۆنە؟ لەگەڵیدا وتم پەلە مەکە با چایەك دروست بکەم و ئینجا دەست دەکەینەوە بە قسەکانمان.

عەلی: دەچم سەیارەکەم دەخەمە شوێنێکی باش تا (چا)کە پێدەگات.

عەلی هاتەوە نزیکەی ١٠ بۆ ١٥ خولەکی پێ چوو، دانیشتینەوە بۆ وەڵامی پرسیارەکانی من و قسەو باسی تر.

عەلی ویستی دەست بکاتەوە بە قسەکردن لەپڕ زەنگی تەلەفونەکەم لێیدایەوە و ژمارەکە دیار نەبوو، هەڵمگرت.

ئازیز: کاک ماکوان هاتووینەتە نزیك شارەکەی ئێوە، سەیارەکەمان خزاوە و وەرگەڕاوە بەپەلە ئێمەیان بردووە بۆ نەخۆشخانە.

## تەعاروفێك لەگەك کچ و کوڕەکانی شەیتان

ئازیز: کاك ماکوان باوکم هەر وویستویەتی هەواڵت بداتێ شکور بۆ خوا سەلامەتین، بەڵام پێیووتوم بە کاك ماکوان بڵێ عەزێت نەکێشێت بێت بۆ لامان، ئێمە زۆر باشین تەنها دوای پشکنین بۆخۆمان دێین بۆ ماڵتان.

ماکوان: نا ئێستا دێم لە خزمەتاندام چۆن وا دەبێت (جا نازانم نیەتەکەم بۆ کێ بوو یان بۆ جوانی ئەو ئازیزە بووا).

بەهەر حاڵ باوکی تەلەفونەکەی لە دەست ئازیز وەرگرتوو وتی: کاکە ماکوان پێویست ناکات بێیت و ناونیشانی ماڵی جەنابتانم لایە بە تاکسی دێین پێم خۆش نیە تۆ بێیت.

ماکوان: وتم باشە

عەلی: وتی چی بووە؟

بۆم باسکرد

عەلی: با من بڕۆم

ماکوان: وەڵلا نارۆیت قسە دەکەین، ئەو خانەوادەیە بۆ لای تۆ دێن ئەوانە جنۆکەیان هەیە ئێستا ماڵی من پڕدەکەن، کە لەوان دەرتکرد لەماڵەکەی منیش دەریانکە؟ بۆم باسکە ئەو پرسیارەی لێمکردی چۆنە، ئادەم چۆن دروست بووە؟

چۆن چووە بەهەشت؟ بۆ چی چووە؟ بۆ دەركرا؟

عەلی: ماكوان باسەكەی ئێمە لەسەر ئەوە دادەمەزرێت كە ئادەم درووست بووە. خوای گەورە ئادەمی لەسەر زەوی دروست كردووە نەك لە بەهەشت، بە بەڵگەی قورئانی كەدەفەرموێت، بە فریشتەكانم فەرموو جێنشینی حوكمی خۆم لەسەر زەوی دروست دەكەم كە پێشتر جنۆكەكان ئەوكارە خراپانەیان كردبوو. فریشتەكانیش لەسەر بنەمای كاری جنۆكەكان كە خراپەكارن هەمان دیدو بۆچوونیان بۆ مرۆڤیش هەبوو ، بۆیە وتیان مرۆڤ دروست دەكەیت خوێنرێژن و كاری گەندەڵی بكەن

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ٣٠﴾ [البقرة]

واتە: (وە بیریان بێنە) كاتێك كە پەروەردگارت بە فریشتەكانی وت: من لە زەویدا جێنشینێك دادەنێم (تا زەوی ئاوەدان بكاتەوە). فریشتەكان وتیان: ئایا كەسێ تیایدا دەكەیتە جێ نشین كە خراپەو تاوانی تیا بكاو خوێن ڕێژیی تیا ئەنجام بدات؟! لە كاتێكدا كە ئێمە (شایستە ترین) قەدری تۆ بەچاكی دەزانین، (لە وەڵامیاندا) خوا فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

كەواتە مرۆڤ بۆ سەر زەوی دروست بووە نەك بەهەشت جا لە زمانی عەرەبیدا باخ و باخاتی جوان و خۆش پێیدەوتریت بەهەشت(الجنة)، واتا خوای گەورە بەئادەمی فەرموو لەسەر زەوی لەناو ئەو باخو باخاتە خۆش و جوانە بمێنەرەوە و بخۆن وبخۆنەوە، بەڵام نزیكی ئەو دارە مەبنەوە.

زانایان دەڵێن کشمیری ئێستایە لە ولاتی هیندستان، چونکە ئەوناوچەیە باخوباخاتی جوانە و هەمیشە بەهارە.

لەڕاستیدا بەهەشت هیچ شتێك تێیدا قەدەغە کراونیە، بۆیە هەندێک لە زانایان پێیان وایە بەهەشتی خوای واتا بەهەشتی ئاسمانی نیە، بەڵکو باخوباخاتی سەر زەوییە. خوای گەورە لە چەند جێگای تردا باسی باخوباخاتی خەڵکی کردووە بە بەهەشت. مانای وانیە بەهەشتی ئاسمان بێت، چونکە بەهەشتی ئاسمانی خوای دوای قیامەت دەکرێتەوە، کە ناتوانیت بچیتە ناوی دوای لێپرسینەوەی قیامەت نەبێت.

جا شەیتان کە دەرکرا لە بەهەشت دەرنەکراوە، بەڵکو لە ڕیزی فریشتەکان دەرکراو خوای گەورە باڵەکانی لێسەندەوە و گەڕاندیەوە سەر زەوی، دووری خستەوە لە ڕەحم و بەزەیی خۆی.

یەکەم کارێک کە شەیتان کردی ڕووتکردنەوەی پیاو ژن بوو لەبەرچاوی یەکتریدا، ئەوە هیوایەتی شەیتانە و گەورەترین چەکی دەستیەتی، پاشان چەواشەکاری هەرگیز ناتوانێت بەحەلاڵ بڵێت حەڕام و بە حەڕامیش بڵێت حەلاڵ، بەڵکو وەسوەسە تووشی مرۆڤ دەکات. بە ئادەم دەڵێت ئەگەر لەو دارە بخۆیت بە هەتا هەتایی ئەمێنیتەوە و دەچیتە ڕیزی فریشتەکان.

لە کاتێکدا چەواشەکاری دەکات، باسی حەڕامەکەی خوا ناکات بڵێت ئەو دارە حەڕامە یان حەلاڵە، بەڵکو چەواشەی دەکات و پێی دەڵێت: دەبیتە فریشتە.

لە کاتێکدا هەموو فریشتەکان سوجدەیان بۆ باوکمان ئادەم بردووە، ئیتر بڵێ فریشتەیت بۆچییە؟ کە تۆ بەڕێزتریت لەو فریشتانە، کەواتە

چەواشەکارییەکەشی تەنها بۆ بێ ئەمری خوای گەورەیە. پاشان کاتێك لە دارەکەیان خوارد بە قسەی شەیتان ڕووت بوونە، ئەوەش کاری شەیتانە کە ئافرەت و پیاویش ڕووت دەکاتەوە.

ماکوان: پیاو ڕووت دەکاتەوە واتای چی یە؟

عەلی: ئەیچۆن، پیاویش تەماعی تێدەکرێت لەلایەن ئافرەتەوە، سەرسنگی و قاچی و باڵەکانی داهێنانی قژی .. هتد

ماکوان: واتا ئەبێت پیاویش وەك ژن موحەجەبە بێت؟

عەلی: بەڵێ بەدڵنیاییەوە خۆ ئێمە وادەزانین تەنها بۆ ئافرەتە، پیاویش خاوەن عەورەتەو دەبێت داپۆشراو بێت.

ماکوان: ئەمە بۆمن شتێکی نوێ بوو (ئەخی) گیان؟

عەلی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت: پیاوان کەچوونە بازاڕ سەرسنگتان دابخەن، چونکە ئافرەتان نەزەری لێدەکەن، یاخود پیاو وەك ئافرەت دەبێت سەریان داپۆشراو بێت لەهەندێك مەزهەبدا فەرزە، تەنانەت بەسەری رووتی نوێژ جائیز نیە.

تەنها مەزهەبێك نەبێت لە کاتی حەجدا ڕێگەی داوە کە پیاو سەری رووت بێت.

ماکوان: بەڵێ، بەڵێ.. ئەی (ئەخی عەلی) جنۆکە جۆری هەیە؟

عەلی: بەڵێ جۆریان زۆرە، سەرەتا باسمان کرد ئەمانە سێ جۆرن وەك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) باسیان دەکات. جۆرێکیان دەفڕن و خاوەن باڵن، جۆرێکی تریان خۆیان دەگۆڕنە سەر شێوەی ئاژەڵ وەك سەگ و مار، جۆرێکی تریش لە وێرانەو لەماڵەکانماندا دەژین و خۆیان دەخەنە سەر شێوەی مرۆڤەکان ئەمێننەوە و دەردەچن جا لە ناو لاشەی مرۆڤ بێت یان لەماڵی مرۆڤ بێت.

عن أبي ثعلبة الخشني قال: قال رسول الله (دروودی خوای لێبێت): الجن ثلاثة أصناف: ١- صنف لهم أجنحة يطيرون في الهواء، ٢- وصنف حيات وكلاب، ٣- وصنف يحلون ويظعنون. الصحيحين.

لەو سێ جۆرە چەند پۆلێکی لێ جیادەبێتەوە یاخود چەند جۆریکن، بەڵام پێش باس کردنی جۆرەکانی دەمەوێت پێناسەیەکی کورتی ئەو سی جۆرەت بۆ بکەم کە بریتین لەمانە.

یەکەم: جۆری باڵدار دەفڕن، ئەم جۆرە دەڕوات بە ئاسماندا دەفڕێت مەودای دوورو درێژ دەبڕێت لەماوەیەکی کەمدا. ئەم جۆرە زۆر ترسناکن لە گەشی سەرەکی سەرو لەهەب درووست بوون زۆر خێران ئەم جۆرە لە کتێبی (لقط المرجان في أحكام الجان لسيوطي نقلا عن كتاب «العرائس» لابن الجوزي)دا باسکراوە.

بەو ئایەتە لە مرۆڤ دوور دەکەونەوە وەك لەو کتێبانەدا هاتووە.

﴿وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ [يس]

واتە: هەروەها بەربەستمان لە بەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە، پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە و نایەڵێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە) ئیتر ئەوانە حەق و ڕاستی نابینن.

دووەم: جۆری جنۆکەی گۆڕاوەکان واتا خۆیان دەگۆڕن لەسەر شێوەی ئاژەڵ و مرۆڤ ئەم جۆرە حەزیان بە ڕەنگی رەشە دەچنە ناو سەگی ڕەش و پشیلەی ڕەش و گوێدرێژ و.. هتد. ئەم جۆرەش پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) باسی لێوە کردووە، لە فەرموودەدا هاتووە..

(عن أبي قلابة عن النبي (دروودی خوای لێبێت) قال: لولا أن الكلاب أمة لأمرت بقتلها، فاقتلوا منها الأسود البهيم، (الخالص السواد) مختصر سنن أبي داود/ المندري م:٤ ص:١٣٢،١٣٣).

بە شێوەی مرۆڤیش خۆیان نمایش دەکەن لە قورئاندا هاتووە لە فەرموودەشدا زۆرە باسیان کراوە. لە قورئان سوڕەتی ئەنفال و لەفەرمودەش شەیتانی عەقەبە..هتد

سێیەم: جۆری جنۆکەی ناو مارن، یاخودشەیتانی ناو مارن زۆر جار لە ناو ماڵاندا دەبینرێن. پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ڕێگری کردووە لە کوشتنیان تاکو ئیزنیان ئەدەی بڕۆن، ئەگەر رۆشتن ئەوا وازی لێ دێنیت، ئەگەر نەڕۆشتن ئەوا دەیکوژیت، بەڵام مرۆڤ پێویستە زۆر وریا بێت دەم بەزیکرەوە شەڕی لەگەڵ دەکەیت، چونکە هاوەڵی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ی کوشتوە پێش ئەوەی هاوەڵەکە مارەکە بکوژێت.

ئەمەش فەرموودەکەیە بە دووشێوە هاتووە کە داوای لێدەکەیت بچێتە دەرەوە لەماڵەکەت.

دعاء التحريج روى ابن حبيب عن النبي (ﷺ) أنه يقول:- (أنشدكن بالعهد الذي أخذ عليكم سليمان بن داود أن لا تؤذونا ولا تظهرن لنا.

وقال مالك:- يكفي أن يقول أحرج عليك بالله واليوم الآخر أن لا تبدو لنا ولا تؤذينا، ولعل مالكا أخذ لفظ التحريج مما وقع في صحيح مسلم فحرجواعليها (ثلاثا) والله أعلم.

ڕیوایەتی تری زۆر لەسەر هاتووە، من بەوەندە کۆتای بەم جۆرەشیان دێنم بەڵام جۆرێکی تر لە مار هەیە هەر پێغەمبەر خوا ناوی ناوە بە - الابتر- ماری بچوکە دوو جۆرن، بچوک و کورتن پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) ئەمری کردووە بە کوشتنیان ئەگەر لەماڵەکانتاندا بوون، چونکە خاوەن ژەهرن.

ئەمانەش جۆرەکانیان

یەکەم: جنۆکەی ڕووناکیی

دووەم: جنۆکەی مانگیی

سێیەم: جنۆکەی ئاگریی

چوارەم: جنۆکەی ئاویی

پێنجەم: جنۆکەی خاك و خۆڵیی

شەشەم: هەوایی

هەریەك لەمانە لە عەشیرەتێکی جنۆکەن، بۆنمونە عەشیرەتی مارد، عەشیرەتی جان، عەشیرەتی مەرجان، عەشیرەتی عیفریت، عەشیرەتی ئیبلیس و شەیتان، عەشیرەتی جنۆکە واتا جن کە موسڵمانەکانیان زیاترن.

ماکوان: ئەی بۆچی ناویان جنە واتا بەکوردی جنۆکەیان پێدەڵێن؟

عەلی: جن لە زمانی عەرەبیدا واتا شاراوە و نەبینراو، بۆیە ئەو ناوەی وەرگرتوە.

ماکوان: عەلی گیان ئەی بۆچی ڕقیان لە ئێمەیە؟

عەلی: هەمووی ڕقی لێمان نیە، هەندێکیانن لەوانە شەیتانەکان و کوڕو کچەکانی.

ماکوان: بۆ شەیتان کوڕو کچی هەیە؟

عەلی: ئەی چۆن ناوەکانیانت پێ بڵێم؟

ماکوان: ئەرێ وەڵا مەمنون دەبم؟

عەلی: منداڵەکانی زۆرن، هەریەکەو ئیشێکی پێ سپێردراوە و گەورەی بەشێکە لە ژیانی هەڵخلەتاندنی ئێمەی مرۆڤدا.

بۆ نمونە کوڕە گەورەکەی ناوی (عەزازیرە): دەچێتە حەمام و لەسەر شێوەی فیل خۆی نمایش دەکات و تا ئەوانەی دەبنە ساحیر و کاهین دەستەمۆیان دەکات و سوجدەی بۆ بەرن. ئەم شەیتانە زیاتر لەناوچەکانی

هیندستان و چین و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەژی، تەنانەت زۆر جار هەیکەلی فیلی بۆ دروستکراوە بەناوی گانیشا، ئەم پەیکەری فیلە لە هیندستان دەیپەرستن.

کوڕێکی تری ناوی (زیتون) ئەمە زیاتر خۆی دەکاتە پشیلەی ڕەش و لە حەمامەکاندا دەردەکەوێت یاخود لەو کاتانەدا کە مرۆڤ ڕووتە و زیکری نەخوێندوە، یان دەبێتە هۆکاری دڵە راوکێی و خستنە خوارەوەی شت و مەك بۆ ترساندن.

یەکێکی تری بەناوی (دنهش)ە بەهێزترین کوڕی شەیتانە، کردوویەتی بە سەرکردە بەسەر هەموویانەوە، زیاتر لەناو مەسیحیەکاندا کار دەکات و دەستیکی ڕەشەو دەستێکی تری خاچی هەڵگرتووە.

کوڕە گەورەی ئیبلیس واتا شەیتان ناوی (ساروخ)ە دەچێتە لای ئەوانەی کە هەمیشە ڕووتن و گاڵتەیان پێدەکات.

کوڕێکی تری گەورەی هەموو ساحیرەکانە ناوی (ناصور)ە، هەموو ساحیرەکان لێی دەترسن و زەلیلیان دەکات، زۆر ترسناکە و بە ئەمری ئەو، بەناوی ئەو جادوو دەکەن.

(مەیمون نیکاح) کوڕێکی تریەتی پیرۆزی دەگەیەنێت بەکوردی، ئەمە لە جولەکەکانە زیاتر هەست و سۆزی سێکسی خەڵکی دەجوڵێنێت و هەوڵی بۆ ئەوەیە خەڵکی خەریکی کاری فەسادو فاحیشەو زینا بن.

دەچێتە ناو لاشەی ئافرەت و هەوڵی ئەوەیە شێتیان بکات و ڕووتیان بکاتەوە.

یەكێكی تریشی كە هەمیشە لەگەڵ پیاوچاكاندایە بەناوی (سنجاب كوری دەرگاوان) بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە، چونكە هەمیشە بەقاچی خەڵكیەوە دەنووسیت و لێیان نابیتەوە.

كوڕێكی تری زیاتر لەناو مندڵان و لاوەكاندا كار دەكات، بەعەرەبی ناوی (زەعزوع)ە كە واتای منالی دەم بە پێكەنین دەگەیەنێت، سیحرو جادوو لەمندالْ دەكات و گەنجان چەواشە دەكات بەتایبەت دەمەو ئێواران، بۆیە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت: لەئێوارانداا شەیتانەكان بڵاو دەبنەوە دەرگاكانتان دابخەن.

كۆتا كوڕی ناوی (باوكی زەعازیع)ە، كاری ئەم كوڕەی دوژمنایەتی و دووبەرەكی دەخاتە نێوان خەڵكی بەگشتی و ژن و مێردو دایك و باوك و منداڵەكانیان.. براو برا و خوشك و برا بەتایبەتی.

ماكوان: ئەی كچی نییە؟

عەلی: بەڵێ كچیشی هەیە.

ماكوان: ئەی ئەو كچەتیوانەی كاریان چییە و ناویان چییە؟

عەلی: بۆ زانیاریت هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەگەر ویستت كچانی شەیتان بانگ بكەیت وەك سیحرو جادوو خۆیان دەخەنە سەر شێوەی مرۆڤ و دەبێت لەگەڵیاندا ڕابوێری و یان خۆیان دەكەنە ئاژەڵ، دەبێت لەگەڵیاندا ڕابوێری. كچە گەورەكەی ناوی (خناس)ە واتا ئەو كەسەیە كە پیاو ئەبەستێتەوە لە كاتی سێكس كردندا و لە پیاوەتی دەخات و تەنها موسەخەری دەكات بۆ خۆی بە جادوو سیحر.

ماکوان: ئەمە ئەوە نیە کە لە شەرعدا پێی دەوترێت ئیحتلام و کورد پێی دەڵێت شەیتانی؟

عەلی: نا ئەوە هیچ نیە ئاوی زیادەی لەشە ناوی مەنیە، هۆرمۆنەکانە وای لێدەکات فرێی بداتە دەرەوە؟

کچێکی تری بەناوی (محاسن)ە ئەمە لە ساحیرەکانە لەسەر قەبرەکاندایە و دەبێت لەگەڵ ساحیرەکاندا ڕابوێرێت، چەندە ڕاستەو یان درۆیە ئەمانە هیچ سەرچاوەیەکم لانیە بەس بیستوومە لەو پیاوانەی کە ڕاستگۆ بوون، نازانم ئەوان ئەم زانیارییانەیان چۆن دەست کەوتووە.

کچێکی تری بەناوی (عائن)ە ساحیرەکان و جنۆکەی تر و شەیتانەکانی تر فێری نووسینەوەی تەلیسمەکان دەکات بۆ ئەوەی بانگیان بکەن بۆ لای خۆیان.

کچێکی تری هەیە ناوی (نائلە)ی قژ درێژە، ئەمە لە قژ درێژی دا ئەو ناوەی لێنراوە.

کچی تریشی هەیە ناوی (زیونەیە) و لەگەڵ (موشفقە) هەریەکەو کارێکی هەیە.

ماکوان: جیهانێکی سەیرن (اخی عەلی)؟

عەلی: دەوڵەتێکی تەواون پاشایان هەیە و ئەمیریان هەیە سوپایان هەیە، شەیتان خۆی عەرشی هەیە، جیهانێکی زۆر ڕێك و پێکن لەناو خۆیاندا بۆ دژایەتی کردنی مرۆڤ.

لەپڕ جەرەسی تەلەفون لێیدا کاک موستەفا بوو وتی:کاکە ماکوان لەبەردەم دەرگاکەدا وەستاوین بۆمان بکەرەوە؟

خێرا چووم دەرگام کردەوە کاك موستەفاو سەیران خان و ئازیز و هێرۆ و ئاواز و هاوسەرەکەی کاک بەختیار بوون.

هاتنەماڵەوە و دوای چۆنی و چاکی کەمێکی پێچوو، لەماڵی مندا ئەو هەموو کتێب و قورئان و بەرماڵ و هەڵواسینی ئایەتەیان بینی

یەکسەر هێرۆ قیژاندی دەرگاو پەنجەرەم داخست وتم: بۆ خاتری خوا بیگرن، نەک و یەکێکی تر شکات بکات لێمان، ئازیز دەستی کرد بەگریان و ئاوازو کاک موستەفاو سەیران خان توند گرتبوویان.

عەلی: بەتانییەك بێنە پێی دادە با قاچ و گیانی دەرنەکەوێت، عەلی چووە پێشەوە قورئانی خوێند تۆزێك و بانگی کرد لە جنۆکە هیچ دەنگێك نەبوو. بەمنی وت ئەمە درۆزنە، هیچی تێدانیە بۆ وا دەکات نازانم، نەیوت کذاب، بەڵکو وتی نصابە بۆ ئەوەی ئەوان تێنەگەن.

ماکوان: ئەی بۆ وادەکات؟

عەلی: پەلە مەکە ئێستا چارەی دەردی دەکەم، ماکوان بە سکین دەڵێن چی بە کوردی.

ماکوان: چەقۆ.

عەلی: اخ ماکوان چەقۆیەکم بۆ بێنە.

هەرکە وتی: ارید چەقو چەقو! وەڵڵا کەباسی چەقۆ کرا هێرۆ ڕۆحی تێهاتەوە.

ئەم شەو شەوی هەزارو یەك شەوەیە هێرۆ دەستی کرد بە قیژە قیژ، هەموو ترسمان لێ نیشت.

دوای ئەوەی عەلی هەستی کرد ڕاست نییە ئاگاداری کردمەوە، ترساندی بەوەی کە چەقۆیەکی بۆ بەرین، هێرۆ هەستایەوە و دانیشت ئاومان بۆ هێناو ڕەوشەکە هێمن بوویەوە.

سەیران خان: هێرۆ ئەوە چی بوو؟

هێرۆ: نازانم ئەو حاڵەتەم بۆ هات.

ماکوان: خۆمم پێ ڕانەگیرا هێرۆ خان درۆ دەکەیت!

لە ژیانمدا کێشەیەکم هەیە وەك هەندێك کەس نیم بتوانم موجامەلە بکەم، بۆیە لە ژیانیشمدا زۆر زەرەری لێداوم. ئەوەی درۆزن بێت لای من درۆزنە پێویستی بە تەریق کردنەوەیە، ناتوانم بڵێم هەڵەت کرد یان ڕاستت نەکرد، بەڵکو ڕاستەخۆ وتم هێرۆ تۆ درۆت کرد بۆ خۆت بووراندەوە هیچت نەبوو، ئەمویست زیاتر بڵێم، لەبەر ئەوەی لەماڵی خۆمدا بوو زۆر لەسەری نەڕۆشتم. بەڵام ئاگام لێبوو کاك موستەفا ڕەنگی تێکچوو، سەیرێکی خێزانی کرد، هەستم بەناڕەحەتی ئەو کرد.

بۆحورمەتی ئەو باسەکەم گۆڕی و دانیشتینەوە.

کاک موستەفاو عەلی کەوتبوونە قسە بە زمانی نەرویجی باسی دینی بۆ دەکرد زۆرم پێخۆش بوو.

ئینجا سەیران خان هات بۆ چێشتخانەکە لای من خەریکی چا ئامادەکردن بووم وتی: ماکوان ئەو وەزعە چی بوو ڕوویدا لەماڵی ئێمە بۆ وامان لێهات، بەخوا من ناوێرم بچمەوە ئەو ماڵەی خۆمان تازە؟

هێرۆش هات بۆ لای من و سەیران خان دانیشت لەسەر مێزی نان خواردن، ئازیز و باوکیشی گوێیان بۆ عەلی گرتبوو لە ژووری دانیشتنەکە.

ماکوان: سەیران خان، جەنابت چووی بۆلای ساحیرو جادووباز لە کوردستان لەڕێگای ئەو ساحیرو جادووانەوە ماڵی خۆتت وێران کردووە و خۆتت تاوانبار کردووە. ماڵەکەیشت کردۆتە کەلاوەی شەیتان و جنۆکە.

سەیران: جا ماکوان گیان ئەوەی چووم بۆلای بە حساب خۆی موسڵمان بوو شێخ بوو پیاوچاك بوو، قورئانی لابوو! ئەمەی تۆ باسی دەکەیت زۆرم بەلاوە سەیرە؟

ماکوان: وەڵڵا سەیران خان ئەوانە هیچیان موسڵمان نین، زەلیلی دەستی شەیتانن و موشریك و کافرن. ئەوانە چوونەتە ناو دەوڵەتی شەیتانەوە بەناوی ئایینەوە دینی خوای گەورە دەفرۆشن و پارە لەخەڵکی دەسێنن و ماڵی خەڵکی وێران دەکەن. ئەی خۆت بۆ لەخوا ناپاڕێیتەوە و نزای خێر بۆ خۆت و منداڵ و هاوسەرەکەشت ناکەیت ؟

سەیران: دەی هەر پیاوچاك هەبووە؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە پیاو چاك هەر هەبووە، بەڵام ئەوانە هەموو پیاوخراپن و بەرگی پیاوچاکیان پۆشیوە، ئەوە بزانە ئەوانە بەناوی خوا و دینی خواوە دوکان و بازاڕیان داناوە. دڵنیابە کە درۆ دەکەن، چونکە خوا دینی بۆ هەموومان ناردوە ئەوەی من دەیزانم تۆش دەتوانی بیزانیت، دینی خوای گەورە نافرۆشرێت بە دوعاو نوشتە.

ئەو نوشتە و دوعایانەی کە دەیکەن بەحساب تەنها سەرەتاکەی بەناوی خوا و بسم الله- دەست پێدەکات دەنا ناوەڕۆکەکەی هەموو جنێودانە بەخوای پەروەردگار و بەگەورە ڕاگرتنی جنۆکەو شەیتانەکانە و هەمووی تەلیسمە بۆ ئاژاوە نانەوە لەماڵەکاندا.

سەیران: ئەی ئێستا چی بکەین؟

ماکوان: سوپاس بۆ خوا کە گەیشتوون بە حەق و بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن ئەمە بۆ خۆی دڵخۆشکەرە، ئەگەر بەم کوڕەی خۆت دەڵێیت چی بکەم و بەقسەم دەکەیت، ئەوا من پێت دەڵێم چی بکەیت، جارێ ئەم چایە بخۆرەوە و بابڕۆینە لای ئەوان دابنیشین، ئێستا قسەت بۆ دەکەم.

سەیران: (چا) کە بدە من دەیبەم دایدەنێم

هێرۆ: پورە سەیران من کارێکم بە کاک ماکوان هەیە؟ ماکوان بەیارمەتی ئەمەوێت شتێکت پێ بڵێم؟

ماکوان: فەرموو.

هێرۆ: ئەزانی کاك ماکوان.. خۆ بووراندەوەکەم درۆ بوو، ئێوە ڕاستتان کرد، بەڵام ویستم ئێوە تاقی بکەمەوە بزانم ڕاستگۆن یان لەخۆتانەوە قسە دەکەن و چەواشەکاری دەکەن. زۆر داوای لێبووردن دەکەم.

هەستم کرد کە ئازیز و سەیران وایان کرد درۆیان کرد، بەڵام ڕاستیت دەوێت من نە بڕوام بە جنۆکەیە، نە بڕوام بەخوایە، نە بڕوام بە شەیتانە بڕوام بەهیچ دینێك نییە.

کاتی خۆی لەگەڵ هاوسەری دووەمم کە جیا بوومەوە لەداخی تۆ جیابوومەوە، دەمەوێت تۆڵەت لێبکەمەوە، چونکە تۆ ماڵی منت تێکداوە؟

ماکوان: واتا کە کێشاوتە بە سەیارەکەمدا ئەوە تۆڵەیە؟

هێرۆ: نا نە بەخوا هیچ پەیوەندی نیە بەوەوە، ئەوە سوطفە(ڕێکەوت) بووە! دەمەوێت تۆڵەت لێبکەمەوە بەوەی بەهەر شێوەیەك بووە تۆ بچوك بکەمەوە لە بەرچاوی هاوسەری پێشوومدا، بیسەلمێنم کە تۆ ئەوە نیت کە ئەو ناسیوتی؟

ماکوان: جا هێرۆ خۆ تۆ ئێستا وتت بڕوام بە خوا نیە، ئەم سوێندە چیە پێی دەخۆیت؟ بەهەر حاڵ، خۆ من سەر ڕێگای مەکتەبم لێنەگرتوویت و داوای ئیلاقە(پەیوەندی)م لێنەکردوویت و بۆچی مێردەکەت و تۆ لەسەر من جیابوونەتەوە؟ من بڵێم چی، خۆ من هەر ناتانناسم.

پاشان تۆو ئازیز وتتان موعجیبی تۆین شاعیریت، من خۆم لێبوو بە نزار قەبانی لەبەرچاوی ئێوەدا وا بەشانو باڵی مندا هاتن وامزانی مەحوی لەمن شیعری وەرگرتوە، ئێستا تۆڵەم لێدەکەیتەوە؟

هێرۆ: نا- بەو شێوەیە نیە کەتۆ بیری لێدەکەیتەوە، بەڵکو دەموویست خۆم نزیك بکەمەوە لە تۆ بۆ ئەوەی هەرچۆن بووە بەشێوەیەك لە شێوەکان دەست تیکەڵ بکەین، بۆ سەروەری هاوسەرمی بسەلمێنم کە تۆ راستگۆ نیت، چونکە ئەو تۆی زۆر بە ڕاستگۆ و سەر ڕاست دەزانی، منیش ویستم بیسەلمێنم بۆی تۆ ئەوە نیت، ئەوەتا بە ئاسانی لەگەڵ هاوسەرەکەی دەستت تێکەڵ کردووە، بۆ ئەوەی بچینەوە لای یەکتری.

ماکوان: ئەی هاوار تۆ خەتەر و ترسناکی، جا باشە گریمان من لاواز بووم، ئەوەی تۆ ویستت بیکەیت ڕوویدا، من تاوانم چی بوو لەم نێوەندەدا کەرمەتی منت دەشکاندو ماڵ ومنداڵیشت لێدە کردم، ئایا ئەمە مرۆڤ دۆستیە؟ خۆ ئەگەر خوا ناناسیت ویژدانت هەبێت؟

هێرۆ: ئەی ئەزانی تۆ چ داخێکت کردووە بە دڵی مندا؟

ماکوان: نەوەڵڵا، بۆ کاك سەروەری هاوسەرت ئیسلامی بوو؟

هێرۆ: نا بەڵام تۆ کردت بە ئیسلامی.

ماکوان: چۆن؟ من دەیناسم؟ پەیوەندیمان هەبوو بەیکەوە؟

هێرۆ: بەڵێ دەیناسیت، بەڵام بەناوی سەروەر نا، بەڵکو بەناوی پاڵتاك دەیناسیت ناوی (توی مەلیك) بوو.

ماکوان: ڕاست دەکەیت کاك توی مەلیکم دەناسی ئەوە هاوسەری تۆ بووە، بەڕاستی کوڕێکی بەڕێزو بەئەدەب بوو، من کەناسیومە لە پاڵتاك هەر کوڕێکی دیندارو خواناس بووە؟

هێرۆ: ڕاستدەکەیت، بەڵام شەوان دەهات گوێی لە وانەکانی تۆ دەگرت، زۆر حەزی بە ژیانی حەزرەتی (محمد) بوو.

ماکوان: باشە، کێشەکە چی بوو؟

هێرۆ: دڵی پیس بوو، دەیوت دەبێت خۆت داپۆشی حەزی بەهەندێك ڕەفتار بوو، نۆرماڵ نەبوو؟

ماکوان: واتا چۆن نۆرماڵ و ئاسایی نەبوو؟

هێرۆ: وەك پێم وتی، من زۆرم خۆش دەویست، بەس نەدەگونجا لەگەڵمدا.

دەیگوت بەمن زۆر خۆت ڕووت دەکەیتەوە، بەدەنگی بەرز پێنەکەنم، نەیدەهێشت تیکەڵاو بم، ئەیوت تۆ لە ناو مەجلیسی پیاواندا قسە زۆر دەکەیت، دەیوت بۆ دەرەوە بۆن لەخۆت مەدە، بەزۆر خەریك بوو نوێژی پێدەکردم، پارەی دەنارد بۆ کوردستان، بیزانیایە هەرکەس هەژارە خێرا پارەی بۆ دەنارد، منیش دەمووت کێ ناڵێت درۆ دەکات و زۆر شتی تر، ئەمانە هەموو لە پاڵتاك لای تۆوە فێر بوو پێشتر وانەبوو، کە گوێی لە تۆ دەگرت دنیایەك فەرقی دەکرد.

سەیران: کاك ماکوان و هێرۆ چاکەتان ساردبوویەوە وەرن؟

ماکوان: زۆر تورەبووم، هێرۆ ئەو کاك سەروەر دڵی زۆر پاك بوو، دڵ پیس نییە، ئەگەر خوشکی من بوویتایە یان خێزانم بوویتایە بەدڵنیاییەوە لێم قبوڵ نەدەکردی، تۆ ئافرەتێکی نۆڕماڵ نیت، نەخۆشیت. دەستی کاك سەروەر خۆش کە بەجێی هێشتوویت، تۆ کەی موستەحەقی بەوەی

پیاوێکی وەك کاك سەروەر هاوسەرت بێت، تۆ پێویستە یەکێکی شەیتان پەرست هاوسەرت بێت، ئەو ویستویەتی حەیاو حوورمەتی تۆ بپارێزێت، کەچی تۆ دەڵێیت نۆڕماڵ نیە، تۆ موستەحەقی بە گوێ بادان، ئەبێت ئاقڵ بکرێیت. ئەی چۆن لێت جیانابێتەوە بەتەمای ببیتە دایکیش بەو شێوەی کە هەیت؟

هێرۆ: باشە حەیام مەبە.

ماکوان: حەیا! ئەگەر حەیات هەبووایە لەو کوڕە بەڕێزە جیا دەبوویتەوە؟ دوایش بێیت دەست لەگەڵ من تێکەڵ بکەیت بۆ ئەوەی بیسەلمێنی بۆ ئەو کەچی؟ کە ماکوان درۆزنە یان ئیسلام ڕاست نیە، کامیان؟ بەڕاستی تۆ موستەحەقی بە عوقوبە(سزا).

موستەفا: دەنگی بەرز کردەوە کاك ماکوان چییە بۆ وا تورەیت؟ وەرن بۆ ئێرە بۆلامان.

ماکوان: قوربان واهاتمە خزمەتت، هێرۆ ژمارەی تەلەفونی سەروەرم بدەرێ؟

هێرۆ: کاك ماکوان بۆ خاتری خوا تەلەفونی بۆ نەکەیت؟

ماکوان: بۆ؟ لەبەر ئەوەی لە لوت بەرزی و کیبریاءت نەیەیتە خوارەوە؟ بەڵکو ئەگەر بتوانیایە پێم بکردیتایە دەمناردی دەستی سەروەر ماچ بکەیت.

بابڕۆین دانیشین لای ئەو میوانانە قسەیەك لەسەر ئەو باسەی تۆش دەکەین دوایی.

هێرۆ: کاك ماکوان با مامە موستەفام نەزانێت.

ماکوان: خوای گەورە ئاسانی بکات، چووینە لای

جەماعەت دانیشتین و جارێکی تر وتم یاخوا بەخێر بێن.

موستەفا: کاکە ماکوان لەگەڵ کاك عەلی قسەمان کردووە بڕیارمان داوە هەرچی پەیکەرو و مەشروب و ئەوەی کە حەڕامە لەماڵەکەدا لایبەرین بەپشتیوانی خوا. منیش ئیتر نوێژ دەکەم و مەشڕوب ناخۆم و ئەو شارە بە جێ دێڵم، خانووە کەم دەفرۆشم دێم لەم شارەی ئێوە خانوو دەکڕم! ئەی کاك ماکوان وامزانی عەلی لە شارەکەی ئێمەیە کەچی ئەویش لێرە دەژی؟

عەلی خۆی ئاشکرا کردو منیشی بەدرۆ خستەوە!

ناچار وتم عەلی بەڵێ لێرە دەژی بەس جاروبار دەچێت بۆ ئەو شارە ئەوکاتە لەوێ بوو.

عەلی: هات بۆلام وتی وەرە ئیشم پێتە.

چووینە ژوورێکی تر.

عەلی: ماکوان ئاساییە داوای عەزیزە بکەم لە عەمو موستەفا.

ماکوان: بۆ خاتری خوا عەلی حەیامان نەبەیت، کلتوری ئێمە وانیە. ئینجا عەزیزە نیە، ئەو ناوە خۆشەت بۆ وا سەقەت کرد، ئازیز بە ازیز ئەلف نەك

ع! ئینجا عەمو موستەفای چی، تۆزیك لە مەوبەر حەزقیل بوو کوێرا بوو بەعەمو.

عەلی: باشە بەس داوای دەکەم لە باوکی.

ماکوان: عەلی ئاخر من ناتناسام لێرە بووین بەڕەفیق، ئینجا شەوێکە ئێمە لەگەڵ ئەمانەدا بووینەتە ناسراو. ژیانی تۆ و ئەو کچە بەیکەوە ناگونجێت، ئەو هیچ ئیلتزامێکی نیە، تۆش هەرچی جنۆکەیە ڕەفیقتە! بیر لەوە مەکەرەوە جارێ با بزانین ئەمانە کێن؟

کیشەی ئیسلامی وموسڵمانەکان ئەوەیە هەر کچێك دەبینن جوان بێت، یەکسەر دەڵێن با بیخوازین ئاخر وانابێت عەلی، هەموو شتیك ئوصوڵی هەیە؟

عەلی: باشە، (سەروچاوی دابەیەکدا).

چووین دانیشتینەوە، کاتژمێر ١١ ی شەوە عەلی داوای ئیزنی کرد بڕواتەوە بۆ ماڵەوە من حەزم نەدەکرد، وتم عەلی مەڕۆ من و تۆ لەم ژوورە دەبین. بەقسەی نەکردم ڕۆشت، لەدەرگاکە پێم دەڵێت: ماکوان عەزیزەم بۆ مارەکە، وایدەزانی من وەلی ئەمری ئەوم.

من نوێژی عیشام نەکردبوو داوامکرد لە کاك موستەفا و بەختیار کەبەیەکەوە نوێژەکەمان بکەین. هەڵساین بۆ نوێژ کردن وتم کاك بەختیار فەرموو نوێژ بکەین

بەختیار: بەقوربانت بم سوپاست دەکەم.

وایزانی دەعوەتی دەکەم، وەڵامەکەی سەیر بوو.

ماکوان: مامە بەختیار یەعنی نایکەیت جەنابت؟

بەختیار: نەبەخوا بۆ جارێکی تر!

نویژمان دابەست لەگەڵ کاک موستەفادا بەدەنگی بەرز فاتیحە و سورەتی زلزالم خوێند، دیسان قیژە لە ئازیز بەرزبوویەوە! باوکی ڕایکرد نوێژەکەی بڕی، منیش هەر بەردەوام بووم.

## بچوکی جنۆکەو گەورەی مرۆڤ

نوێژم تەواو کرد و بەپەلە تەلەفونم کرد بۆ عەلی.

ماکوان: ڕاکە ئازیز ئەقیژێنێت.

نازانم چۆن بوو چەند خولەکێکی نەبرد دای لەدەرگا و وتی بیکەرەوە عەلیم زۆر زوو هات.

ماکوان: عەلی کە من کارم پێتە لە یەمەنی، بەڵام کە بۆ ئازیز بانگم کردی بووی بە عفریت؟

عەلی: باشە بگەڕێمەوە؟

ماکوان: نا دەوەرە دەی ماڵەکەت پڕ کردووە لە جنۆکە! دەریانبکە بۆم؟

هاتە سەرەوە و سڵاوی کردو ئازیز لە باوەشی باوکیدا بوو دایکیشی قاچی دەشێلا.

عەلی: ماکوان بەتانییەکی پێدا بە.

بەدەنگێکی خۆش (ئایەتەلکورسی)م خوێند و هەندێك ئایەتی لە سورەتی طه خوێند و کۆتایی سورەتی البقرةی تەواو کرد. ئازیز دەنگی لێوە نەهات! چرکەی نەبوو.

ماکوان: منیش بۆ خۆشی وتم: لەسەر صامت داتناوە؟

عەلی: بەخوا ئەمیش جنۆکەو شتی تێدا نیە، هەر لە خۆیەوە وادەکات.

ماکوان: یاری چەقۆکەی لەگەڵ بکەینەوە؟!

عەلی: نا بەخوا گوناحە.

ماکوان: قاقای پێکەنیم لێدا، کاك موستەفا تەماشای کردم و بەچاوێکیش ئاگام لە ئازیز بوو سەیری دەکردم.

موستەفا: کاك ماکوان ئەوە بۆ وا پێدەکەنیت؟

موستەفا: بە نەرویجی چیی بووە؟

ماکوان: خێرا من وەڵامم دایەوە و قسەم کرد وتم ئەمیش وەك هێرۆی کچی پوری درۆی فەرمووە.

موستەفا: واتا جنۆکەو شتی وانیە؟

عەلی: نا هیچ ئاسەوارێکی وای پێوە دیار نیە کە جنۆکە لەلاشەیدا بێت.

ماکوان: ڕوومکردە عەلی ئەوەم بۆ باسکرد ئەو ئافرەتە ئازاری هەیە و نەخۆشە بەس بەم هۆکارە دەری دەبڕێت؟

عەلی: وتی چۆن دەزانیت؟

ماکوان: ئێمە لە وانەی دەروونناسی خوێندومانە کە کەسێك ئازارێکی بوو نەیزانی چییە، بۆ ئەوەی لەو ئازارە ڕزگاری بێت، هەر کەس نەخۆشییەکی

هەبێت واهەست دەکات ئەویش هەمان نەخۆشی هەیە، ئەمەش حاڵەتێکی ئاساییە.

ئەم کچە ئازارێکی هەیە لەتاو ئەو ئازارەو موعاناتی ئەو ئازارە لاسایی دایکی دەکاتەوە کە جنۆکەی تێدابووە؟ بەڵام ئەم قسەیەی من ٤٠٪ ڕاستە، مەرج نیە لەوانەشە هەڵە بم؟

عەلی: تاقی دەکەینەوە، بەنەرویجی کەوتە پرسیار لە ئازیز.

عەلی: ئایا هیچ ئازارێکت هەیە؟

ئازیز: بەڵێ سکم دێشێت.

عەلی: پێشتر چوویت بۆلای دکتۆر؟

ئازیز: بەڵێ!

عەلی: پێیان وتویت چیتە؟

ئازیز: گورچیلەو و گەدەم تەواو نییە.

عەلی: ماکوان قسەکەی تۆ دەرچوو.

ماکوان: بۆ خۆشی ئەم قسەیەم کرد. (اخی عەلی) دەرزییەکی بۆ بکە، تازە بوویشیت بە دکتۆر.

عەلی: ئاماژەی بەوەدا کە پێی بڵێم وەزع و ڕەوشەکەی چییە؟

ماکوان: بە ئازیزم وت (اختی عزیز)، زیاتر لەبەر دڵی عەلی بوو هیچت نیە، تۆ نەخۆشی برۆ بۆ لای دکتۆرەکەت و تەواو.

ئینجا بانگی عەلیم کردو لە تەنیشت کاک موستەفا دامنا و هەموومان دانیشتین و من دەستم کرد بە قسە. بەعەلی م وت ببورە کە بەکوردی قسە دەکەم وردە وردە بۆت دەکەم بەعەرەبی.

عەلی: نا، نا ئاساییە تۆزیك کوردیش تێدەگەم.

ماکوان: بەعەرەبی پێم وت عەرەب دەڵێت: هەتا ٤٠ رۆژ موعاشەرەی قەومێکت کرد ئەبیت بەوان، تۆ ئەو قاعیدەشت تێکداوە اخی گیان. مۆرەی لێ ئەکردم.

ڕوومکردە هێرۆ و وتم: هەرکەس بڕوای بە خوا نەبێت کافرە، واتا لە جەهەنمدا دەمێنێتەوە بە هەتاهەتایی. خوای گەورەش قورئانی بە فریشتەکاندا ناردوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) بۆ ئەوەی قیامەتمان پێی بناسێنێت کە دوارۆژمانە، بەهۆکاری ئەم قەزاو قەدەرەی کۆیکردوینەتەوە لێرەدا.

ماکوان: سەیران خان، پێشتر ژیانت چۆن بوو؟

سەیران: هەمیشە لە دڵە راوکێدا بووم، بەردەوام دەتووت تۆپەڵێك موو لەسەر دەم و قورگ و زمانمە کە ئەخەوتم وامدەزانی سینگم ٥ کیلۆی لەسەرە. هەرگیز حەزم نەکردووە گوێ بۆ قورئان بگرم. ئەم شەو دڵم ئاوی خواردەوە کە گوێم لە ئێوە بوو هەست بە سووکی لاشەم دەکەم، وا هەست دەکەم مرۆڤێکی ترم.

ماکوان: زۆر باشە، ئەی کاك موستەفا جەنابت چۆن بوویت دوای ئەوە یەکترمان ناسی و ئەوەی کە ڕوویدا؟

موستەفا: کاکە ماکوان ئەوەی من دیومە یاخوا کەس نەیبنێت، هەمیشە ماندوو بووم تەنها بە مەشروب دەخەوتم، هەمیشە لە خەمۆکیدا بووم. ژیان ڕەش بوو لەبەر چاوم ئەم شەوم لەهەموو ڕۆژێك ڕووناکترە لام کە لەخزمەت جەنابت و کاك عەلی دام.

ماکوان: بەم چەند کاتژمێرە، ئاوا ژیانتان گۆڕا؟

هەردووکیان بەیەکەوە: بەڵێ ئاواز خان و کاك بەختیار ئێوە چی دەڵێن؟

ئاواز: کاك ماکوان من دایکم و باوکم خۆش دەوێت، هیچ نازانم، نە لەدین نە لە پەرستن. نەدایکم فێری کردوم نەباوکم، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەموو ژیانمان خۆش بێت ئیتر من هیچم ناوێت.

بەختیار: لای منیش هەروایە گرنگ ئەوەیە ژیانمان خۆش بێت و بێ کێشە بین؟

ماکوان: هەندێك قسە دەکەم، بۆ عەلی وەردەگێڕم، چونکە عەلی تایبەتمەندە لەو کارە.

خوای گەورە مرۆڤی بە جوانترین شێوە دروست کردووە، پاشان ڕێزی لێگرتوە هەموو دنیای بۆ موسەخەر کردووە، ژیان و زەوی لەبەر دەستی مرۆڤدایە. چۆن جنۆکە دەچێتە ناو لاشەی مرۆڤێك کە خوای گەورە بەو شێوەیە ڕێزی لێگرتوە؟ پاشانیش زەوی و تەنانەت ئەم گەردوونەش لەبەر

دەستیدا دایناوە لەسەروو هەمووشیەوە فریشەتەکان سوجدەیان بۆ باوکمان بردووە، کە ئادەمە، واتا مرۆڤ ئیماندارو سەر راست لە فریشتەش بەڕێز ترە.

کەواتە جنۆکە ناچێتە ناو لاشەی مرۆڤ و دابنیشێت تێیدا وابزانێت هوتێلە. نا بەڵکو بەهۆکاری وەسوەسە تەحەکوم بەسەر ئەقڵیدا دەکات پێی دەڵێت: گوێ بۆ گۆرانی بگرە، تۆ بەقسەی دەکەیت، پێی دەڵێت: زینا بکە بەقسەی دەکەیت، پێت دەڵێت عارەق بخۆ بەقسەی دەکەیت، کەواتە تۆ لەڕێگای شەهوەتی خۆتەوە ڕێگات داوە بە جنۆکەیەکی بێ تواناو شەیتانێك کە خوای گەورە دەفەرموێت هیچ دەسەڵاتێکی نیە! ئەوە ئێمەین دەسەڵاتی بۆ زیاد دەکەین لە ناو ژیانی خۆماندا.

ئێوەی بەڕێز دەزانن ڕۆژانێك بووە مرۆڤ جنۆکەی موسەخەر کردووە وەك پێغەمبەر سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) پاشان لەناو مەجلیسەکەیدا کەسێکی تێدابووە خاوەن زانست بووە لە جنۆکەکان بەهێز تربووە، مرۆڤ بووە، ئایەتەکە دەفەرموێت مرۆڤێك باسی فریشتە ناکات، کەواتە مرۆڤ بەزانست هەموو شتێك موسەخەر دەکات ئاسن، شاخ، دار، ئاسمان، بەرد، کانزا

عەلی: یەعنی چی شاخ و ئاسن و دار و ئاسمان موسەخەر دەبێت. ڕوون نیە لام پاشان چۆن ناچێتە ناو لاشەی مرۆڤ؟

ماکوان: ئاسن موسەخەرە بۆ تەیارەو سەیارەو ئەو هەموو ئامێرەی تر کە بوونی هەیە، شاخ موسەخەرە بۆ ئەو هەموو تونێل و کانزایانەی کە دەرمانهێناوە لە ڕووی زانستی جیۆلۆجیەوە زانیومانە، دار ئەو هەموو

کەرەستەی لێدروست دەکەین. لە کورسییەکەوە بیگرە تا دروستکردنی خانوو. بەرد، چیمەنتۆ، قیر، چەو م هتد.. ئاوا موسەخەرە تێگەیشتی (اخي عەلی). بەنیسبەتی ئەوەی کە تێیدا دابنیشێت هەمیشە لەلاشەیدابێت ولە جیاتی ئەو قسە بکات و مرۆڤەکە بکاتە جنۆکە.

ئەمە موستەحیلە، مەبەستم ئەوەیە کە بە مرۆڤەکان کارە تاوانەکان دەکات کە خۆیشی پێی خۆشە، ڕێگای کردۆتەوە بۆیان، بۆیە ئەقڵ ودەمی موسەخەر بووە بۆ جنۆکە.

عەلی: ببورە وایە

ماکوان: کەواتە ئێمە خۆمان بەدەستی خۆمان ڕێگا دەکەینەوە بۆ هەرچی شەیتان و ڤایرۆس و پیسییە بێتە ناو لاشەمان، وایە؟

عەلی: بەڵام جنۆکە و ڤایرۆس و بەکتریا جیاوازن ئەوە بزانە، ئەگەر مەبەستت ڕاکەی شێخ محمد ڕەزایە لە تەفسیری ماناردا کەوا دەڵێت: نەیپێکاوە؟

ماکوان: نا من ناڵێم ڤایرۆسە، یاخود بەکتریایە، مەبەستی من ئەوەیە چۆن ڤایرۆسو بەکتریا زیانبەخشە، هەڵبەت بەکتریای سوود بەخشیش هەیە، بەڵام مەبەستەکەم ئەوەیە کە ئەویش هەر مەخلوقی خوایە، ئەگەر پارێزگاری لەخۆمان بکەین هیچ تواناو دەسەڵاتێکیان نیە، چۆن نەخۆشی دەرمانی هەیە، ئەم دەردی جنۆکەیەش دەرمانی هەیە.

بەنیسبەت تەفسیری مەنارەوە شێخ محمد ڕەزا ناڵێت جن ڤایرۆسە هەر ئەو قسەیە دەکات کە من لێم وەرگرتوە واتا بەدەرد دایدەنێت کە خۆمان هۆکارین بۆ تووشبوون.

هێرۆ: کاک ماکوان ئەی بۆ لە ئەوروپا کەس باسی جنۆکەو ئەو شتانە ناکات بۆ هەر لەناو ئێمەی موسڵماندا هەیە و دەچێتە ناو لاشەمانەوە؟
ماکوان: ئەم قسەیە هیچ ڕاست نیە، تووشبووی نەخۆشی مەسسی جنۆکە لە ئەوروپادا ڕێژەکەی ئەوەندە زۆرە لەچاو وڵاتی موسڵماندا کە ڕێژەکەی ٢٪ لە وڵاتی موسڵماندا.

لێرە لە ڕووی زانستییەوە مامەڵە ناکەن لەگەڵ جنۆکەدا. بڕوایان پێی نیە وەك تۆ، بەڵام من و ئەم عەلی یەمەنییە کە دانیشتوە لێرە بۆ ئەوەی بزانین چەند حاڵەت هەیە لەئەڵمانیا، لە هۆڵەندا، لەنەرویجی خۆمان، لە سوید؟ لێکۆڵینەوەمان کردووە کە زیاتر لە سەدان هەزار کەس تووش بووی ئەو حاڵەتەن و دەناڵێنن بەدەستیەوە وەك ئەوەی ئەهلی تایبەتمەندی ئەو کارە نیە لە ئەوروپا کە خاوەن بڕوانامە بێت، تەنها عەلی توانی لەڕێگای کەسێکی نەرویجییەوە بۆ تاقیکردنەوە ئەویش بۆ لێکۆڵینەوەکەمان توانی جنۆکەکە لەلاشەی خزمێکی دەربهێنیت.

بۆ کەم ڕۆژ هەیە لەم وڵاتانەدا ڕۆژنامەکان نەنووسن گەنجێك خۆی کوشت، گەنجێك بەبێ هۆکار خۆی خنکاند، هەموو ژیانیان خۆشە پارەیان هەیە، نەتپرسیوە بۆ وادەکەن؟ یان نابینی ئەو هەموو نەخۆشخانە دەروونییە هەیە، کام شار هەیە لە نەرویج و سوید نەخۆشخانەی دەروونی تێدا نەبێت و بەسەدان کەسی تێدا نەبێت؟ وایە؟

هێرۆ: وایە، بەس ئەوە نەخۆشی دەروونین؟

ماكوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە نەخۆشی دەرونین، ئایا نەخۆشی دەروونی چارەسەری نیە؟

هێرۆ: چۆن چارەسەری نیە؟

ماكوان: باشە لە ئەوروپا هەیە ١٦ ساڵە دەناڵێنێت بە دەست ئەو حاڵەتەوە؟ نمونەیەكی بەرچاو باشە كاك موستەفا دەتوانیت دوو وشە بە عەرەبی قسە بكات؟

هێرۆ: نا عەرەبی نازانێت؟

ماكوان: كاك بەختیار كاتێك عەلی جنۆكەكەی دەرهێنا لە لاشەی كاك موستەفا بەچی قسەی دەكرد؟

بەختیار: وەڵڵا بەعەرەبی قسەی دەكرد ڕێك وەك موزیعی جەزیرە وابوو؟!

ماكوان: وەڵامت چییە بۆ ئەمە هێرۆ؟ ئەوە كاك موستەفایە لێی بپرسە بزانە عەرەبی دەزانێت؟

هێرۆ: بەپێكەنینەوە نازانم!

ماكوان: نازانم رەحەتی گیانە، بۆ دانی پێدا نانێیت، بەڕاستی و دروستی بڵێیت ئەوە مەخلوقێكی ترە، بڕوا دەكەیت حەزقیلم لەدەموچاوی كاك موستەفادا بینیوە؟

موستەفا: حەزقیل كێیە؟

ماكوان: جنۆكەیەكە رەفیقی منە، نازانم چی لێهاتوە!

موستەفا ڕەنگی زەرد بوو ئەو فەقیرە! جا لەبەر ئەوە بڕوا بوون بەو شتانە دەبێت زۆر ئاسایی بێت بەلاتانەوە، ئەوەش بزانن كە زۆر بێدەسەڵاتن، مرۆڤ ئەوانی بەكارهێناوە پاشان پەیمانی خوای گەورەیە زەوی مرۆڤ ئاوەدانی دەكاتەوە، نەك مەخلوقاتی تر.

بەڵام من چی بكەم لەم سەردەمەدا مرۆڤ هەیە موسەخەر بووە بۆ حەیوان لە زۆر جێگا هاوسەرگیری لەگەڵ ئاژەڵدا دەكات. مرۆڤ یاخود كۆیلەی حەزو لووتبەرزی خۆی بووە، هەیە لاشەی جوانە بووە بە عەبدی لاشەی، ئافرەتە بووە بە بەندەی جوانییەكەی خۆی وە هەروەها.

عەلی: ماكوان من دەبێت بڕۆم كات زۆر درەنگە كاتژمێر ٢ی نیوەی شەوە.

ماكوان: فەرمووو اخ عەلی، مع الف سلامة

عەلی ڕۆشت و هاتمەوە لای میوانەكانم تۆزێك قسەی ترمان كرد، بەنیاز بووین بخەوین لەپڕ لەدەرگا درا.

خوایە بەم شەوە كێیە لەدەرگا ئەدات، بانگم كرد كێیە؟ لەدەرگا ئەدات وەڵام نیە، چوومە دەرەوە و دەرگام كردەوە كەس نەبوو.

هاتمەوە سەرەوە خەریكی جێگا دابەشكردن بووین چۆن بخەوین دیسان لەدەرگا درایەوە.

كێیە؟ وەڵام نەبوو.

بەپەلە ڕامکرد بۆ لای دەرگاکە و بیکەمەوە.

# جنۆكە و وەسوەسە و سیحر

دوایی ئەوەی کە جاری یەکەم لە دەرگا درا، کەس نەبوو هاتمەوە لای میوانەکانم بۆ ئەوەی هەرکەسە بچێتە ناو جێگای خۆی بۆ خەو، جارێکی تر لەدەرگا درایەوە بانگم کرد کێیە؟ لەدەرگا ئەدات دەنگ نەبوو.

ناچار بە پەلە چوومەوە خوارەوە سەیرمکرد کەس نەبوو تۆزێك وەستام. دەرگای دراوسێکەمان کرایەوە. وتی ماکوان من بووم دووجار دام لە دەرگا بەیانی دەچم بۆ کار دەنگتان زۆر بووە، تکایە تۆزێك هێمن تر قسە بکەن!

منیش داوای لێبوردنم لێکرد و وتم ڕاست دەکەیت، میوانم هەیە ئەم شەو ناهێڵم دووبارە بێتەوە.

هاتمەوە لای میوانەکانم و ئاگادارم کردنەوە کە دراوسێکەم بووە.

هەموو چووینە ناو جێگا بۆ خەوتن، بەڵام شەو من خەوم لێنەکەوت لاپتۆپەکەی خۆمم ڕۆشن کرد. چوومە پاڵتاک و نامەم نارد، بۆ هاوسەرەکەی هێرۆ.

پەیامێکم بەجێهیشت کە بەزووترین کات پەیوەندیم پێوە بکات. ژمارەی تەلەفونەکەی خۆمم بۆ دانا بۆ ئەوەی پەیوەندیم پێوە بکاتەوە، پاشان خەوتم.

بۆ بەیانی سوپاس بۆ خوا بەئاگا هاتین و کاك موستەفا وتی: ماکوان گیان بۆ نایەیت بەیکەوە تا ماڵی ئێمە بڕۆین، هەرچی مەشروبە بیدەم بە نەرویجییەکان و ماڵەکە پاك بکەینەوە؟

ماکوان: ئاساییە، لەخزمەتاندام جا باشە بۆ دەیدەیت بە نەرویجی و خۆت تاوانبار دەکەیتەوە، بۆ فڕێی نادەی لەبەر خوا؟ یان دەیڕێژینە ناو تەوالیتەکەوە شوشەکانی فڕێ ئەدەین؟ ڕازیت؟

موستەفا: تۆ چی بڵێیت وادەکەین.

چووین بۆ ماڵی کاك موستەفا ئەوەی ویستمان کردمان هەرچی وێنەی ئافرەت و مەشروب و هەیکەل(پەیکەر) بوو، فڕیماندا و مەشروبەکانم هەمووی ڕژاندە ناو تەوالێتەکە، پاشان بارەکەیم کرد بە کتێبخانە و زیاد لە ١٠ کتێبم لەگەڵ خۆمدا بۆ برد و قورئانێکشم لەگەڵ خۆمدا برد.. سوپاس بۆ خوا نانی نێوەڕۆمان خوارد. لەدوایدا ئەوەم عەرزی کاك موستەفا و خێزانەکەی کرد بەگشتی کە خوای موتەعال مرۆڤی دروست کردووە خۆشی دەوێت، ڕاستە بۆ بەندایەتی دروستی کردووە، بەڵام بەندایەتی لە ئیسلامدا تەنها نوێژ و ڕۆژو و حەج و زەکات نیە، بەڵکو هەموو کارێکی باش لە ئیسلامدا بەندایەتییە.

نوێژ و فەرزەکانی تر، بەگشتی دروشمە ئاینییەکانن، دەنا هەموو کارێکی موسوڵمان بەندایەتییە، خوای گەورەش پێویستی بە نوێژو ڕۆژووەکانمان نیە، بەڵکو ئێمە لەڕێگای ئەو نوێژ و ڕۆژو و بەندایەتییەکانەوە خۆمان نزیك دەکەینەوە لە خوای گەورە بۆ ئەوەی پارێزراو بین لە فیتنەی شەیتان و تەنانەت مرۆڤە شەیتانەکانیش، جا سەیران خان سحیرو جادو ئەم کارانە

هەر ئەمری خوای گەورە و بە دەستی خوای گەورەیە، خوای گەورە ڕازی نەبێت لەسەری نابێت.

هێرۆ: باشە كاك ماكوان واتا خوا ڕێگەی داوە كە ئەو سیحرو جادووانە بكرێت؟!

ئەگەر وانییە خوای گەورە خۆی بۆ لە ناویان نابات؟

ماكوان: نیوەی قسەكەت ڕاستە و نیوەشی لەبەر ئەوەی تۆ بێباوەڕی لێی تێنەگەیشتوویت؟

هێرۆ: چۆن؟

ماكوان: بۆ ئەوەی بزانیت هەر كەس لەم ژینەدا دینی نەبوو وەك میزەڵدان وایە هەر كەس هەڵسا یاری پێدەكات، چونكە بێ ئامانجە لەم ژیانە زۆر بێهودە یە. ژیانی بە گاڵتەوگەپ و بە پێكەنین و گۆرانی و هەرچی كردووە و كۆشیوە لەبیری خۆی دەباتەوە تەنها خۆی مەشغوڵ دەكات، یان بڵێم ئەیەوێت خۆی سەرقاڵ بكات تا ئەوكاتەی دەمرێت و مردن ڕێگای پێدەگرێت.

هۆكارەكەی تۆش كە ئەم پرسیارە دەكەیت پێت وایە زۆر زیرەك و ئاقڵیتو خەڵكێك توانای وەڵامەكەی نیە بیداتەوە، لەدڵی خۆتدا ئێستا وادەزانیت تۆ زۆر بەتوانا و دانشمەندی، لەكاتێكدا وانیە. تۆ نازانی خوای گەورە هەرچی لەم بوونەدایە دروستی كردووە واتا خالقی هەموو شتێكە لەم گەردوونەدا بە سیحرو شەیتان و دزی و پیاوكوشتن ئەوی كە خراپە، دڵنیابە خوا دروستی كردووە ئەوەیە كە تۆ و نمونەی وەك تۆ لێی تێناگات. ئەوەیە

کە خوای گەورە ئەمری بەخراپە نەکردووە، واتا ئازادی داوەتە دەست مرۆڤ خۆی هەڵیدەبژێرێت. یاسای ناو مرۆڤەکانیش وایە کە ئازادن لە هەڵبژاردنی چاکەو خراپە

بۆ نمونە: فریشتەکان یاسایان وایە هیچ خراپەیەك ناکەن، چونکە ئەوان ئازادییان نیە! بەڵام کە خوای گەورە ڕێزی مرۆڤی گرتوە بەهۆکاری پینج خاڵە.

یەکەم: ئازادی داوەتێ

دووەم: ئەقڵی پێبەخشیوە

سێیەم: قورئانی بۆ ناردوە

چوارەم: پێغەمبەرێکیشی ناردوە بۆ ڕۆشنکردنەوەی قورئانەکە

پێنجەم: سروشت و فیطرەتی پاکی داوە بە مرۆڤ هەر لەسەر ئەو ئازادی و ئەقڵ و قورئانەیە کە پێغەمبەریشی بۆ ڕەوانە کردووە و سروشتی پاکی داوەتێ لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات. هیچی لە نێوچەوان نەنووسیوە، وەك پڕو پیرێژن دەڵێن، بەڵکو خۆی هەڵدەبژێرێت.

بۆ نمونە: سیحرو جادوو هیچ توانایەکی بەسەر مرۆڤدا نیە، ساحیرو جادووبازەکە هەردووکیان دووسەگی دڕی برسی بەستراوەن خوای گەورە بەستوونیەتیەوە، ئەو(پەت)حەبلەی کە خوای گەورە پێی بەستونەتەوە بەدەستی خۆیەوەیەتی دەستێکی بەهێز گرتوویەتی. تۆی مرۆڤ کە ئازادی کە ئەقڵ بەکار ناهێنی ئەو سەگە پیسەو برسیە و دڕندەیە کە گوێ

بۆ قورئان ناگريت چۆن ئامۆژگاريت دەكات، شوێنكەتووی پێغەمبەرەكەت (دروودی خوای لێبێت) نيت، پاشان سروشت و ناو دڵ و دەروون و فيطرەی خۆت پيس دەكەيت، دوايش دەڵێيت: بۆ خوای گەورە دروستی كردووە؟ يان شەكر دەشكێنرێت و دەڵێت: لەناوچاوم نووسراوە؟

تۆ خۆت ئەڕۆيتە بەردەم سەگەكان، خۆت بەئازادی دەچيتە بەردەميان بۆ ئەوەی بتخۆن. لەكاتێكدا ئەگەر ئازاد نەبوويتايە وەك ئەو مولحيدو بێباوەڕانەی كە لەدين نازانن دەڵێن: ئێمە هەمووشتێكمان لە نێوچەوان نوسراوە، خۆ ئەگەر خوای گەورە ئاگاداری نەكردينايەتەوە لەكارە خراپەكان حەقت بوو بڵێی بۆ خوای گەورە لەناوی نابات، يان من هيچ زانياريم نەبوو بەرپرس نيم لێی؟

من دەمەوێت پرسيارێك لە تۆ بكەم هێرۆ؟

فەرمووو..؟

باشە كێ ڕێگای لە تۆ گرتوە ئێستا هەڵسی نوێژەكەت بكەيت، ئەقڵت؟ يان تەمەڵی؟ يان ئارەزوو؟ يان خوا؟

هێرۆ: من بۆ خۆم بڕوام نيە، ئەقڵم نايبڕێت؟

ماكوان: زۆر باشە، كەواتە ئەگەر مردی، گومانی تێدانييە هەمووومان دەمرين وايە؟

هێرۆ: وايە

ماکوان: ئەگەر خوا هەبوو قسەکەی تۆ هەڵە بوو لەو حاڵەتەدا چی دەکەیت؟

هێرۆ: دەڵێم عەفوم کە؟

ماکوان: بەڕاست؟ لە ژیانتا سوجدەیەکت نەبردووە، بەقسەت نەکردووە، سڵاواتێکت نەداوە لە پێغەمبەرەکەی، رۆژوویەکت نەگرتوە، پێت وایە هەروا ئاسانە. تۆ بەقسەی خاوەن کارەکەت ناکەی لەسەر ئیشەکەت چیت لێدەکات، کە لەوانەیە ١٠ساڵ بێت کارت بۆ کردبێت؟

هێرۆ: دەرمدەکات.

ماکوان: ئەو خوایە وا نزیکەی ٣٠ ساڵە چاوەڕێت دەکات، هەموو شتێکی پێداوی جوانی، ئەقڵ، زیرەکی، پارە، لەشساغی..هتد، باشە کەچوویتەوە بەردەمی موستەحەق نیت بەوەی کە تۆڵەت لێبکاتەوە؟ خۆی دروستی کردوویت؟ مادام بڕوات پێی نیە دەبێت تەحەمولی ئەوەش بکەیت بچیتە جەهەنەم ئەوە من پێت دەڵێم خوای پەروەدگار هەیە. تۆ دەڵێیت من بڕوام نیە، ئەگەر بوو خۆت بەرپرسی لۆمەی کەس مەکە.

هێرۆ: ئەی جنۆکەیەك بۆ نەهاتە ناو لاشەی من تابڕوا بکەم؟

ماکوان: تۆ خۆت جنۆکەی شەیتانی، ئیشی چییە بەتۆ؟ ئەوەی ئەو دەیکات تۆش دەیکەیت، ئەو دەیەوێت لاشەت دەرخەیت ئەوەتا بەرانبەر من دانیشتوویت قاچت دیارە، باڵت دیارە، جگەرە دەکێشی، سەما دەکەیت، خو ناپەرستی، بەندایەتی ناکەیت، تۆ بۆ خۆت نوێنەری شەیتانی، بێت بۆ

لای تۆ چی بکات؟ من پرسیار دەکەم، ئەگەر بەتۆ بڵێم پێناسەی شەیتانم بۆ بکە کە چی دەوێت لە مرۆڤ چۆن پێناسەی دەکەیت؟

هێرۆ: ماکوان ئەزانی تۆ زۆر قسە ڕەقی، خۆت بەچی دەزانی؟ ئەو مافەت نیە بەو شێوە قسە لەگەڵ من بکەیت.

ماکوان: وەڵامی پرسیارەکەت نەدامەوە خۆت دەرباز کرد بەوەی من قسە ڕەقم،بەدڵنیاییەوە ڕاست دەکەیت قسە رەقم، بەڵام حەقم، پێناسەی شەیتانیش تۆیت بەدڵنیاییەوە تۆیت، ئەگەر تورەشی برۆ یەك تەنەکە ئاوی سارد بکە بەسەرتا با هێمن بیتەوە!

سەیران خان: وەڵڵا ماکوان گیان قسەکانت ڕاستن، هێرۆ خوشکەزای منە، من باشی دەناسم زۆر بێدینە.

ماکوان: بەڵێ دەزانم بە ئاشکرا بە منیشی وتوە و نەیشاردۆتەوە.

کاك موستەفا: یەك پرسیارم لێت هەیە، ئێمە چی بکەین بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەو حاڵەتە نەیەتەوە بەسەرماندا؟

ماکوان: من نمونەیەکت بۆ دەهێنمەوە هیوادارم لێی تێبگەیت، ئەگەر تێنەگەیشتی کاك موستەفا گیان تکایە چەند جار پێم دووبارە بکەرەوە.

موستەفا: فەرمووو؟

دەگێڕنەوە جارێکیان پیاوێکی خواناس و یەکتاپەرست هەڵسا بەوەی بچێت دارێك خەڵکی دەیانپەرست ببڕێتەوە ، وتی ئەمە شرکەو هاوبەش

دانانە با من بڕۆم ئەم دارە ببڕمەوە، خەڵك لەم کوفرو هاوبەش دانانە ڕزگاری بێت.

بەڵێ تەوری هەڵگرت لەڕێگادا شەیتانی لێپەیدا بوو لەسەرشێوەی مرۆڤێکدا پێیووت: پیاوچاکی خوا بۆ کوێ دەڕۆیت؟

پیاوچاکەکە: دەچم ئەو دارە دەبڕم کەخەڵکی تووشی فیتنەو کوفرو شرك کردووە؟

شەیتان: جا تۆ پەیوەندیت چیە بەو کارەوە، کاکە حەقت نەبێت، ئەم خەڵکە بەتۆ چاك ناکرێت.

جا کاك موستەفای بەڕێز شەیتان یەکەم کاری ئەوەیە کە دەڵێت: تۆ حەقت نەبێت بەسەر خەڵکییەوە بۆ خۆت تووشی کێشە دەکەیت!

پاشان کابرای پیاوچاك وتی: نا من هەر دەیبڕم ئەوە شرکەو کوفرە واجبە لەسەرم.

شەیتان: پیاو چاکی خوا واز لەمە بێنە من هەموو ڕۆژێك دوو دینارت ئەدەمێ، بۆ ئەوەی تووشی کێشە نەبیت و دارەکە مەبڕە، ڕازیت!؟

کابرای پیاوچاکیش وتی باشە، هەڵخڵەتا بەقسەی شەیتان چەند ڕۆژێك چوو شەیتان پارەکەی بۆ ئامادە کردبوو لەدوایدا شەیتان دەنگی نەما. کابرا هەڵسا تەوری هەڵگرت بۆ ئەوەی دارەکە ببڕێتەوە لەڕێگادا دیسانەوە شەیتان لەسەر هەمان شێوەی کابرای پێشوو لێی پەیدابووەوە و پێیووت بۆ کوێ دەچیت؟

پیاوچاکەکە: دەچم دارەکە دەبڕم؟

شەیتان: ناتوانیت ئەوکارە بکەیت.

کابرا: دەیکەم ئەوا دەڕۆم؟

شەیتان یەك پاڵی پێوەنا ختسی و تەورەکەشی لەدەست وەرگرت، پیاوچاکەکە: پرسی چۆن ئەوەندە بەهێز بوویت لە کاتێکدا چەند ڕۆژێك لەمەوبەر جورئەتی ئەمەت نەبوو؟

شەیتان: ئەو کاتەی کە هاتی ویستت دارە کە لەبەر خوابېڕیت، بەڵام ئێستا لەبەر پارە دەیبڕیت هاتنەکەت هیچ کاریگەری نیە.

جا کاك موستەفای بەڕێز، سەیران خان تکام وایە کارەکانتان لەبەر خوا بێت. شەیتان و هەرچی خراپەی سەرزەوەییە لە تەوحید و یەکتاپەرستی دەترسن، خوا بە پاکی و تەنهایی رابگرن سەرکەتووی دنیاو قیامەتن، بۆ ئەو بژین و بۆ زاتی بەرزی و پیرۆزی بمرن هیچ کەس ناتوانێت بێت بەلاتاندا.

موستەفا: ماکوان گیان ئەم بەیانییە عەلی کوڕەکەی ڕەفیقی تۆ تەلەفونی بۆ کردم لەناو سەیارەکەی بەختیار بووم لەڕێگادا داوای ئازیزی کچمی کرد بۆ ئەوەی بخوازێت! جا خۆشت دەزانی لێرە کچ خۆی خاوەنی بڕیارە، منیش ئەوەندە وتم با بەکچەکەم بڵێم لە بەر خاتری تۆ خۆم چووم قسەم لەگەڵ ئازیز کرد، بەخوا دەڵێت: شوو ناکەم بەعەلی جا تکایە تۆ لەجیاتی من وەڵامەکەی پێ بڵێ.

ماکوان: باشە بەسەر چاو (کە وای وت زۆرم پێناخۆش بوو، بەڵام دەسەڵاتم نەبوو، ئەگەر ئەو زەوییە چاڵی تێدابوایە خۆم دەکرد پیایدا ئەوەندە تەریق بوومەوە). لەدوای ئەوەی کە هاتمەوە ژێر سفر جەرەسی تەلەفونەکەم لێیداو هەڵمگرت توی مەلیك بوو یاخود هاوسەرەکەی هێرۆ بوو سەروەر.

سەروەر: مامۆستا ماکوان السلام علیکم!

## کەبالا و سیحری ڕەش و ثیۆصۆفیی

لەدوایی ئەوەی زەنگی تەلەفونەکەم لێیدا هاوسەرەکەی هێرۆ بوو بەناوی سەروەر.. کە پێشتر یەکترمان ناسیبوو لە تۆڕی میدیایی پاڵتۆك، سڵاوی کرد منیش لە مەجلیسەکەدا هەڵسام و بە سەروەرم وت: وعليكم السلام برا و ناوەکەیم نەهێنا.

سەروەر: مامۆستا ماکوان خۆشحاڵ بووم بەوەی داوای ئەوەت کردبوو کە قسەت لەگەڵ بکەم، لەخزمەتاندام ئەوەی بە من بکرێت؟

ماکوان: سوپاس کاکە سەروەری بەڕێز، جەنابت لە کام شاری؟

سەروەر: لە شارێکم نزیکی ئۆسلۆیە ناوی (ئۆپەگۆرە)، نزیکەی یەك کاتژمێر دوورم لە جەنابتەوە.

ماکوان: بەڵێ دەزانم ماڵی خەزووریشم هەر لەو ناوچەیەیە، من ئەمڕۆ و سبەینێ و تا دووسبەی کارم نیە، تەنها ئەمڕۆ کە جومعەیە دەچمە مزگەوت دوای نوێژ هیچ کارێکم نیە کەی دەتوانم بتبینم؟

سەروەر: هەرکات پێت خۆشە من لەخزمەتاندام.

ماکوان زۆر باشە دوای نوێژی هەینی دێمە خزمەتتان.

سەروەر زۆر باشە قوربان لە خزمەتام.

دوای ئەوەی لەماڵی کاك موستەفا خواحافیزیمان کرد بە کاك موستەفام وت: با بچین بۆ مزگەوتی نزیك ناوچەکەی خۆتان کە مزگەوتی عەرەبەکان و مزگەوتێکی تریشی لێبوو سۆماڵییەکان ئیدارەیان دەکرد. ئەوم برد بۆ مزگەوت.

ماڵئاوایم لەوان کرد، من هەر دەچووم بۆ ماڵی خەزوورم بۆلای ماڵ ومنداڵ بۆ ئەوەی بیانهێنمەوە، وتم بەیەکجاری سەردانی سەرووەریش دەکەم لەوێوە نزیکە، دوای نوێژ پەیوەندیم لەگەڵ کاك سەرووەر گرتەوە و یەکترمان بینی لە بازاڕی شارەکەی خۆیان. دوای هەندێك موجامەلەو یەکترناسینی ئاسایی، چونکە یەکەم جار بوو ببینم، بەڵام پێشتر قسەمان کردبوو لەڕێگای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە.

ماکوان: ژنت هێناوە کاك سەرووەر؟

سەرووەر: وەڵڵاهی کاك ماکوان ژنم هێناوە، بەڵام ئێستا جیابووینەتەوە.

ماکوان: واتە تەڵاقت داوە؟

سەرووەر: لە حوکومەت جارێ هەر لە چاوەڕوانی جیابوونەوەداین، وەك تەڵاق پێم ووتوە سێ بەسێ تەڵاقم داویت، ئیتر هیچ پەیوەندییەکم پێوەی نەماوە ئەوە بۆ ماوەی ٨ مانگە.

ماکوان: ئەی ناتوانم چارەسەری کێشەکەتان بکەم بێمە ناو کێشەکەتانەوە؟ خۆت دەزانی هەڵوەشاندنەوەی خێزان لە ئەوروپا هەروا ئاسان نیە، دوای ئەوەش ژن هێنان و شوکردن لەئەوروپا زۆر سەختە، خۆت دەزانی کە

پێکیەوە دەنێیت زۆر قورسەو کە جیادەبیتەوە ئاسانەو یەکگرتنەوەشی هەر زۆر سەختە؟

سەروەر: ڕاستە، بەڵام هەموو کەس تەدەخول بکات ناهێڵم تۆ دەست بخەیتە ئەوە کارە.

ماکوان: بۆ براکەم؟

سەروەر: وەڵڵاهی کاك ماکوان ئەو ژنەی من زۆر رقی لە تۆیە! کە گوێم لە تۆدەگرت هەزارو یەك قسەی ناشرینی پێدەوتی، جا ئێستا تۆ بچیتە ناو ئەم کارەی ئێمە تۆزێك قورسە، ئەو وادەزانێت من ئیهانەی دەکەم؟

ماکوان: تۆ خێزانی خۆتت خۆش دەوێت؟

سەروەر: بەدڵنیاییەوە خۆشم دەوێت، بەڵام هەست دەکەم ناگونجێین. ئەو ئافرەتە لە ڕێکخراوێکی جیهانی کار دەکات زۆر ترسناکە دەیەوێت منیش بخاتە ئەو کارەوە.

ماکوان: ڕێکخراوی چی؟

سەروەر: کاك ماکوان بیرتە شەوێکیان بەیەکەوە لە پاڵتۆك قسەمانکرد وتم کەبالاو غەنوصی چییە و چین؟ و بۆت باسکردم کە ئێستا لەڕێگای زەردەشتییەوە هاتونەتە کوردستانیشەوە؟ نازانم بیرت ماوە؟

ماکوان: بەڵێ جوان بیرمە.

سەروەر: خێزانەکەی من و چەند کوردێکی خەڵکی رۆژهەڵات و لەگەڵ چەند فارسێکدا ئەوەندەی من بزانم لە ڕێکخراوێك کار دەکەن ناوی ڕێکخراوی کابالا یە، یان دەڵێن ئیلومینات، یاخود گوێم لێبووە زۆر جار بە -زووهار- ناوی خۆیان بردووە. لەم ماوەیەدا هەڕەشەیشیان لەمن کردووە بۆ کوشتن! ئەگەر ڕێزی خێزانم نەگرم و ئەو هەرچی وت بەقسەی نەکەم؟

تەنانەت فارسێکیان لەم ماوەی ڕابوردودا کە پێشتر دەمناسی هەڕەشەی ئەوەی دەکرد، ئەگەر ڕێك نەکەوینەوە لەگەڵ خێزانم ئەوا ئەو مارەی دەکات و زۆر بێئەدەبانە قسەی دەکرد، ڕۆژێك هەندێك شتم مابوو چووم هێنام لەلای هێرۆ، ئەوم بینی لەماڵی خۆماندا زۆربێتاقەت بووم؟

ماکوان: هەر خۆی بوو ئەو کوڕە لەماڵی خێزانەکەت؟

سەروەر: نا ئەو فارسە ڕەفیقی برای خێزانمە براکەشی لەگەڵیدا بوو لەگەڵ دایکیان.

ماکوان: زۆر باشە، من هەڵە بیرم لێکردەوە، ئەی خۆمان ناتوانین قاچ و دەستێکی بشکێنین و بۆ حەوت پشتی ئاقڵی بکەین؟

سەروەر: وەڵلاهی کاك ماکوان نازانم بڵێم چی، من لەو جۆرە کەسانە نیم زۆر حەزم بە ئاژاوە نیە.

ماکوان: وەڵڵا من لەو جۆرە کەسانەم تۆ ئەوە دانێ بۆ من تا ڕۆژی خۆی دێت، بەهەر حاڵ ئەگەر بەقسەی برای خۆت دەکەیت ئیجازەی من بدە قسەیەك لەگەڵ هاوسەرەکەت بکەم، بەڵکو پێکبێنەوە.

سەروەر: جا کاك ماکوان من پێم خۆشە، بەڵام ژیان وانابێت ئەو ئافرەتە بێ دینە خوانەناسە.

من ناگونجێم لەگەڵیدا ئەو لەو ڕێکخراوانە کار دەکات تۆ خۆت دەزانی چین وخەریکی چین؟

ماکوان: ڕاست دەکەیت، ئەگەر توانیم و گۆرانکاری ڕوویدا بەدڵی جەنابتان بوو، واتا ئەوەی جەنابت دەتەوێت وادەرچوو ئامادەی بچیتەوە لای؟ ئەمەی دەیڵێم لەوانەیە خەیاڵ پڵاو بێت بەس هەوڵێکە ئەیدەم.

سەروەر: زۆرمەمنون دەبم بەس کاك ماکوان جەنابت کارێکت هەبوو بەمن تا لەخزمەتاندابم؟

ماکوان: ڕاستی من لەگەڵ هێرۆی خێزانی جەنابتاندا تووشی ڕووداوی هاتوو چۆ بووین لەشاری فرێدریکستادا. ماڵی پوری لەگەڵدا بوو خەڵکێکی بەڕێز بوون باسی قسە کرا، هێرۆش خۆی ئەوەی درکاند کە بەهۆکاری من لە تۆ تورە بووە ڕقیشی لەمنە. لە ڕاستیدا زۆر خەفەتم پێخوارد کە ژیانتان بەهۆکاری من تێك بچێت. هەرچەندە من نازانم جەوهەر چییە؟ مەگەر ئەوەی خۆت باستکرد، بەڵام سوپاس بۆ خوا شتەکان زۆر لەباشیدایە.

کاك موستەفا وازی لە مەشروب خواردن هێناوە و ئێستا خەریکی نوێژە، ئەوە ڕاستی و دروستی کارەکەیە.

سەروەر: بەڵێ ڕاست دەفەرمووی ئاساییە بۆ من خۆشحاڵیش دەبم بەو کارە، بۆ زانیاریت کاک موستەفا پیاوێکی باشە، سەیران خانی خێزانیش زۆر

ژنی چاکە. بەڵام خەسوم زۆر نالەبارە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو خوشکەیدا، بۆ زانیاریشت دەڵێن بەدەستی خۆی مێردەکەی کوشتوە.

دوای دانیشتنەکەمان لەگەڵ سەروەر خوا حافیزمان کرد و منیش چووم بۆلای ماڵ و منداڵ.

بەڵام مێشك و هزرم زۆر ئاڵۆز بو وبوو داخۆ چۆن دەبێت ئەم ئافرەتە لەو ڕێکخراوە ترسناکەدا کار بکات! کە هەرچی ڕێکخراوی تیرۆرستی هەیە لەمەوە دەردەچێت، پەیوەندیم کرد بەو بەڕێزانەی کە پێشتر هاوکارییان کردبووم لە زانکۆو خەڵکی ئەکادیمی بوون، داوای زانیاری تەواوم کرد لەسەر کەبالا و غنوصی[٧].

زانیاری باشم کۆکردووە لەدڵی خۆشمدا دەمووت ئاخر ڕەوایە کچێکی کورد، یان کورد لەناو ئەم جۆرە ڕێکخراوانەدا کار بکەن؟ زۆر مێشکم مەشغوڵ بوو بەو باسەوە، لەکاتێکدا هەموو ئەم باس و خواستانە بە کورد نامۆیە، چۆن کورد خۆی تووشی ئەو دەردە دەکات لە کاتێك دا هیچ پەیوەندی بەسەر میللەت وکلتور و تەنانەت دین و ڕێکخراوە سیاسییە عەلمانیەکانیشەوە نیە لە کوردستانی ئێمەدا.

ناچار تەلەفونم کرد بۆ کاك موستەفا و داوای ژمارەی هێرۆم کرد؟

موستەفا: ئەوە ئەی دەمە سەیران ئەو دەزانێت.

---

[٧]- لەبەشەکانی دواتردا باسی کەبالا ڕوون کراوەتەوە.
غنوصی: لە کۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەی پێدراوە.

کاک موستەفا گلەیی لەمن کرد کە سەردانی ناکەم.

سەیران خان: لەو ڕۆژەوەی کە تۆ ڕۆشتویت لەم ماڵە، ئەو کچە نەهاتوە بۆماڵمان.

ژمارەکەی دامێ و تەلەفونم کرد بۆ هێرۆ.

ماکوان: حەز دەکەم بتبینم؟ کاتمان دانا و شوێنمان دەست نیشان کرد.

چاوەڕێم کرد تا هاتە ئەو جێگایە کەدیاریم کردبوو، بەسەیارەیەك هات چەند کوڕوکچێکی لەگەڵدا بووا هاتە لای من و دەستمان کرد بە قسەکردن بە دەم پیاسەوە.

ماکوان: لە ڕووی نەفسییەوە زۆرم پێناخۆش بوو کە لەسەر من لەگەڵ سەروەر جیابوونەتەوە و لەیەک عاجز بوون. سەروەر هاوڕێمە، لەمڕۆژانەدا کاتێك چووم بۆ ماڵی خەزوورم بینیم. باسی ئەوەی کرد کە چەندە تۆی خۆش ئەوێت، ئەشزانم تۆش سەرەوەرت خۆشدەوێت، جا هاوکاریتان دەکەم کە بتوانن خێزانێکی سەرکەووتو دروست بکەنەوە تۆش هەوڵبدە بتوانیت ببیتە هاوسەرێکی باش و بەنزیکترین کاتیش ببیتە دایکێکی باش؟

هێرۆ: بڕوا ناکەم ئێمە بتوانین ژیان لەگەڵ سەروەر دروست بکەینەوە سوپاسی تۆ دەکەم بۆ هاوکارییەکەت وازی لێبێنە، من سەروەرم لەبیر کردووە؟

ماکوان: پەلە مەکە لە بڕیاردان سەروەر کوڕێکی بەڕێزو عاقڵ و زۆر موئەدەبە ئەو جۆرە کوڕانە خەڵکی بە پارە دەیکڕێت. تۆش ئەو کوڕە بەڕێزە هاوسەرتە هەروا لەدەستی مەدە. من دەزانم ئێستا ئەم ئازادییەی کە تۆ بەدەستت هێناوە خۆشە و لێپرسینەوەت نیە لەسەری، تەنها چەند ساڵێکی ترە ئاوا سەرقاڵی بەخۆشیەکانتەوە لەگەڵ هاورێکانت، بەڵام کە نەخۆش بوویت، کە تەنها بوویت، کە ترس دایگرتی پێویستت بە سەروەرە، چونکە ئەو پارێزەری تۆیە لە دوو ڕووەوە لە رووی کەسایەتی خۆت و پاشان شەڕەف و حوورمەتیشەوە!

هێرۆ: ئاخر کاك ماکوان ناگونجێین؟

ماکوان: بۆ ناگونجێن؟ تۆ خۆت نەتووت من سەروەرم خۆش دەوێت؟

هێرۆ: بەڵێ خۆشم دەوێت، ئەمجارە لەبەر خۆشەویستییەکەیە کە نامەوێت بیبینمەوە! من هەموو ژیانم ئاڵۆز بووە، ناتوانم هاوسەرم هەبێت. ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت ببمە هاوسەرێکی باش و دایکێکی باش بم ئەوە تازە موستەحیلە بۆ من ناکرێت!

بەدەنگیکی زۆر غەمبار پێی وتم چاو و قورگی پڕ لەگریان بوو.

ماکوان: بۆ چی ڕوویداوە؟ (هەرچەندە لەوسەریەوە هاتوومەتەوە دەمزانی گیرۆدەی ئەو کۆمەڵە کەسە بووە)، بۆیە بە پێکەنینەوە وتم: خۆ نەبوویت بە کەبالای سیحری ڕەش و فەلسەفەی ثیوصۆفی بەسەرماندا لێبدەیت و کتێبی سیحری زووهاریت خوێندبێت و ئەفکاری غەنوصی بڵاوبکەیتەوە؟ کەوام وت ڕەنگی تێکچوو..

هێرۆ: کێ ئەمانەی بۆ باسکردوویت؟ سەروەر؟

ماکوان: بۆ سەروەر شتی وادەزانێت؟ یان تۆ دەزانیت ئەوە چییە؟

دەستی گرت بەدەممەوە

هێرۆ: باسی نەکەیت ئێستا وادەزانن من پێم وتویت تۆش و منیش دەکوژن.

ماکوان: کێ؟

هێرۆ: نوێگەرەکان[^]! ئەوانە سیحری ڕەشیان لەمن کردووە و ناچار بووم لەگەڵیان بم.

ماکوان: خۆ تۆ بڕوات پی نەبوو؟

هێرۆ: ماکوان واز لە من بهێنەو با کەس نەزانێت پەیوەندیمان هەیە؟

ماکوان: بۆ چی بووە؟

هێرۆ: ئەوەی تۆ دەیزانی و ئێستا باسی دەکەیت بۆ سەر ژیانی تۆ و ماڵ و منداڵت مەترسی هەیە؟

ماکوان: ناشێت لەو ڕێکخراوە کار نەکەیت؟

---

[^]- لە کۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەی پێکراوە.

هێرۆ: بەڵێ لەوێ کاردەکەم، بۆیە زۆرم بەلاوە سەیرە تۆ ئەوەت زانی، وە ئەگەر بزانن کە شتێك دەزانیت لەوبارەیەوە و لەگەڵیاندا نیت، حەتمەن ئازارت ئەدەن شێتت دەکەن یان تووشی هێرۆین و حەشیش و مادده هۆشبەرەکانت دەکەن یان دەتکوژن.

ماکوان: لەگەڵ من ئەوە ناخوات، من خوام هەیە ئەوان شەیتانیان هەیە، دەزانی تۆ لە دەوڵەتی شەیتان ئەندامی ئێستا؟ بیرتە پێم وتی تۆ خۆت شەیتانی پێت ناخۆش بوو؟ ئەوە ئێستا ئاشکرا بوو کە تۆ ئەندامێکی دەوڵەتی شەیتانی کە بەوشێوە قسەم لەگەڵ کرد ڕایکردەوە بۆلای هاوڕێکانی، منیش شوێنی کەوتم کە نزیکی بوومەوە پێمووت ڕاوەستە قسەت بۆ دەکەم، ئاگام لێ بوو یەکێك لە کوڕەکان وتی هێرۆ شەڕیەتی لەگەڵ ئەوکوڕەدا مەبەستی من بوو، بەزمانی فارسی بە کوڕێکی تریانی وت بابڕۆین یارمەتی بدەین. دوو کوڕ دووکچی لەگەڵ بوو واتا ٥ کەس بوون هەموویان ڕووەو من هاتن بۆ ئەوەی پەلاماری من بدەن، زانیم نیازیان خراپە، ڕووم لە هێرۆ وەرگێڕاو ڕوومکردە هاوڕێ کوڕەکانی لەدڵی خۆمدا وتم ئای ئێستا چیم لێدەکەن، شەق بەشەق دەڵێت جێگام بکەرەوە هەر چواریان هاتن! دەستم لە خۆم شت.

کوڕێکیان لێم نزیك بوویەوە خوای گەورە کردی هەر هاتە لام و شەقێکم تێسرەواند لە زەوییەکەدا تەخت بوو، ئەوانی تر لە جێگای خۆیاندا وەستان. چوومە سەر سکی وتم با ئەوان چاو ترسێن بن، زۆر هاواری کرد بە هاوڕێکەی دەووت کوسکەش بۆ یارمەتیم نادەیت ئەها کوشتمی. زوو چوومە پێشەوە بۆ ئەوی تر زللەیەکی لێبدەم هەر چاو ترسێن بێت، هێرۆ هات دەستی منی گرت و وتی: تو خواکەت وازمان لێبێنە با بڕۆین.

ماکوان: باشە برۆ بەڵام وازت لێناهێنم دەبێت یان ببیتەوە بە هاوسەری سەروەر یان دێم لەناوتاندا شەڕ دەکەم، من و تۆ دەبێت بکوژرێین لەناویاندا.

خەڵکی ئەو ناوە پەیوەندییان بە پۆلیسەوە کردبوو، پۆلیس هاتنە ئەو ناوە و بەمنیان وت چی بووە؟

ماکوان: هیچ..

پۆلیس: ئەی شەڕتان نەکردووە؟

ماکوان: شتی وا ڕوویندداوە، کوڕە فارسەکانیش بەهەمان شێوە ئینکاریان کرد، بەپۆلیسەکانم وت لەوانەیە ئەو دوو هاوڕێیە یاریان کردبێت خەڵك بەهەڵە تێگەیشتبن.

پۆلیسەکە داوای لێبووردنی کرد کە ئیزعاجی کردووین.

ماکوان: ئاساییە دەنگێك لەپشتمەو هات ناسراو بوو بەزمانی نەرویجی وتی: بەڕێز ماکوان هاوکاریت ناوێت؟ ئەمانە چیان دەوێت لە تۆ؟ کە ئاوڕمدایەوە تەماشا دەکەم حەزقیلە!

## من و حەزقیل

له دوای ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی هێرۆ بووە شەڕمانو کۆتایی هات، هەردوولا ویستمان بڕۆین. دەنگێك لە دوامەوە هات بەزمانی نەرویجی وتی: بەڕێز ماکوان هاوکاریت ناوێت؟ ئەمانە چیان لە تۆ دەوێت؟ منیش کە ئاوڕم دایەوە حەزقیل بوو! لەڕووی دەروونیەوە زۆر باش بووم لە دووانم دابوو، بەدەم پێکەنینەوە ڕووەو حەزقیل ڕۆشتم، لەدڵی خۆمدا وام دانابوو هەتا هێزم تێدایە یەك دانەی پێدا دەکێشم.

ورده ورده بەدەم پێکەنینەوە ڕۆشتم هەلوو خاڵە حەزقیل، چۆنی باشی دەنگو باستان ئەوە ماوەیەکە دیار نین بەڕاستی تاقەتم بۆت چوو بوو!

من هەرچەندە بەرەو ڕووی دەرۆشتم ئەویش ورده ورده دەڕۆشتە دواوە.

ماکوان: خاڵە حەزقیل ئەوە بۆ دەڕۆیتە دواوە؟

حەزقیل: خاڵە ماکوان هاتنەکەت ترسناکە، ئەڵێی بۆشەڕ دێیت بۆلام، تۆ دەزانیت کە ئێمە دەتوانین ئێوە بڕفێنین و بتانکوژێن، ئەگەر نیازی شتێکت هەیە، واز بینە با دوو قسە بکەین!

دڵنیابووم لەوەی کە جنۆکە عیلمی غەیب نازانێت و ناتوانێت دڵی من بخوێنێتەوە، بەڵام هەستم کرد بەوەی کە ئەویش هەستی بەوە کردووە کە من شتێکم لە ژێر سەردایە.

یەكسەر وەڵامم دایەوە جا ئەگەر ئێوە ئەوەندە بە جورئەتو ئازا بوونایە ئێستا مرۆڤتان لە سەر زەویدا نەهێشتبوو. بەئاسایی وتم لێدانی من ئاسانە هەركات بمەوێت لێتدەم و عەزیتت بدەم بە قورئان و سوننەت ئەتسوتێنم.

حەزقیل: ماكوان تۆ دەزانی لەسەردەمی محمد پێغەمبەرەكەتاندا ئێمە دوو هاوڕێی محمدمان ڕفاندو یەكێكیمان سەربڕی، ئەوی تریشیانمان كوشت!؟

ماكوان: ئەزانی درۆ دەكەیت بەخزمەتی ئەو فەرموودەیە گەیشتووم هەندێك دەڵێن ڕاستە و هەندێكیش دەڵێن ئەوە لە (دیاری ئەمودا) بوون. پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) فەرمووی دوور مەكەونەوە، بەڵام بەقسەی پێغەمبەریان نەكرد و پاشان با بردوونی نەك ئێوە[1].

ئەو فەرموودانەی كە هاتووە گوایە جنۆكە مرۆڤ دەڕفێنێت هەمووی خورافاتە، ئەگەر گریمان قسەكەی تۆش ڕاست بوو، چونكە هەندێك لەزانایان ئاماژەیان پێداوە كە جنۆكە خەڵكیان ڕفاندوە ئەوا لە شەیتانی مرۆڤەو هاوكاری خۆتانە بۆیە تواناتان هەیە بەسەریدا.

حەزقیل: باهەندێك گفتوگۆ بكەین، بەس تكایە هیچ مەكە بۆ ئازاردانی من باشە! پێم خۆشە قسەت لەگەڵ بكەم.

ماكوان: بە مەرجێك ئەگەر راستگۆ نەبوویت ئەوەندە ئایەت دەخوێنم تا ئەونێرمەوە بۆ مەغریب؟ تەنها راستگۆبە، باشە!

---

[1] - محمد ولد ددو الشنقیطی، لە ووتارێكیدا شەرحی ئەو فەرموودە دەكات، ئەمەی خوارەوەش لینكی ووتارەكەیە.

DxbJbAtDmXM=v?watch/com.youtube.www//:https

حەزقیل: باشە بەمەرجێك تۆش نەڕۆیتە ناو ژیان و جیهانی ئێمە.

داواكارییەكانت كە دەیكەیت تۆش دەبێت داواكاری من قوبوڵ بكەیت، چەندم بەقسە دەكەیت ئەوەندەت بەقسە دەكەم.

ماكوان: من هەموو شتێك قوبوڵ دەكەم لەچوارچێوەی دینەكەمدا خۆ من وەك تۆ كافر نیم. ناتوانیت بەئارەزووی خۆت مەرجم لەسەر دابنێیت، پێت خۆش نیە ئەتوانیت ئێستا بڕۆیت ئەگەر نارۆیت خۆم ئەترِفێنم.

حەزقیل: فەرموو بزانم چیت دەوێت، بەس بەخوا زۆر بێنیازی بۆ وا خۆت نیشان ئەدەی پێویستت بە هیچ نیە، وەك خۆتان دەڵێن زۆر لە خۆت رازیت.

ماكوان: بەدڵنیاییەوە لەخۆم ڕازیم، چونكە خاوەنی ئیسلامم. من تەنها پێویستم بە خوایە مەخلوقێكی زەلیلی وەك تۆ چیە، تا داوات لێبكەم.

ئادەی تۆ كێیت؟ بۆچی هاتوویت؟ چیتان لەمن دەوێت؟

پەیوەندی تۆ چییە لەگەڵ سەسیل دا؟ ئەمانەم پێ بڵێ.

حەزقیل: ساحیرێك هەیە لە كوردستان ئەو سیحری لێكردوویت، كەسێك داوای لێكردووە كە سیحرت لێبكات، زۆر هەوڵیداوە لەگەڵ تۆ و چەند كەسایەتێكی تریش نەیتوانیوە كاریگەری جادووەكەی بگەیەنێتە تۆ، داوای كردووە لە ڕێگای ئێمەوە كارەكەی ئەنجام بدەین.

ماكوان: ئەو ساحیرە كێیە و ناوی چی یە؟ لەكام شارە؟ بۆ من بەتەنها لەكوردستانەوە؟

حەزقیل: من نازانم بۆچی تۆ، ئەوەندە دەزانم کە ئەو ساحیرە داوای لێکردووین کە تۆ ببەستین و پاشان بچینە ناو لاشەت، ئینجا ئەو کەسە کێیە داوای کردووە، من نایناسم تەنها فەرمانەکەی جێبەجێدەکەم، ساحیرەکەش ناناسم. منیش لە ناو گروپێکدا کاردەکەم بۆ ڕوحانییەکی ساحیر لە ڕێگای ئەوەوە ڕاسپێردراوم.

ماکوان: بەستنی چی؟ من سێ جار ژنم هێناوە.

حەزقیل: لەئێستاوە هەوڵماندا‌وە نەمانتوانیوە.

ماکوان: لەدڵی خۆمدا وام بە باش زانی بانگەوازی ئەم جنۆکەیە بکەم، چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبێت) بۆ ئەوانیش هاتووە ئیسلام دینی هەمووانە.

باشە حەزقیل تۆ لەوە ناترسیت بمریت و بچیتەوە بەردەم خوای پەروەردگار؟

تۆ نازانیت من و تۆ هەردووکمان خوای گەورە ئیسلامی بۆ ناردووین، بۆ بەندایەتی دروست بووین، تۆ بۆ سوجدە نابەیت بۆ پەروەردگارەکەت؟ دژایەتی دینی خوا دەکەیت شوێن پێغەمبەرەکەی ناکەویت بۆ وادەکەیت حەزقیل؟ ئەی نازانی بەهەشت و جەهەنەم هەیە؟

خۆت بۆ کێ ئاوا زەلیل دەکەیت بۆ نابیتە پیاوچاك، لە خوا بترسە واز لە کۆیلایەتی بهێنە، بۆ کار لەگەڵ ساحیر وشەیتان دەکەیت؟ خوای گەورە تەنها ڕێزی لە ئێمەی مرۆڤ و جنۆکە گرتوە ئەقڵی پێبەخشیوین، تەکلیفی بەندایەتی لێکردووین، واتا ڕێزی گرتووین و کەرامەتی پاراستووین تۆ بۆ

دەیشكێنی حەزقیل؟ تۆ دەبوو زووتر بڕوات بهێنایە، هەست ناكەیت بە قورئانی خوای گەورە ڕاوت دەنێین و لە موسڵمانان دەترسن. ئەمە مانای ئەوەنیە دینی ئیسلام دینێكی پاك و بێگەردە و ڕاستە؟ تۆ نازانی ئیبلیسی شەیتانی خزمتان نەفرەت لێكراوە لەدنیاو قیامەتدا؟ من واهەستم كرد ئەوانیش ژیانیان وەك خۆمانە وتم وا ٥٠ساڵی تر ژیایت،

لەخوا بترسە زوڵم بۆ لە من دەكەیت و لەخەڵكی تریش، زووڵمكردن لەخەڵكی و جا چ مرۆڤ بێت یان جنۆكە ئەوە یەكێكە لە تاوانە گەورەكان سوتاندنی لەدوایە و لەدۆزەخدا دەمێنیتەوە، بۆ دەبێت بچیتە ئاگری جەهەنەم لەپێناوی كەسێكی تردا؟ تۆ وەك قامچی دەستی خۆی بەكاردنێت و لەمسەر بۆ ئەو سەری دونیا دەتگێڕێت، هەست ناكەیت ژیانت وەك ژیانی باڵدارێكی ئاژەڵ و پەلەوەرە؟

ئینجا باسی ئەو كۆمەڵە جنۆكەیەم بۆ كرد كە ئیمانیان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) هێناوە و سورەتی جن م بۆ خوێندەوە.

حەزقیل: بۆ تۆ وا دەزانی ئاسانە! ئەگەر بزانن موسڵمان بووم جنۆكەكانی تر دەمكوژن.

ماكوان: من نازانم ژیانی ئێوە چۆنەو سیستەمی ژیانتان چۆن دەڕوات، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئیسلام بوون هەر زۆر ئاسانە، تۆ خوات هەیە ئەوان كێیان هەیە؟ ئەی مەگەر لە ناو ئێوەدا موسڵمان نییە؟ ئەی بۆچی ئەوان ناكوژن؟ بڕۆ ناو ئەوان لەوان نزیك بەرەوە، حەتمەن دەتپارێزن. تۆ تەمەنت چەندە حەزقیل؟ماڵو منداڵت هەیە؟

حەزقیل: من تەمەنم ٣٣٠ ساڵە! ١٨ منداڵم هەیە، دوو جار هاوسەرگیرم کردووە، دوو منداڵم بەدەستی ئێوەی مرۆڤ کوژراوە! هەر ئەوەش وای لێکردم کە دژی مرۆڤەکان کار بکەم، دەنا من کەسێکی مەسیحی بووم پێشتر لە مەسیحییە ئەرتۆدۆکسەکان بووم. ماوەیەك بوومە جولەکە و دوای ئەوەش ئێستا هیچ دینێکم نیە لەگەڵ گروپی شەیتانێکی ساحیر کاردەکەم دژی ئێوەی مرۆڤم. زۆریش گەڕاوم ئەوەتەی ئەم کاری سیحرو جادوە دەکەم هەستم کردووە کە تەنها ئایینێک کە ڕاستە ئیسلامە.

ماکوان: کێ منداڵەکانتی کوشتووە؟ پێم ناخۆشە بەڕاستی حەزقیل شەڵڵا خۆت بوویتایە، بەس بۆ منداڵەکانت بەڕاستی پێم ناخۆش بوو. ئەی چۆن مردوون؟

حەزقیل: مرۆڤ کوشتونی، یەکێکیان سوتاوە لە نێوانی جەنگی عێراق و ئێراندا بە هۆکاری کیمیایی و دانەکی تریشم لە ئەوروپا کوژراوە لە جەنگی جیهانی دووەمی ئێوە.

ماکوان: ئەی باشە تۆ تەمەنت ٣٣٠ ساڵە، باشە ئێوە چەند ساڵ ئەژین، ئایا تۆ گەنجی؟ پیری؟ ئەم لاشەیەی ئێستا بەکاری دێنی چییە، چۆنە؟

حەزقیل: ئێمە وەك ژیان هەزار بۆ هەزارو دوو سەد ساڵ دەژین، وەك ئێوە لاشەمان هەیە و ڕوحیشمان هەیە، بەڵام ئێمە وەك وزە واین، ئێوەی مرۆڤ نامانبینن، هەر ئەو وزەیەیە کە دەتوانێن خۆمانی پێبگۆڕینە سەر لاشەی مرۆڤ و ئاژەڵ، ئەویش هەموو لە جنۆکەکان ناتوانن هەندێکمان نەبێت! وەك ئێوە دەمرین و دەژین و نان دەخۆین و وەك ئێوە خاوەن

ماڵو حاڵی خۆمانین، من تەمەنم گەنجە زۆریش گەنجم، ئەوەش بزانە ئێمە لەئێوەی مرۆڤ زۆر ترین دە ئەوەندەی ئێوە دەبین.

ماکوان: ئەی بۆ موسڵمان نابیت حەزقیل، ژیانت بەخۆشی بەریتە سەرو ئەوکات من و تۆ دەبینە برا؟

حەزقیل: ماکوان من نزیکەی ٤ بۆ ٥ساڵە ئاگاداری ژیانی تۆم، کەسێکی زۆر خاوەن پەرژینی، ئاگام لە تاوانەکانت بووە، ئاگام لە چاکەکانت بووە. ئەوەی من پێی سەرسامم چالاکی و چاونەترسیتە لە هەموو شتێك. تاوانت کردووە، بەڵام زوو پەشیمان بوویتەوە، هەوڵت داوە خەڵکی بۆ ئیسلام بژین.

ماکوان: ناچار خۆم بە بەهێزتر نیشاندا، وتم ئێمەی موسڵمان هەموو هەر واین خوای گەورە بە ئیسلام عەزیزی کردووین، بەهێزین نە لەمردن سڵ دەکەین نە لە ژیان، بەڵکو تێگەیشتووین لەوەی بە ئازایەتی لە ژیانمان هیچ کەم ناکات، بەترسنۆکیش هیچ لە ژیانمان زیاد ناکات ئەو قەدەرەیە کە بۆمان نووسراوە جا ئیتر بۆ بترسین؟

حەزقیل: ڕاستە، هەر ئەوەشە وای کردووە کە ئێوە لە ئێمە ئازاترو بەهێزتربن، بۆیە زەوی بۆ ئێوە بوو نەك ئێمە.

ماکوان: جا کە ئەمە دەزانی بۆ ئیمان ناهێنی، نەکو نێزەکێك، ئاوێکی گەرم فیشەکێك یاخود تۆپێکت بەربکەویت، دوایی بمریت و بە کافری لە جەهەنەمدا بمێنیتەوە بە ئەبەدی، واتا نە ڕۆژێکەو نە دوو، نە ساڵێکە و نەملیۆنێك ساڵ، بەڵکو هەتاهەتاییە، بێ پایانە حەزقیل گیان. فریاکەوە نەکو ڕسوای دنیاو قیامەت بیت.

حەزقیل: باشە ماکوان موسڵمان دەبم، بەڵام هاوکاریم بکە با جنۆکەکانی تر نەمکوژن.

ماکوان: جا باشە چۆن هاوکاریت بکەم؟ خۆ ناتوانم کڵاشینکۆفێك هەڵگرم و ببمە پاسەوانت. نازانم من چی بکەم؟

حەزقیل: عەلی دەتوانێت؟

ماکوان: عەلی یەمەنی خۆمان؟

حەزقیل: بەڵێ! ئەو.

ماکوان: باشە بەسەر چاو ئەوە هەر زۆر ئاسانە، بەڵام بۆ ئەوەی من دڵنیا بم شایەتومان بێنە و تەوبە بکە با منیش بەجدی کارت بۆ بکەم.
حەزقیل: أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمدا رسول الله، کەوای وت ویستی تۆبە بکات، گوێم لەهاواری حەزقیل بوو سەسیلم لەدوای خۆمەوە بینی.
سەسیل: بەتەمای چیت ماکوان؟ هەروا بەسەرتەوە ناڕوات، زۆر خراپت بەسەر دێنم.
ئاوڕم دایەوە حەزقیل نەمابوو؟

# خەفەت خواردن بۆ جنۆکە

لەدوای ئەوەی کە ئاوڕم دایەوە بەلای حەزقیل دا نەمابوو، دووبارە ڕووم کردەوە سەسیل، کەچی ئەویش نەمابوو.

خەفەت دایگرتم نەمدەزانی چیبکەم هیچم لە دەسەڵاتدا نەبوو، نەمدەزانی خەفەتی حەزقیل بخۆم یان هێرۆ.

لە دڵی خۆشمدا بە خۆمم دەووت توخوائەوە مەعقولە دەبێت خەفەت بۆ جنۆکەش بخۆم! زۆر بێتاقەت بووم کورد وتەنی: گەیشتبوومە ئەوپەڕی.

لەو کاتەدا بیرم کردەوە کە چی بکەم، تەنها خوام هەیەو پاشان عەلی یەمەنی.

تەلەفونم کرد بۆ عەلی هەڵینەگرت، نامەیەکم بۆ نارد وتم لەکوێیت؟ زۆر کارم پێتە ئەخ عەلی.

چوومەوە بەرەو ماڵ، دوای نیو کاتژمێر عەلی نامەیەکی ناردەوە نوسیبووی چوومەتەوە بۆ یەمەن. ئێستا لە یەمەنم (١٧) ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە.

بۆم نووسیی ژمارەی یەمەن بنێرە زۆر کارم پێتە؟

نوسیبووی: (ئازیزم) بۆ مارە دەکەیت؟

بۆم نوسی لەوە گرنگترە، خێرا خۆی تەلەفونی بۆکردم لەڕاستیدا بۆ سێ مانگ دەچوو کە وەڵامەکەم دابووەوە پێی کە باوکی ئازیز چی وتووە،

بەڵام هەر دەیووت بەڵکو بەردەوام هەوڵم بۆ بدەیت، منیش بەسادەیی وتم باشە، وایزانیبوو وەڵامەکەی وەرگرتۆتەوە.

عەلی: خێر! مژدەت پێیە؟

ماکوان: ئەوەڵا باسی مەوزوعی جنۆکەکانە حەزقیل موسڵمان بووە، کێشەی بۆ دروست بووە دەمەوێت لەوبارەوە قسەت لەگەڵ بکەم، ژمارەکەی یەمەنم بەرەیَ بە کارتی ئاسمانی قسە دەکەینەوە هەرزانترە؟

عەلی: باشە ئەوە ژمارەکەیە.

دوای کاتژمێرێك پەیوەندیم پێوە کردەوە هەموو باسەکەم بۆ کرد.

عەلی: جا ڕاست دەکات؟

ماکوان: نازانم عیلمی غەیبم نیە.

عەلی: مەبەستم ئەوەیە دەبێت بزانیت ئەوان زۆر درۆ دەکەن نەکو ویستبێتی قسە لە تۆ دەربهێنێت و فێڵێکی تری ئەوان بێت لە تۆ!

ماکوان: ئەخ عەلی ئەزانی بۆچی پەیوەندیم پێوە کردیت؟ بیرتە جارێکیان ووتت شێخێك هەیە پەیوەندی لەگەڵ جنۆکەی موسڵماندا هەیە و خۆشت وتت قسەم لەگەڵ کردوون سەلامیان لێکردوویت! جا بزانە لەڕێگای ئەوانەوە عەمو حەزقیلمان بۆ نادۆزنەوە و چی بەسەر هاتووە، هیچ نەبێت هاوکارییەکی بکەن ئەوە هەموو کارەکەی منە.

عەلی: ڕاستە وابوو، هەموو هەوڵێکی خۆم ئەدەم.

لە پاشاندا من گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان ماوەیەکی زۆر ژیانێکی زۆر ئاسایم دەبردە سەر.

ڕۆژێك کاك موستەفا پەیوەندی پێوە کردم و وتی: ماکوان گیان خانووەکە و سەیارەکەم و هەندێك شتی ترم هەبوو فرۆشتوومە، تەنها شوقەیەکم لێکرِیوە کردومە بەناوی ئازیزەوە. ١٤٠،٠٠٠ دۆلارم هەیە دەمەوێت هەمووی بکەم بە خێرو بیبەخشمەوە هەموویم داناوە، نازانم چی لێبکەم و چۆن بیدەمە دەستت؟

ماکوان: واتا مەبەستت ١٤ دەفتەرە وایە؟

موستەفا: بەڵێ وایە.

ماکوان: قسەیەك بکەم عاجز نابیت؟

فەرمووو؟

ماکوان: خۆ سەرخۆش نیت و دەستت نەکردۆتەوە بە مەشرِووب خواردنەوە؟

موستەفا: بە پێکەنینەوە، ماکوان گیان قسە لەگەل سەیران بکە.

ماکوان: وەڵڵا خۆ پێم خۆشە با مەرحەبایەکی بکەم (دوای چۆنی و چاکی و پرسینی هەواڵی) سەیران خان ئەوەی باسی دەکات تەواوە و ڕاستە؟

سەیران: ئەرێ وەڵڵا ماکوان گیان تەواوە،ماڵی ئێمەی کاولکردووە و ئەوە حاڵ و گوزەرانمانە. دەڵێت: هەمووی دەبەخشم لە پێناوی خوادا ماکوانیش وەکیلم بێت.

ماکوان: کاک موستەفام بدەرێ، ئاخر کاک موستەفا تۆ مافی ئەوەت نیە کە هەمووی ببەخشیت بەشی ماڵ و منداڵت لێ داناوە؟ زوڵم لە خێزانەکەت مەکە.

موستەفا: وەڵڵا بەشی هەموویانم داوە بەزیادەوە ئەمە بەشی خۆمە لەهەموویان کەمترم بۆ ماوەتەوە. من بەشی خۆم دەکەمە خێر کەس بۆی نیە قسە بکات، ئەگەر هاوکاریم ناکەیت بەیەکێکی تر دەڵێم.

ماکوان: جا قوربان من لەخزمەتاندام، چەند پرۆژەیەکت پێدەڵێم ئەگەر بەقسەم بکەیت تا قیامەت خێرت دەگات، ئەگەر بەقسەی ماکوان دەکەیت لە ئەوروپا بیکە بە مزگەوتێك و دەبێتە سەدەقەیەکی جاری، یاخود بیدە بەچاپخانەیەك بینێرینەوە کوردستان لەوی تەنها پەرتوکی ئیسلامی و شەرعی پێ چاپ دەکەین، ئەوەش هەر سەدەقەی جاریە، یاخود بینێرەوە بۆ نەخۆشخانەی هیوا یان ئەیدەینە منداڵانی هەتیوو لە کوردستان نەیهێشت قسەی تری بۆ بکەم.

موستەفا: ئەوە تۆم کرد بە وەکیل بیکە بە مزگەوت لە نەرویج!

دوای خواحافیزی تەلەفونی داخستەوە، منیش قسەکەم بەهەند وەرنەگرت زۆر گوێم پێنەدایەوە.

ڕۆژێك چووم بۆ ئوسلۆ بۆ سەردانی ڕەفیق و برادەرانی خۆم لە دوکانی شیرینییەکی ئێرانی لامدا و دەستم کرد بە شیرینی و قاوە خواردن هەر خۆم بووم چاوەڕوانی کوڕێکی برادەرمم دەکرد، کەسێك هاتە ژوورەوە سڵاوی کردو تەماشای دەکردم، هاتە پێشەوە و وتی: جەنابت کاك ماکوانی؟

ماکوان: بەڵێ، لەبەری هەڵسام و خوڵکم کرد. دانیشت قاوەیەکم بۆ بانگ کرد لەگەڵ هەندێك زلوبیا و بامێ و شیرینی دیکە. عەرزم کرد جەنابتان کێن؟ لەکوێ بەخزمەتی یەکتری گەیشتووین؟

کەسەکە: من ناوم سەریاسە ساڵی ۲۰۰۲ هاتمە نەرویج، ئێوارەیەکی زۆر سارد بوو لە ویستگەی شەمەندەفەر هاتم لێم پرسیت عەرەبی یا کوردی؟ تۆش وتت فەرموو من کوردم، وتم تازە هاتوومەتە نەرویج هیچ نازانم چی بکەم؟ ئەو ئێوارە منت بردەوە بۆ ماڵەکەی خۆت، لەگەڵ پیاوێکی تر دەژیایت ناوی کاک مەلا یاسن بوو.

ماکوان: ڕاستە دەفەرمووی وەڵلاهی من هەر بیریشم نەمابوو، دەی ئێستا چۆنی شوکر بۆ خوا ئیقامەت وەرگرتوە؟

سەریاس: بەڵێ، وا چەند ساڵێکیشە ڕەگەزنامەی ئەم وڵاتەم هەیە و ژنم هێناوە دوو منداڵیشم هەیە سوپاس بۆ خوا. ئەزانی کاك ماکوان من جاروبارش لە پاڵتۆك گوێت بۆ دەگرم.

ماکوان: ڕاست دەکەی خۆشحاڵ بووم، ئەی لە ئۆسلۆ دەژی؟

سەریاس: نەوەڵڵا لە شارێکم نزیکی- بێرگن-، بەسەردان هاتومەتە ئۆسلۆ مزگەوتەکان دەگەڕێین، لەو شارەی ئێمە کڵێسایەك هەیە شارەوانی دەیفرۆشێت، کەس ناچێتە ناوی و کڵێساکە ئەندامی نەماوە، داوای سێ ملیۆن کرۆنی لێدەکەن، مزگەوتەکەشمان لە گەڕەکێکدایە کە خەڵکی ئەو گەڕەکە دەڵێن: نابێت مزگەوت لەو گەڕەکەدا هەبێت، بیناکەشی کرێیە ئەگەر تا مانگی داهاتووو چۆڵی نەکەن دەرمان دەکەن. جا هاتووم بۆ ئۆسلۆ لەگەڵ هەندێك برای تردا لە سۆماڵی و عەرەب و ئەفغانی و چیچانی و بۆسنی بۆ کۆکردنەوەی پارە لە ئۆسلۆ، خۆشمان ئەهلی مزگەوتەکە نزیکەی ملۆنێك کرۆنمان هەیە، کڵێساکەش خراوەتە موزایەدەوە ئێمە دەتوانین ملیۆنەکە دابنێین و وەریگرین، بەڵام کابرایەکی نەرویجی نازیی ڕەگەز پەرست دەڵێت من دەیکرم دوو ملیۆن ئەدەم نەکرێت بە مزگەوت بیکەن بە بازاڕ ئەو کێشەیەمان هەیە.

ماکوان: یەك دەقە پەلە مەکە بزانم هەموو پارەکەتان بۆ پەیدا ناکەم، بەو مەرجەی مزگەوتەکە ناو بنێن موستەفا.

سەریاس: وەڵڵا حەز دەکەی ناوی دەنێین ماکوان.

ماکوان: نا موستەفا بەلامەوە گرنگە ناوی پێغەمبەری خوایە. ئەو کەسەشی کە پارەکە ئەدات ناوی موستەفایە، جارێ بابزانم پارەکە ماوە.

سەریاس: کاک ماکوان بەڕاستە؟

ماکوان: هەر زۆر بەڕاستمە و بەجدیمە، پەلە مەکە با هەڵیگرێت.

دووجار جەرەسم لێدا هەڵینەگرت، بێ هیوا بووم.

ماکوان: بەداخەوە ڕێنکەوت ئێستا وەڵامەکەت بدەمەوە، بەڵام کەسێك هەیە خێر دەکات بەو دەڵێم و وەڵامت لێدەگێڕمەوە، تەلەفونەکەتم بدەرێ.

سەریاس: زۆر خۆشحاڵی و مەمنونی دەربڕی و بانگی رەفیقەکانی کرد بە تەلەفون، هاتن و ناساندمی بەهەموویان و سۆماڵییەکەی ڕەفیقی سەریاس پێشتر ڕەفیقی خۆم بووە لە کەمپدا بەیەکەوە بووین. باوەشمان کرد بەیەکدا زۆر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، ئەحمەد سۆماڵی وتی من و ماکوان لە باکوری نەرویج بەیەکەوە مزگەوتێکی ترمان دروست کردووە.

خۆشحاڵیم بۆ ئەحمەد دەربڕی کە حافز قورئانە و کوڕێکی زۆر بەڕێزە لەم قسەو باسانەدا بووین، لە پڕ تەلەفون لای کاک موستەفاوە کرا. باسی ئەوەم بۆ کرد کە دەیانەوێت مزگەوتێك بکرن و ئێستا لای مندا وەستاون موحتاجی پارەن. دەڵێی چی لەسەر وەعدەکەی خۆت ماوی کاک موستەفا گیان؟

موستەفا: ماکوان گیان پێیان بڵێ با ئێستا بێن، پارەکە ئامادەیە.

ماکوان: زۆر باشە ئێستا دێنە خزمەتت و هاوکاری تەواویان بکە.

موستەفا: تۆ بەتەما نیت لەگەڵیان بێیت؟

ماکوان: نە بەخوا ناتوانم وەعدم داوە بە برایەك بێت بۆلام.

موستەفا: وەڵڵا تۆ نەیەیت پارە نادەم بەکەس.

هەموو جەماعەت وتیان بۆ خاتری خوا ماکوان لەگەڵمان وەرە، خوای گەورە کارەکەمانی ئاسان کردووە.

بە کاك موستەفام وت باشە دێم لەخزمەتاندا دەبم، ئاگاداربن ٣ سەیارەین جێگەمان دەبێتەوە لەماڵەکەتاندا؟

موستەفا: بەڵێ جێگا زۆرە، بێ خەم بە.

ماکوان: ئەدرەسی ماڵەکەتان بنێرە من نازانم لەکوێدایە؟

موستەفا: هەر ئێستا.

ماکوان: کەوتینە ڕێ ئەحمەد سۆماڵی و سەریاس هاتنە لای من.

چووینە ماڵی کاك موستەفا سەیران خان نانێکی خۆشی دروستکردبوو، کاك موستەفا پارەکەی هێناو کردیە کۆشی من و منیش دامە ئەحمەد سوماڵی لەبەرچاو هەموو ئیدارەی مزگەوتەکەدا ئەو چەند کەسە پارەکەیان ژمارد و وەصلێکی مۆرکراوی ئیدارەی مزگەوتەکەیان دایە دەست کاك موستەفا، (سبحان الله) کە وتم مزگەوتەکە ناودەنێن بەناوی موستەفا لە خۆشیدا دەستی کرد بەگریان باوەشمان پێدا کرد.

ئەحمەد: ئەم ساڵ لەگەڵ قافڵەی خۆمان بەیەکەوە دەچین بۆ حەج وەك دیاری مزگەوتی موستەفا.

لە ڕێگا باسی ژیانی موستەفام کرد بە کورتی بۆ ئەحمەد و سەریاس، ئەوانیش سەفەری حەجیان بۆ ڕێك خست بە دیاری،

ماڵئاواییمان کرد لە دەرگاکەدا بە سەیران خانم وت دەنگوباسی هێرۆ چۆنە سەردانتان دەکات؟

سەیران خان: هیچ ئاگام لێی نیە، ئەوەندە نەبێت دایکی وتویەتی کە زۆر نەخۆشە، جارێك ئازیز چووبوو بۆلای بە ئازیزی وتبوو ئیتر مەیە بۆ لام دەریکردبوو!

ماکوان: ئەی ئازیز چۆنە، لەگەڵ نوێژەکانیدا باشە؟

سەیران: هەر خەریکی موزیك و جیقە جیقە، دەیکات و بەزۆر پێی دەکەین و بیری دەچێتەوە، ئیتر ئاوایە.

ماکوان: چۆن ژمارەی تەلەفونی هێرۆم دەست بکەوێت، ئەو ژمارەی کە لای منە داخراوە.

سەیران خان: بۆت پەیدا دەکەم ان شاألله.

ئیدارەی مزگەوتی موستەفا پێش من دەرچووون لەماڵەکە و ڕۆشتنەوە بەرەو شاری بێرگن، چونکە شارەکەی ئەوان ٨ کاتژمێر لە ئێمەوە دوورە ، منیش ٢٠ خولەک دوور بووم، بۆیە تۆزێك مامەوە لە پارکی شوقەکاندا لەگەڵ کاک موستەفاو سەیران خان وتم: کاك موستەفا چی وای لێکردی بەو شێوەیە مامەڵە بکەیت، ئەو هەموو پارەیە ببەخشیت؟

موستەفا: ماکوان ئەوەتەی من بیرم بێت پارەم هەبووە، لە ساڵی ١٩٩٦ لەسلێمانی ئەوەی کە بینیومە بۆت باس دەکەم شەوێك خەوم بینی بەتۆوە

لە خەونمدا لەماڵە کۆنەکەمان کە فرۆشتم لەوێ وتت موستەفا چیت هەیە بیفرۆشە بۆت دەکەم بەخێر.

ڕۆژان ڕۆیشت وا ساڵی ٢٠١٤یە بە ئەمری خوای گەورە تۆم لەو ماڵەی خۆماندا بینی، چەند مانگێك لەمەوبەر خەونەکەم هاتەوە یاد ئەو خەونەم بیرکەوتەوە ساڵی ١٩٩٦ بینیبووم بۆیە بڕیارمدا خەونەکە بهێنمەوە دی.

ماکوان: ڕاستە کاك موستەفا گیان، ئەوە خەوی قەدەریە. مرۆڤ ڕوحی لەگەڵ قەدەریدا تێکەڵ دەبێت زۆر جار ڕووداوێك بە خەو دەبینیت دوایی دووبارە دەبێتەوە لە واقیعدا.

دوای ماڵئاواییم لەماڵی کاك موستەفا سواری سەیارە بووم بەرەو ماڵی خۆمان لەڕێگادا پیاوێك دەرۆشت زۆر لەباوکم دەچوو، منیش باوکم لە ساڵی ١٩٩٢ وە کوژراوە خوای گەورە بە شەهید قوبوڵی بکات. نە چووبومە سەر جادەی خێرا هەر لە کۆلانەکانی شارەکەی ماڵی کاك موستەفا بووم، سەیارەکەم هێواش کردەوە دەموچاوی باوکم بوو، لەخۆشیدا دابەزیم باوەشی پێدا بکەم. بەنەرویجی وتی ببورە من و تۆ یەکتری دەناسین؟

منیش بە کوردیەکەی خۆم وتم کاکە، من بە باوکم دەووت کاکە من ماکوانم ماکوان؟!

کابرا کە لە باوکم دەچوو بەنەرویجی وتی: من تێناگەم دەڵێی چی؟ چیت لەمن دەوێت؟

منیش بەزوویی دەستم کردەوە بە قسەکردن بەنەرویجی و وتم ببورە: وامزانی کەسێکی خۆمی هەڵە تیگەیشتوم، ئەوم جێهێشت بڕۆمەوە ناو سەیارەکەم

تەماشام کرد سەرێك لە پێشی سەیارەکەم دانیشتوە، بەپەلە ڕامکرد تەماشام کرد خاڵە حەزقیلە، لە خۆشیدا وتم حەزە گیان ماوی؟

خەریك بوو لە دەرگاکەی ئەوە سەرکەوم تا چوومە شوێنی خۆم و دانیشتم. وتم بێنە باماچت کەم ماڵتئاوا بێت ئەزانی چەندە پەرۆشت بووم؟

# شەڕ دەستی پێکرد

کەچوومەوە ناو سەیارەکەی خۆم و حەزقیلم بینی دانیشتبوو زۆر خۆشحاڵ بووم لە خۆشیاندا وتم حەزە گیان تۆ سەلامەتی؟ ماچێکم بەرێ.

حەزقیل: ماکوان دوو چاوت لەسەرە چاوی دەزگای هەواڵگری ئەوروپاو چاوی هەرچی خوانەناسی لای ئێمەیە! منیش دوو منداڵم دەستی بەسەردا گیراوە لەلایەن ئەو گروپەی کە پێشتر کارم بۆیان دەکرد، ناوی (زولازوولەلا)یە خوای گەورە پاداشتی شێخ وەجدی بداتەوە کە چەند هاوڕێیەکی ئێوەی ناردووە بۆلام و ئێستا لای ئەوان قوتابیم چەند منداڵێکی تریشم دەرباز بوون.

بۆ ئەوە هاتووم بە تۆ بڵێم بۆ ئەوەی هەڵنەخڵەتێیت، ئەویش ئەوەیە هەرکات منت بینی هاتم بۆلات ئەوا بۆ دڵنیایی خۆت ئایەتەلکورسی بخوێنە ئەگەر خۆم بووم ناڕۆم، چونکە ئەو گرێ و قوفڵە سوپاس بۆ خوا لەسەر من لاچووە، پێدەچێت لەسەر ئەو شێوەیەی من بەکارم هێناوە بۆ ناسینم بە تۆ ئەوان بەکاری بهێنن و هەڵتخڵەتێنن.

ماکوان: ئەی خوا پاداشتت باتەوە حەزقیل گیان، واتە ئێستا بە ئیسلام تۆ کۆدەکەت شکاندوە و ڕاناکەیت بە ئایەتەلکورسی، ئادەی بابیخوێنم وەڵڵا خوێندم تەماشا دەکەم لەجێگای خۆیەتی و مل بائەدات. وتم هەی هەزار جار سوپاس بۆ خوا.

حەزقیل: ماکوان گیان ڕاستت دەوێت من ناوم حەزقیل نیە، بەڵکو من ناوم (هوم)ە ئێستا شێخ وەجدی و هاوڕێکانی خۆم ناوەکەیان گۆڕیوم بە عبدالرحمان.

ماکوان: کەواتە خاڵە عەبدوڕەحمان ئێستا تۆ بوویت بە برای جنۆکەمان، باشە ئەم شێخ وەجدی یە کێیە؟

عەبدوڕەحمان: ئەمە مامۆستای شێخ داود محمد فرحان ە، ساحیرە گەورەکەی یەمەنە، ئەوەی کە تۆبەی کرد. عەلی یەمەنی ڕەفیقت باسەکەی بۆ باس کردبوویت. هەندێك هاوڕێی هەیە لە ئێمە ناردبووی بۆ هاوکاری من.

ماکوان: ئەی چۆن تۆیان دۆزییەوە؟

عەبدوڕەحمان: لەڕێگای جنۆکە موسڵمانەکانی نەرویج و بانگەوازی موسڵمانییەتی نێوان خۆمان، بۆ زانیاریت ئازاترین گەل و هۆز لە ناو ئێمەدا موسڵمانەکانن، چونکە هەموو شەیتانەکان لێیان دەترسن! سیستەمێکی جیاوازمان هەیە لەگەڵ ئێوەدا ئەوان هۆکارێکی باشن بۆ ترساندن و وەستاندی شەیتانەکان.

ماکوان: ڕاستەدەکەیت، ئەی من چیم پێدەکرێت تا لەخزمەتاندا بم عەبدوڕەحمانی برام؟

عەبدوڕەحمان: هاتووم ئیتر ماڵئاوایت لێبکەم، نامبینیتەوە نە لەدنیاو نەلە قیامەت.

ماکوان: بۆ لە قیامەت ئەی خوای گەورە دەمانخاتە بەهەشت، بۆ خۆ لەناو ناچیت؟

عەبدوڕەحمان: خوای گەورە لەم دونیا ئێوەی وا دروستکردووە کە ئێمەی جنۆکە نابینن، لەو دونیا واتا قیامەت پێچەوانە دەبێتەوە ئێوە ئێمە دەبینن بەس ئێمە ئێوە نابینین.

ماکوان: وەڵڵا ئەمە خۆشە، چۆن خوای گەورە کەرەمی کردووە تۆم دیوە هەر بە پشتیوانی خۆشی دیمەوە خزمەتت لەولاش خوای گەورە لە ئەهلی بەهەشت بمانگێڕێت و زۆر خۆشحاڵ بووم بەناسینت. لەوانەیە خۆت بزانیت من رۆژنامەنووسم حەزم دەکرد زانیاری زۆرم لێوەربگرتیتایە تا بۆ خەڵکم بڵاوبکردایەتەوە، هەرچۆن بێت زۆر خۆشحاڵ بووم کە جنۆکەیەکی برام هەیە و سڵاو خۆشەویستیم بگەیەنە بەجەماعەتی خۆتان. جاروبار سەرم لێبەن خۆشحاڵ دەبم بۆئەوەی هەست بە بوونتان بکەم، پاشان ئەی چی دەکەیت بەچی یەوە خەریك دەبیت کاک عەبدوڕەحمانی برام؟

عەبدوڕەحمان: ئەمەوێت ژیانێکی دیندارانە بەسەر بەرم و خەریکی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵ و ژیان و بژێویی تایبەتی خۆم دەبم.

ماکوان: ئەگەر کاسبییەکی باشت دەستکەوت بەیەکەوە بزنسێکی باش دەکەین، بە پێکەنینەوە.

عەبدوڕەحمان: من دەڕۆم ماکوان گیان سەیارەکە بوەستێنە، بیرم چوو پێت بڵێم ئەوکەسەی کە لە باوکت دەچوو هاوڕێیەکی خۆمانە! بۆ ئەوەی ڕاوەستیت وای کرد سڵاوی هەیە بۆت، بۆ زانیاریت حافز قورئانە.

ماکوان: بەسەرچاو ئێستا لە جێگایەکی شیاودا دەوەستم، زۆر خۆشحاڵ بووم عەبدوڕەحمان ی برام سەیارەم وەستان و دابەزین وتم ئەتوانین باوەشکەین بەیەکدا؟

عەبدوڕەحمان: بەڵێ ئاساییە، بەس ئەم پەیامەم بگەیەنە بە هاوڕێکانی خۆت، ئێوەی مرۆڤ بۆ ئێمە زۆر باشن، خاوەنی زانست و زانیاری زۆرن، زۆرێك لە ئێوە بە بێئەوەی بەخۆتان بزانن بەسەدان جنۆکە لە ئێمە موسڵمان دەکەن، لە قیامەتدا ئەجرو پاداشتەکەی دێتە سەر میزانی حەسەناتتان، ماکوانی برام ڕەزیل مەبن لە بانگەوازی ئیسلامی ئەوەی دەیزانن بیڵێن بەتەنهاش بووە بیڵێن، ئەگەر مرۆڤەکان لە خۆتان گوێی لێنەبوو ئەوا ئێمە گوێمان لێیە.

ماکوان: چۆن بە تەنهاش بووە قسە بکەین گوێتان لێیە؟

عەبدوڕەحمان: من یەکێك لە جنۆکەکانی نەرویج بۆی باس کردم، کە تۆ لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ کۆرێك کە چەند جارێك دووبارەت کردۆتەوە لەماڵی خۆتاندا، بەهۆکاری ئەوە موسڵمان بووە! بزانە چەندی تریش موسڵمان بووە کەتۆ هەر ئاگات لێی نییە، لە قیامەت بە چاکە بۆ تۆ دێت و دەچێتە سەر میزانی چاکەکانت.

ماکوان: الله اکبر، الله اکبر ئەوە نیعمەتە، بە ئاشکرا هەر خێرە، بە تاقیکردنەوەو وتارو پرۆڤەکردن هەر خێرە، جنۆکە موسڵمان دەبێت هەر خێرە الله اکبر.

عەبدوڕەحمان: ماکوان گیان خوات لەگەڵ السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە.

ماکوان: پەلە مەکە وعلیکم السلام ئەڵێی بەسەر ئاگرەوەیت، ئەتوانم هاوڕێکانت ببینم؟ حەز دەکەم تەعاروفێك بکەین لەگەڵیاندا.

عەبدوڕەحمان: ماکوان گیان زۆرن لێرەدا شیاو نیە.

ماکوان: ئەی کوێ شیاوە؟

عەبدوڕەحمان: بڕۆ بۆ دۆڵەکەی نێوانی - سارپرسبۆرگ و ئاشیم- لەوێ لای چەمەکە ڕاوەستە، سەیارەکەت بەرە خوارەوە بۆلای چەمەکە ڕاگرە. ئەزانی مەبەستم کوێیە؟

ماکوان: نەوەڵڵا نازانم مەبەستت کوێیە.

سەرکەوە لەگەڵم پێم بڵێ بەیەکەوە دەچین.

ڕۆشتین تا گەیشتینە ئەو جێگایە، چوومە خوارەوە بۆ لای ئاوەکەو کەناری ئەو چەمە گەورەیە.

هەرکە دابەزیم عەبدوڕەحمان وتی تەماشای چیاو دۆڵەکە بکە و سەرنجی کەنار ئاوەکە بدە بەجوانی.

سبحان الله ئەوەی من دیم سوپایەك بوو، دەهاتن و دەچوون، فریای دەست بەرزکردنەوە نەکەوتم بۆ سڵاوکردن، هەرئەوەندە وتم السلام علیکم ئەو دۆڵە پڕبوو لەوەڵامی وعلیکم السلامٰ ورحمة الله برکاته، ئەو کەسەم بینی کە لەباوکی خۆم دەچوو، بە عەبدوڕەحمانم وت پێی بڵێ بێت بۆلام دڵم پێی دەکرێتەوە.

عەبدوڕەحمان بانگی کرد، تا هاتە لام شتێکی زۆر عەجیبی پێ وتم.

عبدالرحمان: دەجال کوڕی شەیتانە بەردەوام زیندووە و ماوە، کاتێك مردوو زیندوو دەکاتەوە مردووەکان نین، بەڵکو جنۆکەکانن وەك ئەم کەسە لەسەر شێوەی باوکی تۆیە، کە بەئەصڵ خەڵکی هیندستانە! ئەمانەی دەیبینی هەموو موسڵمان و پیاو چاکن. جنۆکەکەی کە لەباوکم دەچوو هاتە لام و سڵاوی کرد دڵم پڕ بوبوو لەگریان.

دەستم کرد بەگریان فرمێسك بە چاوما دەهاتە خوارەوە هاوارمکرد پڕ بەدەنگم بابە گیان!

لەتاو گریانەکەم سەرم داخست و چاوم گرتوو دەگریام، سەرم بەرزکردەوە کەس لەدەورم نەمابوو. ئای ئەوەندەی تر خەفەتم خوارد، بیرم نەبوو پرسیاری سەسیل بکەم ئەو هیچو پوچە چی لێهاتوە بەتەمای چین لەگەڵمدا؟

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە ئەوەندە گریام لەناو سەیارەکەمدا چاوم ئاوسابوو، خێزانم وتی ئەوە بۆ چاوت ئاوساوە، منیش پێم وت کە لەحیمم کردووە.

ماوەیەك زۆر ژیانم ئاسایی بوبوویەوە، ئێوارەیەکی درەنگ تەلەفونیان بۆ کردم وتیان ماکوان باپیرت وەفاتی کردووە، زۆر بێتاقەت بووم هەڵسام هاتمە دەرەوە لەماڵ دەستم کرد بە پیاسە بەناو شاردا، پیاسەم دەکرد لەناو پارکێکی گەورەدا دەمویست لە پارکینگی سەیارەکانەوە بگەڕێمەوە بەرەو ماڵەوە و قەد بڕی بکەم.

لەپڕ دووسەیارە و ٥ بۆ ٦ ماتۆڕ سوار بە پێكەنینەوە خۆیان كرد بە پاركەكدا و لەدەوری مندا وەستان وەك دیوار دروستیان كرد لە روومدا، لەپشتیشمەوە هەردوو سەیارەكە وەستان، ڕێگەیان بەمن گرت منیش سەرەتا هیچم نەووت ویستم ڕێگاكەم بگۆڕم، بەڵام دیار بوو دوانیان بەرەو ڕووم هاتن هەموو گیانیان وەك دەفتەر رەسم تاتۆ بوو.

خێرا دەستم دایە قایشی پانتۆڵەكەم و سەرەكەی ئاسن بوو كردمەوە و یەكێكیان هاتە پێشەوە یەك قایشم لێدا هاواری لێ هەڵسا، ئەوی تریان ڕایكردە دواوە چوو لە ناو ماتۆڕەكەیدا تێلایەكی هێنا، چواری تر لەناو سەیارەكەدا دابەزین. منیش ئەوەندەم بۆ كرا تەلەفون دەربینم تا تەلەفون بۆ پۆلیس بكەم.

خەریكی ئەوە بووم ژمارەی پۆلیس لێبدەم، بەڵام ئەو سەگبابەی كە قایشەكەم لێدابوو كەوتبوو قاچی گرتم دامی بەزەویەكەدا، بەخوا قایشێكی ترم تێسرەواند ئەوەندەی تر وێرانم كرد، بەڵام تەلەفونەكەم لەدەست پەڕی، ئەی خوا هەرچی تەماشا دەكەم مەجالی ڕاكردنم نیە، تەنیشتیشم بە تەلبەند گیراوە، لەسەرخۆ نزیكی دوو ماتۆڕ بەدەستیان بوومەوە لەسەر ماتۆڕەكانیان دانەبەزین.

وتم بەسەر ئەواندا باز ئەدەم و ڕادەكەم. قایشەكەم هەڵسوڕاند و ئاڕاستەی ڕۆشتنەكەم گۆڕی بۆ ئەوەی سەریان لێ تێك بدەم، نزیكیان بوومەوە ویستم خۆم هەڵدەم بەسەریاندا هیچ نەجوڵان. سپرایەكی دەرهێنا ڕووەو دەموچاوم پژاندی، قاچم قورس بوو، ئاگام لێبوو بەقایشەكەی خۆم قاچیان بەستم و دووشەقیان تێهەڵدام هیچ هەستم

بەئازار نەکردو خپ بووم، هەستم دەکرد وەك خەونێك کە خستمیانە پشتی سەیارەك، چەندێك بێ هۆش بووم نازانم؟

چاوم کردەوە سەرم زۆر قورس بوو ئەوەندە دەیەشا چاوم بۆ هەڵنەدەهات بە قایشەکەی خۆم قاچم بەسترابوو، دەستیشم بە زنجیرو قوفڵ لە شوقەیەکی سارد و چۆڵدا، قوفڵەکە بە کۆد داخرابوو.

تەنها کورسییەک و چەند وێنەیەك و ڕاخەرێک و جێگایەکی خەوی تێدا بوو. کوێ بوو نازانم؟ خوێن بە لووتما دێتە خوارەوە و سەرم ئازاری زۆرە هەست دەکەم لە دوولاوە شکاوە.

پەردەکان دادرابوونەوە، نازانم کات کەیە؟ نازانم بۆچی گیراوم؟ زۆر ماندوبووم، دیسانەوە بێهۆش بوومەوە، کە هۆشم هاتەوە دوو کوڕە فارسەکە لە ژورەکەمدا بوون، ئەوانەی کە پێشتر لەگەڵیاندا بەشەڕهاتبووم لەگەڵ هێرۆدا بوون.

یەکێکیان وتی: ماکوان ئەبینیت چۆن زەلیلی لەبەردەستمدا! ئێستا وەك سەگ قوروسکەت لێ هەڵدەستێنم.

حەشیشیان دەکێشا ئەوەیان کە لێمدابوو هات بە ئارەزووی دڵی خۆی یەك زللەی لێدام! دیسان خوێنی لووتم بەربوویەوە من هیچ دەسەڵاتم نیە ئەسیرم و ناشزانم لە کوێم نەموویست هاوار بکەم، چونکە زۆر توانای هاوارم نەبوو، وەك بەنج کرابێتم وابوو.

چارە نەما لەپڕ لەدەرگا درا کەسێکی نەرویجی هاتە ژوورەوە تەمەنی لە ٤٠ کاندا دەبوو کوڕە فارسەکان بە ئەدەبەوە وەستان، وتیان: ئەوە ماکوانە.

کابرای نەرویجی: ئەوە لێتان داوە؟

فارسەکان: بەڵێ، قسەی پێ وتوین.

تورە بوو لێیان دەریکردنە دەرەوە، کلێنسی هێنا خۆی بۆی پاکردمەوە و وتی ئاو دەخۆیتەوە؟

وتم دەخۆمەوە، بەڵام زۆریان لێداوم پێویستم بە ئازار شکێنە، چەند رۆژە لای ئێوەم؟ زۆرم برسییە.

کابرای نەرویجی: ئێستا نانت بۆ دێنم و ئازار شکێنیشت بۆ دێنم، بەڵام ئاقڵ بە و هاوکاریم بکە با لەوە زیاتر ئازاری تۆش نەدەن و ئازاری ئێمەش مەدە.

ماکوان: چیت دەوێت؟ پەیامەکەت چییە؟

کابرای نەرویجی: تەنها گوێڕایەڵیمان بکە؟ باشە؟

ماکوان: بۆچی لەسەر چی گوێرایەڵیتان بکەم؟

کابرای نەرویجی: کە سەرۆکەکەم هات بۆت ڕوون دەکاتەوە.

کەمێکی پێچوو، ئەو کەسەی کە بە قایشەکەِ لێمدابوو، هاتە ژوورەوە و عەلاگەیەك خواردنی بەدەستەوە بوو، بەدوایدا پیاوێکی ورگ زل خۆی کرد بە ژووردا یەك دوو پاسەوانی لەگەڵ بوو، دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ کەسەکەی تریان کە پێشتر قسەی لەگەڵ کردم، پێی وت ئەمە ماکوانە؟

پیاوە ورگ زلەکە: ئەمە بەکەڵکی ئێمە نایەت، سەر و چاوی دیارە درۆمان لەگەڵدا دەکات و هیلاکمان دەکات، من دەڕۆم کاتێکی خۆش.

قسەکانی زۆر کورت بوو ڕۆیشت و نانیان بۆ هێنام و لەگەڵ ئازارشکێن دەستیشم بە قوفڵ بەزنجیرەوە بەستراوە هیچ نایکاتەوە، لەبەر دەمم دایناو رۆشتن.

ماکوان: بەچی بیخۆم؟

کابرای نەرویجی: بەتەنها لێرەم با یەك دوو کەسی تر بێنم دەستت بۆ دەکەمەوە.

ڕۆشت و کابرای کە لێدانی قایشی خواردبوو و دوو فارسەکەی هێنا، دەزانم هەموو داخ لەدڵن،ئەگەر دەست بوەشێنم لەوانەیە بمکوژن.

بیریشم لەوە دەکردەوە هەرچۆن بێت یەکێکیان بخنکێنم چش لەوەی خۆشم دەکوژرێم، گرنگ ئەوەیە سەربەسەر دەرچم. کە کردیانمەوە تەنها دەستێکیان کردمەوە.

نانم خوارد و ئاوم خوارد لەگەڵ ئازارشکێنەکە باشتر بووم کەمێك هاتمەوە سەر خۆم، دوای تەواو بوونم دەستیان بەستمەوە.

ئینجا بە فارسی دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ ئەوەی کە لێم نەدابوو، بانگم کرد ئاغا همشری، من فارسم نەدیوە ئەوەندە نامەرد بێت؟ وەرە بزانم بۆ وا لەمن دەکەن ؟

کوڕە فارسەکە: هیچ قسە مەکە، دەنا دەمت بە تێپ دەبەستم، دەمت داخە.

ماکوان: من بزانم فارس خاوەنی شەهامەتن کەی دەمی کەسێك دەبەستن ئەسیر بێتو دەستی بەسترا بێت و خەڵکی یەك وڵات بن.

کوڕە فارسەکە: تۆ ئێرانیت؟

ماکوان: ئەی چۆن، خەڵکی سنەم و باوک و باپیرم گەڵباخییە لە بنەماڵەی مەردوخی سنەیم.

کوڕە فارسەکە: ئەی بۆ هێرۆ وتی تۆ عێراقیت؟

ماکوان: عێراقیت بینیوە بە فارسی قسە بکات؟ من هاوشاری خۆتم ئێوە چۆن وادەکەن لە من.

لەم قسانەدا بووین جەماعەتێکی تر خۆیان کرد بە ژووردا و لەناو جانتایەکدا وا هەستم کرد هێرۆین و ئەو شتانەی تێدابوو دایانە دەست فارسەکان و ناردیانە دەرەوە. نەرویجیەك هاتە لای من وتی جگەرە ناکێشیت بۆت داگیرسێنم؟

ماکوان: با بەڵام بەدەستی خۆم تامی هەیە بیکێشم.

کابرا: ئاخر ناتوانم بتکەمەوە تۆ ترسناکیت.

ماکوان: هەرگیز بینیوتە پیاو لە پیاو بترسێت؟

کابرا: تۆ بەقایشیك منیش کوێر دەکەیت، ئەوە هەموو چەند رۆژێکە کچێکم دەست کەوتوە لە دیسکۆ ناشیرینم مەکە با لەدەستم دەرنەچێت!
بەپێکەنینەوە چوونەوە دەرەوە شەو خەوتم لەسەر کورسییەکە و نوێژکانم هەر لەسەر کورسییەکە دەکرد، بەداخەوە میزیشم هەر لەسەر ئەو کورسیە دەکرد چارەم نەبوو.

شەو بە خەیاڵی خۆم هەڵسام بۆ نوێژی بەیانی عەبدوڕەحمان (حەزقیل) و ئەو جنۆکەی لە باوکم دەچوون هاتنە لام و بەدەورمەوە تەماشایان دەکردم ئایەتەلکورسیم خوێند.

عبدالرحمان: هەست ناکەیت ماکوان ئێمە بۆ ئێستا باشین؟

ماکوان: ڕاست بڵێن لەکام تەرەفەن، لەگەڵ منن یان ئەولان؟

عەبدالرحمان دەستی کرد بە پێکەنین.

# کاتی تۆڵە سەندنەوەیە

لەدوای ئەوەی کە هەستام بۆ نوێژی بەیانی عبدالرحمان و جنۆکەکەی کەلە باوکم دەچوو هاتنە لام و پرسیاری ئەوەم لێکردن کە لەکام تەرەفن، عبدالرحمان دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: بێگومان تەرەفی ئیمانداران، لە خۆشیدا دەستم کرد بەپێکەنین، ئەوانیش بە هەردووکیان کۆدی قفڵەکەیان کردەوە ئازاد بووم کاتژمێر ٥ ی بەیانییە عبدالرحمان و هاورێکەی وتیان ئێمە دەڕۆین، دڵنیابە دەرەوە کەسی لێنیە، بە هێمنی خۆت بڕۆ.

ماکوان: ناوی شارەکە کوێیە؟

عبدالرحمان: بڕۆ دەرەوە لە ئەدەرەسی ماڵەکان دەیبینی شار نیە لادێیەکە! بەلای چەپدا بڕۆ دەچیتە سەر جادەی ١١٠ لەوێوە دەگەیتە ماڵەکانی شاری ڕۆدە.

کەوای وت زانیم نزیکی شارەکەی خۆمم هەموو ١٥ خولەک دوورم بەسەیارە، سەرەتا چوومە چێشتخانەی شوقەکە و دوو چەقۆی لێبوو هەردووکیم هەڵگرتوو دەرچوومە دەرەوە ژمارە و ئەدەرسی ماڵەکەم هەمووی لەبەر کرد و لەڕێگادا نوێژەکانم کرد، هەروەك عبدالرحمان وتی بەلای چەپدا ڕۆیشتم و چوومە سەر جادەی ١١٠ بۆ کاتژمێر ٩ بەیانی گەیشتمەوە ماڵی خۆمان لە خێزانم پرسی چەند رۆژە دیار نیم؟

خێزانم: ٣ ڕۆژە نازانین لەکوێیت خەڵك باوکی دەمرێت ئاوا ناکات، تۆ چوویت بۆ کوێ.

ئەوەی تۆ بناسێت تەلەفونم بۆ کردووە کەس نەیزانیوە لەکوێیت. تا ناچار ئەمڕۆ پۆلیسم ئاگادارکردۆتەوە، سەر و چاوت بۆ وای لێهاتووە؟ چی بووە؟ شەڕت کردووە؟

ماکوان: خێرا پۆلیس ئاگادار بکەرەوە و بڵێ هاتۆتەوە تەنها لای هاوڕێکانی بووە باپیری مردووە باری دەروونی باش نەبووە ئێستا لەماڵەوەیە و هیچ کێشەی نیە، دوای هەموویت بۆ باس دەکەم. جارێ وەرە ئەو برینانەم بۆ سارێژ بکە بابچم حەمامێك بکەم.

خێزانم برینەکانی بۆ شۆردم و بۆی پێچام، دوای خۆشۆردن چوومە ناو جێگا چەند کاتژمێرێك خەوم لێکەوت، کە لەخەو هەڵسام خەریك بوو دڵم ئەتەقی نەمدەزانی چی بکەم.

ماڵو منداڵم پێچایەوە بۆ ماڵی خەزوورم، ئینجا گەڕام بەدوای هاوڕێ کۆنەکانمدا کە پێشتر یەکترمان ناسیبوو و لەکەمپدا بەیەکەوە بووین. لەوانە سەردارو ڕێبوار دوو هاوڕێی کۆنم بوون لەساڵی ١٩٩٨ بەیەکەوە بووین لە هەموو ڕێگاکانی قاچاخیدا، هەردووکیان خەڵکی کەلاربوون. دەمزانی سڵیان لە هیچ نەدەکردەوە.! بانگم کردن دوای چۆنی و چاکی، هێشتا هیچم نەوتبوو.

سەردار: بەخوا ٣ ساڵە شەڕم نەکردووە، گیانم داوای شەڕ دەکات کێ وای لێکردووی بابچینە سەری.

ئەوی تریش هەڵوێستی مەردانە تر بوو وتی: ئەوە کێ وای لێکردوویت؟ من تۆ بناسم چەقۆیەکت بەنێ دەرەقەتی دە کەس دێیت. ئەوە یەك کەس و دووکەس نەبوون شەڕیان لەگەڵکردوویت. قسە بکە ماکوان کێ بوون؟

باسەکەم بۆ کردن ئاگام لەسەردار بوو وا تورە بوبوو لێوی خۆی دەگەزی، ئەوەشم پێووتن کە ئێستا ئێمە هەموو ماڵو منداڵمان هەیە، لەوانەیە خوانەخواستە شتێکمان لێبێت، بەڵام لە ئێستاوە بڕیار مەدەن ئەگەر هاوکاری من دەکەن، من مردم ئاگاتان لەماڵ و منداڵم بێت و ئێوەش شتێکتان لێهات ماڵ و منداڵتان وەك ئەوانەی خۆمن بگرە باشتریش دەیانپارێزم!

ڕێبوار: باسی شتی وا هەر مەکە، دەڕۆین و ئەژدایان دەسوتینین و دێینەوە بە پشتیوانی خوا.

پاشان عەرزم کردن دووکەسی تریشمان دەوێت، ناوی چەند کەسێکیان پێووتم خۆشم دەمناسین ڕەفیقم بوون بەدڵم نەبوون ئازابوون، بەڵام بۆ کاتی خۆی ١٧ ساڵ پێش ئێستا ئازا بوون، پێدەچوو گۆڕابن.

یەك کەسم شك دەبرد هەڵەبجەیی سەرحەدی ناوبوو، نەوڕۆڵی بوو لەزیندان یەکترمان ناسیبوو لە تورکیا کاتی خۆی، واتا ١٧ ساڵ بەر لە ئێستا لە نەرویجیش یەکترمان بینییەوە.

هەر ڕێزو خۆشەویستمان بۆ یەکتر هەبوو کەسێکی عەشایەر بوو، منیش بەسروشتی خۆم عەشایەرم، لەگەڵ خەڵکی عەشایەردا نەبێت کەم ڕەفیقایەتی دەکەم، لەبەر ئەوەی خەڵکی عەشایەر خیانەت کەمتر دەکەن لە هاوڕێیەتی بە هۆکاری بنەماڵەو عەشرەتەکەی و پەروەردی

خانەوادەکەی کە عەشایەرە، مەرجیش نیە هەموو عەشایەرێك وابێت، بەڵام من بۆ خۆم ئەو تایبەتمەندییەم هەیە.

چوومە لای و باسەکەم بۆ کرد خێرا ئەو دەستی کرد بە پلان دانان، ئەو پلانی دادەنا هەستم دەکرد من بۆ کاری ئەو دەچم.

ماکوان: کێی ترمان هەیە خۆت ئاسایی؟

سەرحەد: عەبە هەولێری خۆمان، نایناسیت؟

ماکوان: نەوەڵلا!

ئەو شەوەی کە لە تورکیا پارەمان پێنەبوو لە زیندان ڕامانکرد لە یابانچی شوعبە بردینیە لای خۆی و ٢ملیۆن لیرەی داینێ هاتین بۆ بیوك چەکمەچە، بیرم کەوتوە باسی کێ دەکات، بەڵام نەمزانیبوو لە نەرویجە.

ماکوان: بەڕاست! لێرەیە؟

سەرحەد: بەڵێ، لێرەیەو دوکانی پیتزای هەیە.

سەرحەد تەلەفونی بۆ کرد، دوای ماوەیەکی کورت هات سڵاومان کرد.

سەرحەد: عەبدوڵلا ئەم کوڕە دەناسیت؟

عەبدوڵلا: ئەوە سورەی خۆمانە! ئەی چۆن نایناسم، لەپاڵتاکیش قسەی زۆری پێ وتوم. پێم وتوە من کێم هەر وتویەتی ناتناسم.

لەڕاستیدا من ئەم ناسی بوو كە عەبدوڵڵا هەولێرییە، ناوەكەی زۆر بێ مەعنابوو لە پاڵتاڵک خۆی ناونابوو -مەی خۆر- دەهات باسی ئیسلامەتیشی لەمن دەپرسی! عەبدوڵڵا پارتییەكی تۆخ بوو!

ماكوان: كاك عەبدوڵڵا ئێ ناحەقم مەگەر وەڵامم نەئەدایتەوە وامدەزانی جەماعەتی ژوری شەڕە جنێوەكەی.

عەبدوڵڵا: گوێی مەدەرێ كاك ماكوان گیان، مادام تۆ بەمەلا موستەفا دەڵێیت: خوالێی خۆشبێت چاومانی.

جارێك هەندێك بێ ئەدەب قسەیان بە مەلا موستەفا دەووت تۆ دیفاعت كرد لەو كاتەوە من خۆڵی بەرپێی تۆم ڕۆحی ڕۆح.

ماكوان: عەبدوڵڵا گیان تەنها لەبەر ئەوەی دیفاعم لەمەلا موستەفا كردووە تۆ منت خۆش دەوێت؟ ئاخر خۆ من لەبەر تۆ نەمكردووە، یان لەبەر پارتی نەمكردووە. ئەو پیاوە كەسایەتییەكی كوردە و مافی لەسەر هەموومانە كە ڕێزی بگرین، مەرج نیە پارتی بیت دەبێت حووڕمەتی بارزانی بگیرێت، چونكە سەركردەیەكە و مردووە. بەهەڵەو چاكەیەوە جێگای شانازیمانە وەك كورد، بەڵام من پارتی نیم و لەبەر پارتی دیفاعم نەكردووە.

عەبدوڵڵا: ئەدی دەزانم، ئەمن هەر كەس مەلا موستەفای خۆش بوویت خۆشم دەوێت.

ماكوان: تەماشای سەرحەد-م كرد پێم وت بەخوا بەكەڵك نایەت.

سەرحەد: لێی مەترسە لە سەر من.

عەبدوڵڵا: چی بووە؟ پێم بڵێن.

سەرحەد بۆی باسکرد.

عەبدوڵڵا: تو خوا کاک ماکوان من بەکەڵك نایەم وەڵڵاهی عەیبە وا دەڵێیت، من لەخزمەتام برام.

ماکوان: زۆر سوپاسم کردن و پێمووتن کات دیاری دەکەین، بەڵام زۆرم بەلاوە سەیر بوو سەرحەد کۆنە یەکێتی و ئەمیش پارتی، نازانم چۆن ئەوەندە ڕەفیقایەتییان خۆش بوو! دوای بۆم دەرکەوت شەریک بوون.

پاشان چووم بۆ ماڵی کاك موستەفا، هەموو باسەکەم بۆ گێڕایەوە و باسی ئەوەم کرد کە نیازم هەیە کارێك بکەم زۆر ترسناکە، داوام لێکرد هاوکاریم بکات. هەرچۆنێک بووە هێرۆ دەڕفێنم، با سەیران خانیش ئاگاداربێت. هۆکاری ڕفاندنەکەشی ئەوەیە کە ئەو کچە زانیاری لایەو تەنها ئەوە زانیاریم بداتێ.

من ئەو کەسانە هیچیان ناناسم، سەرەداوی من تەنها هێرۆیە بۆ دۆزینەوەی فارسەکان و نەرویجەکانیش! زیاتر بە شەرحەوە بۆم باسکرد.

کاك موستەفا: من لەگەڵتم، بەڵام با سەیران نەزانێت تەحەمولی ئەو قسە ناکات.

ماکوان: پێم باشە بزانێت و ئاگادار بێت، چونکە سبەینێ خۆی دەبێتە شاهید لەسەری.

موستەفا: چیت پێ باشە بیکە لەگەڵتم. خێرا چوو ٣٠ هەزار کرۆنی بۆ هێنام و وتی با ئەوەت پێبێت تۆ ئیشت نیە، ئێستا دەزانم پێویستت بەپارەیە.

لەڕاستیدا زۆر پێویستم بە پارەبوو، تۆزێك خۆم باداو وتم نامەوێت شکور بۆ خوا هەیە، بەڵام بەزۆر دای بەسەرمدا.

سەیران خانم بانگ کرد و زۆر بە کەساسی باسەکەم بۆکردو ترسناکی کارەکەم تێگەیاند.

دڵم ئەلەرزی لەوەی تورە بێت و لێم قبوڵ نەکات، کەچی هەڵوێستی لە کاك موستەفا باشتر بوو و وتی خۆم بانگی دەکەم و بیرفێنە.

لەشارەکەی خۆمان تەکیەیەکی سۆفی تورکەکانی لێبوو، یەکێك لە سۆفییەکانم دەناسی خەلیفەی تەکیەکە بوو، چووم بۆلای.

ماکوان: دوو کوڕی ئازام پێویستە سایەقی باش بکەن و بەهێز بن خاوەنی هێز و عەزەڵات بن، چونکە لەو کارانەدا تورك باشترن، متمانەم بە عەرەب نەبوو هەرچەندە زۆریش بوون، بەڵام تورکەکان نهێنی پارێزن و وەفاشیان باشترە تا عەرەب.

٧ تەلەفونی چاکم پەیداکرد کۆنفرانسی سکایپم تێدا دامەزراند و هەموو کارە تەکنیکییەکانم چاك کردو ئامادەم کرد بۆ ڕۆژی دیاریکراو.

لەگەڵ موستەفا و سەیران دا كات و پلانم دانا بۆ ڕفاندنی هێرۆ، ناوی ئەو جێگایەم پێووتن كەدەیبەم.ماڵی كوڕێكی هاوڕێم بوو چوو بووەوە بۆ كوردستان.

ماكوان: وەرن دانیشن خۆشتان گوێبگرن، هەمووشی تۆمار دەكەم بەڤیدۆو دەنگیش ڕازی بوون. ئەوان پێشوەخت چوون بۆ ئەو جێگایە، هەر لە شارەكەی خۆمان بوو.

من و ئایدن و سولێمان واتا دوو توركەكە چووین هێرۆمان هێنا و خستمەنا ناو ڤانێك و گەیشتینە جێگای مەبەست.

چۆنیەتی هێنانەكەی ئاسان بوو هێرۆ خۆی سەیارەی پێبوو، سەیران خان داوای لێكردبوو بچێتە لای دەواجنێك گوایە هێلكە دەكڕێت تا بێت بەشوێنیدا بیباتەوە، ئەو ناوەش چۆڵە، ئێمەش لەو ناوەدا بووین ئەو دوو كوڕە توركەی لەگەڵ من بوون چوونە نزیكی و گرتیان و خێرا فڕێیان دایە ناو سەیارەكە و هێنایان و منیش لەناو ڤانەكەدا بووم بۆ ئەوەی نەترسێت.

ماكوان: هێرۆ ئارام بەو ئاقڵ بە، خێرا تەلەفونەكەم لێسەندو بە هەڕەشەوە پێمووت: با وەك سەگ نەتتۆپێنم تەنها دەمەویت قسەت لەگەڵ بكەم.

پاشان سویچی سەیارەكەم لێسەندو دامە دەستی ئایدن كە سیارەكەی بێنێت بە شوێنماندا لەڤانەكەدا دامنیشاند.

هێرۆ: بۆ كوێ دەچین؟

ماکوان: بۆ ماڵی سەیران خانی پورت عەلاگەیەکم کرد بەسەریدا ڕفاندمە ژوورەوە دامنیشاند.

هێرۆ: ئەوە کەی ماڵی سەیرانە؟

ماکوان: با ئەوە ئێستا سەیران دێتە ئێرە، یەکەم پرسیار لێمکرد وتم ئەو دوو فارسە ماڵیان لەکوێدایە؟ من تەنها ئەوەم ئەوێت لەتۆ.

ئەوەشی بەسەرم هاتووە بۆم گێڕایەوە کە لەسەر تۆ بووە، تا تۆڵەی خۆم لەوان نەکەمەوە ناهێڵم بڕۆیتە دەرەوە، بۆ زانیاریت کارەکەشم سەربەخۆ نەکردووە ئەوە کاک موستەفا و پورت لێرەن.

هاتنە لامان هەڵبەت دوای ئەوەی ئەدرەسی کوڕە فارسەکانم وەرگرت و دڵنیا بووم ڕاست دەکات، لە ئینتەرنێت ئەدرەسەکەم لێدا ناوی هەردوو کوڕەکە هاتە سەری ناویان بابەك و فەرهاد بوو. ئینجا سەیران خان قسەی زۆری وت بە هێرۆ خەریك بوو پەلاماری بدات، نەمهێشت بە سەیران خان و کاك موستەفام وت بەهیچ شێوەیەك تەلەفونی نەدەنە دەست و ئاگاتان لێی بێت ڕانەکات، چونکە گیانی ئێمە دەکەوێتە ژێر دەستی ئەو بێڕەوشتانەو دەمانکوژن.

بە ئایدن و سولەیمان-م وت کارم بەئێوە نەماوە بڕۆن، تا کاتێکی تر یەکتر دەبینینەوە.

لەماڵی موستەفا پلانم دانا لەگەڵ عەبدوڵڵا، سەرحەد، سەردار و ڕێبوار کە عەبدوڵڵا بەبیانووی ئەوەی کە دەیەوێت ماددەی هۆشبەر بکڕێت لە

دەرگا ئەدات کە دەرگاکە کرایەوە، ئەو کات هەر چوارمان خۆمان دەکەین بە ژوورا.

زۆر لە پۆلیس نەدەترساین، چونکە دەمانزانی ئەوانە هەرگیز پەیوەندی بە پۆلیس ناکەن خۆیان پاشەڵ پیسن عەبدوڵڵا خۆی کرد بە تلیاکی و موعتاد، باشی لێدەزانی دای لەدەرگاکە وتی: ئەدرەسی ئێوەیان داومەتی من خەڵکی ئەفغانستانم پێویستم بە هێزە یاخود ئێنەرجی، ئەوانەی دەرمان بەکار دێنن پێی دەڵێن ئێنەرجی، ١٠٠٠ کرۆنی گرت بەدەستییەوە بۆ ئەوەی نەڵێن پارەی پێ نییە تەماع بیانگرێت. وتی ئینەرجیم پێویستە هاورێیەکی خۆتان ناردوومی. لەم قسانەدا بوو عەبدوڵڵا بەو بچوکییەی خۆی قژی گرت و لەدەرگاکە هێنایە دەرەوە، هەر ئەوەندەم زانی سەردار باوەشی پیاکرد و خۆی و عەبدوڵڵا چوونە ژورەوە دەرگایان داخست. ٢ خولەکی نەبرد عەبدوڵڵا وتی وەرن ڕاکەن! هەموو خۆمانکرد بە ژوورا تەنها خۆی لەماڵ بوو. لێم پرسی کوا ڕەفیقەکەی ترت؟ وتی: لەدەرەوەیە.

عەبدوڵڵا خێرا پانتۆڵەکەی لەپێ داکەند و ڕووتی کردەوە جلی لەبەردا نەهێشت تەنها دەرپێ کورتێك نەبێت.

ماکوان: عەبدوڵڵا بۆ وادەکەیت؟ ئەوە جائیز نیە.

عەبدوڵڵا: خۆ گەورە کچ نیە، هەتیمی وا با ئاگامان لێی بێت، برام نەوەکو بە دزیەوە تەلەفون بکات یان نەوەکو چەقۆیەك بشارێتەوە. ئێمە ناوماڵەکەی شارەزانین.

ڕێبوار هەرچی چەقۆ بوو لەماڵەکەدا خستیە تەنەکەی خۆڵەکە و لای چێشتخانەکە وەستا. سەرحەد پاڵی خست و چووە سەر پشتی دانیشت، سەرداریش لە دەرگاکە حەرەس بوو.

منیش دەستم کرد بەقسەکردن لەگەڵی، ناوی بابەك بوو. وتم بابەك من وەك تۆ نامەرد نیم یەك زلەت لێ داوم لێت نادەمەوە بە مەرجێك ڕاستم پێ بڵێیت ئەوانەی منیان گرت کێ بوون و چیان دەویست لەمن؟

ئینجا بزانم فەرهادی هاوڕێت لەکوێیەو کەی دێتەوە؟ ئاقڵ بە با عەزێتت نەدەم ئەمڕۆ هیچ کەس ناتوانێت لەژێر دەستی ئێمە ڕزگارت بکات.

دەستی کرد بەگریان!

عەبدوڵڵا لێی نزیك بوویەوە هەتا هێزی تیابوو پیاکێشا، گۆرەوییەکانی خۆی خنی بەدەمیدا وتی گوێم لەدەنگت نەبێت.

وەڵا چرکەی نەما.

سەردار: ماکوان گەنجێك بۆ ئەم ماڵە دێت، وەرە بزانە کەسی مەبەستە.

ماکوان: سەیرم کرد و بە سەردارم وت خۆیەتی و لەهەمان کاتیشدا دوورم خستەوە لەدەرگاکەو خۆم دەرگاکەم کردەوە بەهێواشی بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ خۆی بێتە ژوورەوە، ئەوەی دامنابوو سوپاس بۆ خوا روویدا.

دەرگاکەی کردەوە بە دەنگی بەرز وتی بابەك چۆن دەرگا بە کراوەیی بەجێ دێڵی؟

قسەکەی تەواو نەکرد ملیم گرت و دام بە زەویەکەدا سەردار چووە سەری، نازانم عەبدوڵڵا لە کوێ قەیتانی پێڵاوی ئامادەکرد بوو خستیە ملی و بەقەیتانەکە هەڵیساندەوە، منیش هەر دەمووت خەفەشو، خەفەشو بۆ ئەوەی دەنگی لێوە نەیەت.

عەبدوڵڵا خێرا ئەوی ڕووت کردەوە بابەکی هەڵساند لەژێر سەرحەدا و فەرهادی پاڵ خست و وتی بابەك بچۆ سەر سکی دانیشە، هەردووکیانی پێکەوە قفڵکرد بوو زوو زووش قاچێکی دەکێشا بە سەری فەرهاد دا، کە لەڕاستیدا پێم ناخۆش بوو وای لێدەکرد، پێم وت کاکە وای لێمەکە ئاخر ئەوە دەسەڵاتی نیە، تەواو بەسە. سەردار چەقۆیەکی دەرهێناو وتی ماکوان پێیان بڵێ ماڵەکەتان پڕیەتی لە هێرۆینو کۆکاینو حەشیش بگەڕێین هەمووی ئەدۆزینەوە، ئێمە پارەمان ناوێت، بەس پێمان بڵێن کە بۆچی ماکوان-تان گرتوە؟

فەرهاد: ئاغا ماکوان، من قسە دەکەم بەس با بابەك هەڵسێت لەسەر سکم.

ماکوان: باشە

فەرهاد: ئەوەی ڕوویداوە هیچ پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، هێرۆ باسی تۆی بۆ ئەندریاس کردووە.

ماکوان: ئەندریاس کێیە؟

فەرهاد: سەرۆکی ئەو باندەیە کە ئێمە کاری تێدا دەکەین، ئێستا هێرۆ لەگەڵ ئەودایە.

ماكوان: واتا بەیەكیشەوە دەخەون؟

فەرهاد: بەڵێ وەك ژنی وایە، هەمیشە بە یەكەوەن. هێرۆی فێری دەرمان كردووە.

چپاندم بەگوێ عەبدوڵلا و سەردار دا وتم بڕۆن ماڵەكە جوان بگەڕێن بزانن هیچ دەرمانێك ئەدۆزنەوە، ڕۆشتن دوای گەڕانی زۆر لەپشتی بۆیلەرەكەیاندا جانتایەكیان دەرهێنا پڕبوو لە دەرمان.

بابەك: ئاغا ئەگەر ئەوە بەرن جەماعەتی ئەندریاس ئێمە دەكوژن.

ماكوان: باشە نایبەین، بەمەرجێك یارمەتیم بدەن، چونكە دەمەوێت تۆڵەی خۆم لە ئەندریاس وجەماعەتەكەی بكەمەوە ئەگەر هاوكارم بن نە كارم هەیە بەسەرتانەوە، نە ئەم جانتایەش دەبەم. ئێوەش من باش دەناسن كەمن لەم جۆرەكارانە دوورم، وایە؟

بابەك: وایە

ماكوان: كەمادام وایە، ئەدرەسی ئەندریاس و ئەوانم بدەرێ. ئەو كەسە كێ بووە كە سپراكەی كردووە بەدەمو چاوی من داو بێ هۆشی كردم؟ چونكە ئەو ڕۆژە ئێوەشم بینی لەگەڵیاندا.

فەرهاد: ئەوە كوڕێكی سویدیە ناوی توونە یە ئەوە زۆر هیچو پوچە.

ماكوان: بەڕاستی هیچو پوچە.. ئەی بۆ لەگەڵیدا هاتن؟

عەبدوڵڵا دەستی داهێناوە لێی بدات دەستیم گرت و وتم ئەسیری بەردەستمانە لێی بدەین یان لێی نەدەین هیچ ئازایەتی نیە. ئەدەرسمان وەرگرت و شوێنی دانیشتنیان و شەوانی دیسکۆ و بارەکانیمان زانی.

ماکوان: بیانبەستینەوە بە قایمی، بەڵام با جلەکانیان بکەنەوە بەریان، دەستمان کرد بە بەستنەوەیان. تێپ و هەمووشتێکمان پێبوو خۆمان، بەستماننەوە دەمیشیانم بە تێپ بەست، بەڵام دڵنیا بووم لەوەی کە لە لووتەوە بەئاسانی هەناسە ئەدەن.

جانتاکەم لەپشت بۆیلەرەکەدا هێنایە دەرەوە.

عەبدوڵڵا: من هەموویت بۆ ساغ دەکەمەوە، خەمت نەبێت.

ماکوان: وەڵامم نەدایەوە هەموو دەرمانەکان و هەندێك پارەی تێدا بوو لەسەر کورسی و شتەکان بڵاومانکردەوە.

سەردار: کاکە بیانسووتێنین؟

ماکوان: کورە ئەوە باسی چی دەکەن، من ئەیان پارێزم بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لەو دەردەی هەیانە.

تەلەفونەکەی خۆمم دەرهێناو وتم هەمووتان بچنە دەرەوە سەیارەکە بهێننە بەردەرگا.

چوون هەموو سواری سەیارەکە بوون، تەنها من لە ژوورەوە مابوومەوە. تەلەفونم کرد بۆ پۆلیس، ناوی خۆمم وت و بە سورشتی حاڵ لای پۆلیس

کە بەتەلەفونی خۆت بیکەیت ژمارەکەت و ناوەکەت و ئەدەرسەکەت و تەنانەت ئەو جێگایەشی لێ وەستاوەی دەزانن. منیش هەموویم بەڕاستی وت چوومە بەردەرگاکەیان، بەڵام یەك گۆڕانکاری بچوکم تێدا کرد ئەویش وتم: لەو جادەوە ڕۆشتووم لەبەردەرگای ماڵێکدام شەڕە فریایان کەون. بەدەم قسەوە نزیکی سەیارەکە بووم، بەوانم وت بڕۆن من نایەم نیوەی کارەکەمان تەواو نەبووە ئێوە لەم ناوە نەمێنن پۆلیس وا بەڕێوەیە، بەڵام وتیان ئەی تۆ؟ وتم خەمی منتان نەبێت دوای تێتاندەگەیەنم. خێرا ڕۆشتن.

لەوناوەدا خۆم مەڵاس دابوو کە پۆلیسەکان هاتن دەستم، لێڕاگرتن و خۆم ئاشکرا کرد.

ماکوان: من بووم تەلەفونم کرد، لێرەوە دەڕۆشتم بۆ ماڵی ناسیاوێکم دەنگە دەنگ لەم ماڵەدا بووە کە منیان بینیوە تەلەفونم کردووە زانیومە شەڕە بەرەو ڕووی من هاتوون، منیش ڕامکرد و خۆم شاردەوە، ئەوانیش سواری سەیارەیەک بوون و هەڵهاتن، ئەوە ماڵەکەیە..

پۆلیس: سەیارەکە چی بوو؟

شتێکی خەیاڵیم وت، کە وجودی نەبوو. کەچوونە ماڵەکەوە ٢٠ خولەکیان پێچوو من هەر لەگەڵیاندا وەستابووم، کوڕەکانیان هێنایە دەرەوە، هەردووکیان حەپەسا بوون کە منیان بینی لەگەڵ پۆلیسەکان قسە دەکەم.

بۆیە ئەو کارەشمکرد سایکۆلۆژیەتی ئەو خەڵکە تاوانبارانە دەزانم، کە ئیتر بیری تۆڵە سەندنەوە ناکەن، بەڵکو ئاقڵ دەبن کە دەچنە زیندان، ئینجا جەماعەتی نەرویجیش ناچنەوە بەلایاندا بۆ ئەوەی خۆیان تێنەگەیەنن، ژیانی ئەو گەنجانەش نەفەوتێت ڕزگاریان بێت لەدەستی ئەو باندە.

گریمانی ئەوەشم دانابوو بڵێن کە ماکوان هاتۆتە سەرمان.

وتم ئەگەر واشیان وت، دەڵێم درۆ دەکەن ئەوە بە هۆکاری ئەوەی من تەلەفونم بۆ ئێوە کردووە بۆیە دەیانەوێت من تێوەگلێنن، منیش بۆ خۆم کونیەم پاکە هیچ ترسم نەبوو، لە ٨٠٪ دڵنیا بووم کە خۆیان لەمن ناگەیەنن، چونکە تاوانێکی گەورەتریان کردووە منیان ڕفاندوە لەبەر ئەوە زۆر دڵنیا بووم کە هیچ ناکەن، ئەوەشی من دەیکەم سەرتێکدانە لەوان.

ئەوانیان برد بۆ فەرمانگای پۆلیس، منیش تەلەفونم کرد بۆ جەماعەت وتم بگەڕێنەوە هەڵمبگرن بابڕۆین.

چووینەوە بۆ ماڵەوە لەڕێگا بۆ ئەوانیشم باسکرد چیم کردووە، لەماڵەوە پشوویەک بدەین پلانم دانا بۆ چوونە سەر ئەندریاس و جەماعەتەکەی هەر ئەم شەو بۆ ئەوەی سوود لەکات وەرگرین ئەوانیش بڵاوە نەکەن.

سەیران خان تەلەفونی بۆ کردم: ماکوان فریاکەوە هێرۆ بەمن و موستەفا ڕاگیر ناکرێت و خەریکە دەمرێت هاوار دەکات، چی بکەین؟

ماکوان: هەوڵبدەن هێوری بکەنەوە تا دەگەمە لاتان و هیچ تەلەفونێکی لەبەر دەست نەبێت و ڕانەکات.

## هەڵوەشاندنەوەی پلانەکەمان

لەدوای ئەوەی کە تەلەفون کراو پێیان ڕاگەیاندم کەوا هێرۆ حاڵی باش نیەو کەوتۆتە پەلە قاژە، هەموو هەڵساین لەماڵ و چووینە لای کاك موستەفا و سەیران خان. هەموو ئەو هاوڕێیانەی کەلای من بوون لەگەڵم هاتن چووینە لای هێرۆ.

تەندروستی هێرۆمان بینی زۆر خراپ بوو، کەمنی دیی کەوت بەسەر قاچمداو وتی: تکات لێدەکەم لێرە ئازادم بکە، ئاگام لە سەیران خان بوو دەستی کرد بەگریان و کاك موستەفاش دڵی پڕ بوو.

عەبدوڵلا: کاکە ئەوە وەزعی زۆر شڕە بۆ دەرمان.

ماکوان: کاك موستەفا ئێستا بۆ من ئاساییە ئازادی دەکەم، بڕوات لەگەڵ نەرویجییەکی بێ ڕەوشتی خاوەن گروپەکە ڕابوێریت لەگەڵیداو دەرمانەکەی بداتی و بیکاتە کۆیلەی خۆی ئایا ئەمە چارەسەرە؟

یان بە قسەی من دەکەن پەیوەندی بکەین بە نەخۆشخانەوە بەسەیارەی فریاگوزاری بڵێن بێت و بیباتە نەخۆشخانە و چارەسەری بکەن، تا لەو حاڵەتە دەربچێت.

هێرۆ: ئەگەر ئازادم نەکەن بە پۆلیس دەڵێم ئەمانە دەستدرێژیان کردۆتە سەرم.

موستەفا: خۆی تورەکرد لە هێرۆ، هاتە لای من وتی ئەگەر بە پۆلیسی وت چی دەکەیت؟

ماکوان: ناتوانێت هیچ بە پۆلیس بڵێت خەمت نەبێت، گریمان پێشی وتن ئەوە پوریەتی لەگەڵیەتی و هاتوون بە میوانی ئەو سەیارەی لێخوڕیوە و سەیارەکەی لەبەردەرگادایە، پاشان بەو حاڵە ناتوانێت لێرە بێت چۆن خۆی دەخاتە زیندان. دڵنیابە ئەو کارە ناکات، چونکە بڕوای پێناکەن، ئەم دەرمان بەکاردنێت، ئەگەر بڕواش بکەن لە ڕووی یاساییەوە هیچمان لەسەر ناکەوێت.

ئێمە نەلێمانداوە جێگای لێدانی پێوە دیار بێت نە دەستدرێژیشمان کردووەتە سەری، ئەگەر بەقسەی من دەکەن با بە نەخۆشخانە بڵێین ئەوان کێشەکە بگرنە دەست.

ئێوەش بڵێن ئەو وەزەعەی بەسەر هاتووە نەمانهێشتوە بڕواتە دەرەوە هیچ نازانین چییە.

کاك موستەفا و سەیران خان ڕازی بوون، هاوڕێکانی من چوونەوە بۆ ماڵی ئێمە، لەوێدا بڵاوەم پێکردن، بەهۆکاری ئەوەی ماڵی هاوڕێکەی خۆم لەبەردەستی من بوو نەدەکرا چۆڵی بکەم.

خۆم پەیوەندیم کرد بە فریاگوزارییەوە، هەمووی چەند خولەکێکی پێچوو خێرا هاتن و دووکەس هاتنە لای هێرۆ، کە بینیان منیان بانگ کرد. وتیان ئەو کەسە پێویستی بەدەرمانە و بەکاری دێنێت، منیش خۆم واپیشاندا کە هیچ نازانم.

ماکوان: ئەوە پوریەتی وەك دایکی وایە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئەو هێناونی بۆ ئێرەو لەپڕ وەك شێتی لێهاتوە. ئەوەش سەیارەکەیەتی نەم هێشتوە سەیارەکەی لێ بوخرێ لەسەر قسەی پوری وتومە نەوەك شتێکی لێبێت، هەرچەندە قسەیەکی سەیری کردووە وتویەتی ڕێگام نەدەن بڕۆم دەڵێم دەستدرێژیان کردۆتە سەرم و هەندێك قسەی تریشی کرد بەس زۆر گوێمان پێنەدا.

یەکێك لەو کەسانەی لەگەڵ سەیارەی فریاگوزاریەکەدا هاتبوو، وتی ئەو قسانە زۆر ئاسایەو جێگای بڕوای هیچ کەس نیە، ئەگەر ڕازین ئێمە دەیبەین و چارەسەری دەکەین، بەڵام دەبێت پەیماننامەیەك بنووسن کە ڕازین بەوکارەی لە نەخۆشخانە چارەسەری بۆ بکرێت.

سەیران خان: ڕازین و منیش دێم لەگەڵتاندا.

ئەوانیش خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی و هێرۆیان بەستەوە بە چەرپایەکەو خستیانە سەری، بەنەرویجی هاواری دەکردو دەیووت: ماکوان تیرۆرستە، دەیەوێت دەستدرێژیم بکاتە سەر، ئەوانەی دەوروپشتیشی دەیانوت ئارامبە.

لەگەڵ کاك موستەفا کەوتینە شوێنیان تا دایان مەزراند و سەیران خانمان بە دیاریەوە جێهیشت.

ماکوان: سەیران خان هەوڵبدە دایکی ئاگادار بکەرەوە و بەڕاستی پێی بڵێ ئەوە وەزعەکەیە.

سەیران: بەخوا ئاگاداریشی بکەمەوە نایەت من دەیناسم ئەو دڵی چۆنە ، بەس هەر ئاگاداری دەکەمەوە، چوو بۆلای کاک موستەفا و پێی وت: هەموو ئەمانە بۆ ئازیز بگێڕەوە، بەڵکو بترسێت با تووشی هیچ هەڵەیەك نەبێت، با هێرۆ ببێتە عیبرەت بۆی.

ماکوان: لەدوای چەند کاتژمێرێك لای سەیرانمان جێهێشت، بەڵام هێرۆ زەلیل داماو گوناح، لیك بەدەمیدا ئەهاتە خوارەوە ئەو کچە جوانە هەموو کەس بێزی لێدەکردەوە.

موستەفام گەیاندەوە ماڵەوە.. تەلەفونم کرد بۆ هاوڕێکانم وتم: چی دەکەن وتیان کاکە عەبە.. خواردنی دروستکردووە فریاکەوە بەشت نەماوە، نزیکی ماڵەوە بوومەوە تەلەفونێکم بۆ هات ژمارەکە دەرنەچوو بوو، بەهۆکاری ئەوەی شۆفێریم دەکرد هەڵمنەگرت تا گەیشتمەوە لای هاوڕێکانم و نامان خوارد وتیان چی بکەین؟ خۆمان ئامادەکرد بۆ پلانێکی تر لە شەوی شەممە و یەکشەماندا لە دیسکۆدا دەستیان لێبوەشێنین، لەکاتی قسە کردندا بووم هەمان تەلەفونی بێ ژمارە تەلەفونی کردەوە، هەڵمگرت ئەندریاس بوو!

ئەندریاس: ماکوان یاریەکەت جوانە! ئەتەوێت هەروا یاری کەیت؟

ماکوان: هیوام وایە بەدڵت بێت.

ئەندریاس: ماکوان بەتەمای چیت؟

ماکوان: خواردنی کەللە سەری تۆ بە شەرابی خوێنتەوە.

ئەندریاس: جا ئەو قسەیە بۆ تۆ قەڵەو نیە؟

ماکوان: تاقی دەکەینەوە، ئیشمان چییە.

جێگاو شوێنی یەکتر دەزانین یارییەکەمان خۆشتر دەکەین.

ئەندریاس: من یاری فیشەك دەکەم.

ماکوان: یاری من سووتاندن بوو، بەڵام ئاساییە مادام تۆ حەز بەو یارییە دەکەیت ئەوە ئێمەش گۆڕیمان بۆ یارییەکەی تۆ! هەموو دیسکۆکانی شوێنی دانیشتنتو هاوڕێکانت لەمەولا لەژێر رەحمی دەمانچەی کوردەکان و تورك و عەرەبدا دەبێت. جا بابزانین کاممان ناوچاوی ئەوی ترمان دەهێنینە خوارەوە.

ئەندریاس: باشە ئەتوانین یەکتر ببینین؟

ماکوان: بۆ نا کام گۆڕستان دوورە لەشار وەرە ئەوێ، یان وەرە تەنیشت دەریای شاری ڤالەر بۆ ئەوەی بەلاشەکانتانەوە ماندوو نەبین بتانخەینە ناو دەریاکەوە! ئەم ئێوارەیە خۆشحاڵم دەمەوێت دەعوەتی هەموو ماسییەکانی دەریای ڤالەر بکەم.

واهەستی کرد ئەترسم، هەرخۆشمم بۆیە ئەو هەڕەشانەی کرد. ئەو جۆرە ئوسلوبی قسەکردنە ئەوروپییە، زیاتر بە رەمز قسە دەکەن بۆیە ئوسلوبی خۆیانم بەکارهێنایەوە.

ئەندریاس: جارێ زووە بۆ ئەوە، وەرە بۆ لای ئەو جێگایەی وەك بەتانیمان لێکردی، لەبەر دەستماندا کەوتبوویت بەشەق تێمان هەڵئەدایت. بۆ ترساندن وای پێووتم، وای دەزانی ناچم.

ماکوان: نزیکم لەو جێگایە ئەتوانم ١٠ خولەکی تر لەوێ بم.

ئەندریاس: جا دێیت؟

ماکوان: وەك وتم لە ئێستاوە تاقی بکەرەوە، بزانە خاوەنی قسەی خۆمم.

تەلەفونی داخستەوە، پێش ئەوەی هیچ بڵێم لەگەڵ هاوڕێکانم تەلەفونم بۆ ئایدن‌و سلێمان کرد. ئەوان وەك کارکردن بەکاتژمێر لەگەڵمدا بوون، واتا هەر کاتژمێریك بۆ شەڕکردن بە ٧٠٠ کرۆن ڕێکەوتبووین بەسەیارەی خۆیانەوە، پێم وتن: تا چەندی تر دەگەنە لام؟

ئایدن: لەتەکیەکەین ٤ خولەکی تر لای تۆین.

ماکوان: دووکەسی زیاتر بێنە لەگەڵ خۆت، باشە!

ئایدن: حەز دەکەیت هەموو تەکیەکە دێنم.

ماکوان: چوار کەس بەسە، بەڵام با لاواز و زەعیف نەبن هەموو خاوەن هێزو عەزەڵات بن.

ئایدن: خەمت نەبێت، واهاتین.

ماکوان: ڕوومکردە هاوڕێکانی خۆم، تورکەکان کێشەیان نیە ئەوان دەمانچەیان هەیە، بە پارەش گرتوومن، خۆم لەگەڵ ئەواندا دەچمەوە پێشەوە، ئێوە لەدواوە دەبن.

ئەگەر هەرچی بوو لە تواناماندا نەبوو ڕووبەڕویان ببینەوە ئێوە هەڵدێن و خۆتان دەپارێزن.

پەیوەندیکردن بە پۆلیسەوە هیچ بەرهەمێکی نیەو بیری لێمەکەنەوە، ئەوانیش وازمان لێناهێنن وا دەزانن ترساوین ئەگەر پەیوەندی بە پۆلیسەوە بکەین، پۆلیسیش بێت تەنها بڵاوەمان پێدەکەن.

منیش لەبەر ئەوەی هەموو هاوڕێکانم لەگەڵ بوو بۆیە خێرا ئامادەییم نیشاندا تورکەکانیش ئامادەییان دەربڕیبوو. ویستم عەرزی عەزەڵات بکەم و ئەوانیش چاوترسێن بکەم، دەشمزانی نەرویجییەکان ترسنۆکن زۆر ئەهلی شەڕ نین.

پلانمان دانا گروپی ئایدنیش گەیشتن و لەگەڵ ئەوان سەرکەوتم، دوو سەیارەی ڤانیان پێبوو، خۆشمان بە سەیارەکەی منەوە ٣ دانەمان پێبوو.

دەرچووین داوام کرد لە ئایدن لە پێشەوە من دەڕۆم ١٠٠ مەتر لەمن دوور بن، دوایی هەر چوارتان بەیەکەوە دابەزن و وەرنە لای من.

بە سەردار و عەبدوڵلام وت ئێوەش لەدوای تورکەکانەوە بوەستن، سەرحەد و ڕێبواریش با بەسەیارەکانەوە بێنە ئەو جێگایە دانەبەزن. لایتەکان داگرسێنن کەس نەزانێت سەیارەکان چەند کەسی تێدایە و فول بدەن لەوان.

من خۆم زۆر تورە بووم بە وەزعی هێرۆ و ئەوەشی کە پێی وتم وەك بەتانی لەبەر دەستماندا بوویت بەشەق تێم هەڵئەدایت، خەفەتم لەدڵا بوو بۆ شەڕ گیانم دەخورا.

ئێمە چەند خولەکێك دواکەوتین، ئەندریاس تەلەفونی کردەوە: تاقیم کردەوە هیچ مریشکێکم نەبینی.

کەوای وت قسەم نەکرد و وەڵام نەدایەوە،چونکە نزیکی جێگاکە بوومەوە زانیم زۆرم نەماوە بگەمە ئەوێ. وتم ئاوڕ بدەوە بزانە شێرێك لەپشتەوەیە ئێستا چۆن سوارت دەبێت.

کەئاوڕی دایەوە منی بینی دابەزیم و چەقۆیەکی ماسی گرتنم خستبووە ژێر قۆڵی چاکەتەکەم، ئامادەم کردبوو بیدەم لە قورگی بۆ ئەوەی یەك جار نەجاتی بدەم. زۆر داخ لە دڵ بووم بۆی. ئایدن و سلێمان و دووانەکی تریش دابەزین، رووە ئەو هاتم و پێم وت: مریشك ڕادەکات شێر هەمیشە ڕووەو نێچیرەکەی دەڕوات تۆ پیاوی ئەوەی بوەستی لەبەردەممدا.

ئەندریاس: بەپێکەنینەوە چەپڵەی بۆ لێدام، بڕوای ئەوەم نەبوو ئەوەندە ئازا بیت، تۆ پێویستە بێیتە گروپی من. دووانی لە پشتەوە وەستا بوون وەك پاسەوان ئایدن و سولەیمانیش هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵمدا دەهاتن تا گەیشتمە لای ئەندریاس.

ماکوان: خوێری ترین پیاوی نەرویج ئەوە من هاتم، تۆ دەبێت پێڵاوەکانم پاك بکەیتەوە ئێستا.

وەستاین لەبەردەمی یەکتریدا لەدواوە چوار ماتۆڕ سوار هاتنە نزیکمان، ئیتر من ئاگاداری دوای خۆم نیم ئەوان هاتوون چی دەکەن ئایا پلانەکە دەڕوات وەك ئەوەی دەمانەوێت؟ ئەوەندە دەزانم چوار تورکم لەگەڵدایە، زۆر متمانەم بە ئایدنە.

ئەندریاس: ئەو پیاوە خوێڕییەی نەرویج باسی دەکەیت لەگەڵ باشترین کچی کورد دا ڕادەبوێرێت، چۆنم بوێت ڕادەبوێرم لەگەڵیدا، قسەی زۆر ناشیرینی کرد.

شێت بووم، ڕەشی لەچاومدا نەما هیچ تەحەمولم نەکرد. هەتا توانیم کلکی چەقۆکەم لەسەریدا نوقم کرد، کەوتمە سەرو گوێلاکی. تەماشام کرد عەبدوڵڵا هەولێری لەپێشی منەوە بەسەر یەکێك لە پاسەوانەکانی ئەندریاس دا سەرکەوت و تێی ئەسرەوێنێت. هەر ماتۆڕ سوارە و ئایدن ڕاوی دەنێت بە دەمانچە، من واهەستم کرد دوای ئەوەی کە کێشاومە بە ئەندریاس دا خۆمم بۆ مردن ئامادەکرد و چاوەڕێی ئەوە بووم مەلەکولمەوت بێت. ووتم مەلەفم لەژیاندا داخراوە. تەماشام کرد ئەندریاس لەبەردەستمدا کەوتووە. هاوڕێکانیشم ماتۆڕەکان کۆدەکەنەوە و دەیخەنە ناو سەیارەکانی تورکەکان.

فێری کارەکەی عەبدوڵڵا بووم، ڕووتو قووتم کردەوە بەو سەرما، وتم پێڵاوەکانم ماچکە. وەك سەگ پاڵکەوە و پێڵاوەکانم ماچ کە ئینجا بۆمان پاك بکەرەوە بەزمان.

وەك سەگ ئەیلێساوە، وتم: پێڵاوی هەموو هاوڕێکانم بەزمان پاك بکەرەوە.

دەستی پێکرد تا هاتە سەرەی عەبدوڵڵا ڕشاوە بەسەر پێڵاوەکانی عەبدوڵڵادا، ئەویش هەتا هێزی تێدا بوو بەشەق کێشای بەدەمیدا.

بەداخەوە چەقۆیەك بەر باڵی سولێمان کەوتبوو، باقی هەموو وەك گوێزی ساغ بووین. من نەبێت دەموچاوم هەندێك جێگا چڕنوقی ئەندریاسی پێوە بوو هەموو باش بووین.

نزیکی سەیارەکەی ئەندریاس بوومەوە لەبەرچاوی خۆیدا بە تێڵایەکی ئایدن جامەکانم شکاند، بە چەقۆ تایەکانیم تەقاند، ناو سەیارەکەم وێرانکرد. کەچی ئەو سەگبابە هەر پێدەکەنی ئەوەندەی تر ڕقم هەڵسا، ژمارەی سەیارەکەیم لێکردەوە و بردم لەگەڵ خۆمدا.

خستمانە ناو سەیارەکەی سولمان و بەستمەوە بەجلەکانی خۆی، ماتۆڕەکانمان برد ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ڕایانکرد.

خۆم چوومە دواوە بەلایەوە بووم سەرداریش هات لەگەڵمدا وەستا وتم وەزعت چۆنە پیاوە خوێڕییەکە؟

دیسان هەمان قسەی کردەوە وتی باشترین ئافرەتی کوردم لەبەر دەستایە.

سەریم گرت کێشام بە دەسکی ماتۆڕێکدا لە پشتی سەیارەکەدا وەك سەگ دەیقوروسکاند.

ئایدن: وتی بۆ کوێ دەچین؟

لێخوڕە بۆ ئەو ماڵەی کە چوونەتەوە بۆ کوردستان، ئەدرەسەکەم داییە، چونکە سەیارە بەئاسانی دەچووە گەراجەکەیان. گەیشتینە ئەوێ و

هەمووشتەکانمان داگرتو جەماعەتی تورك هاتنە لام ئایدن وتی ماکوان ئەمانە هەمووی دەفرۆشین بە ٢٥٠ هەزار کرۆن داینێ بۆ خۆمان، خۆمان چارەسەری دەکەین. بە ئەندریاسیشەوە بۆت دەخەینە دەریا.

ماکوان: نا ئەوە کاری ئێوە نیە، هەمووی داگرن.

شتەکەمان داگرتوو خستمانە گەراج و تورکەکان ڕۆشتن، پێم وتن دوایی حساب دەکەین، سولێمانیش زیادە وەردەگرێت لای خەلیفە دایدەنێم بۆتان ڕازیتان دەکەم. لەگەڵ ڕەفیقەکانی خۆم گفتوگۆمان دەست پێکرد.

عەبدوڵلا: من پێم باشە ئەندریاس بەرمە لای خۆمان لە دوکان ژێر زەمینێکم هەیە با لەوێ دایبنێم.

قەناعەتمان بە قسەکەی کردو بردی و ڕۆشت.

ماتۆڕەکان هەر لەماڵی هاوڕێکەم مایەوە ئەویشمان چۆڵ کردو هەموو ڕۆشتینەوە بۆ ماڵی خۆمان، منیش بۆ ماڵی خەزوورم.

سێ ڕۆژ کەسمان یەکترمان نەبینی، من چووم بۆ ئۆسلۆ بۆ لای عەبدوڵلاو سەرحەد دوای بەخێرهاتن پرسیم کوا ئەندریاس؟

عەبدوڵلا: ناردوومە بۆ ئاسمان، ئیتر نازانم لەوێوە ناردویانە بۆ کام جەهەنم.

ماکوان: ناشێ کوشتبێتت؟ شتی وا چۆن دەکەیت هەرچی بکەین پیاو کوژ نین ئێمە.

عەبدوڵلا: کورە کوشتنی چی ئەوەتا لەخوارەوە هەر پیتزا دەخوات.

کە چوومە لای سەیر دەکەم عەبدوڵلا هەویری پێ دەشێلێت. ئەو سێ ڕۆژە هەموو هەویری دوکانەکەی پێ شێلاوە.

ماکوان: ئەندریاس پاشایەتیەکەت خۆش بوو یان بتکەمە شاگردی عەبدوڵلا؟

ئەندریاس: ماکوان ٥٠٠ هەزار کرۆنت ئەدەمێ، بەس بابگەڕێمەوە.

عەبدوڵلا: جا ٥٠٠ هەزار چییە؟ ئەو بەس بۆ زەلیلکردنی تۆ زیاد لەوەی سەرفکردووە.

ئەندریاس: یەك ملیۆن کرۆنت ئەدەمێ بەدەستی، چیت ویست بۆ دەکەم بەس ڕزگارم بکە لەدەستی ئەم عەبدوڵلایە!

ماکوان: ئەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە هەروا ئاسان نییە، من پارەم بەقەدەر قورسایی تۆ هەیە.

ئەندریاس: چیت دەوێت؟

ماکوان: زۆر شت! چۆن کار دەکەیت ببینە شەریك .. بەیکەوە کار بکەین لە ژێر دەستی مندا کار دەکەیت و هەموو موشتەرییەکان و کڕینەکانمان تێکەڵ دەکەین.

ئەندریاس: ئامادەم

ماکوان: چۆن بڕوات پێبکەم؟

ئەندریاس: دووملیۆن کرۆن لەژێر دەستا دادەنێم تا ئەوکاتەی متمانەت بۆ دروست دەبێت.

ماکوان: من خاوەن بڕیار دەبم.

ئەندریاس: ڕازیم، بەڵام ماکوان هێرۆ وا باسی تۆی بۆ من نەکرد. بمزانیایە بەو شێوەیەیت دەمێك بوو دەبوومە هاوڕێت.

ماکوان: بەڕاست؟ ئەی چۆن باسی کردووم؟ پێم بڵێ چۆن زانیت تەلەفون بۆ من بکەیت کێ پێی وتی؟

ئەندریاس: هێرۆ وتی کەسێکی سادەی، هیچ پەیوەندیت نییە بە کڕین و فرۆشتنی مادەوە، تەنها ئەو ڕقی لێت بوو داوی لێکردین تۆڵەت لێبکەینەوە، ئەمڕۆ هێرۆ بەم ژمارە تەلەفونە پەیوەندی پێوە کردم، وتی ماکوان گرتومی و چووە بۆلێدانی فارسەکان و دێت بۆلای تۆش.

ماکوان: تۆڵەتان کردەوە؟

بەلامەوە سەیر بوو هێرۆ بە تەلەفونەکەی موستەفا تەلەفونی کردبوو بۆ ئەندریاس!

ئەندریاس: تۆڵەت لێسەندین.

ماکوان: بەقسەم نەکەیت هەموو تەوالێتەکانیشت پێ پاك دەکەمەوە تا ئەو کاتەی وەك بۆق پانت دەکەمەوە.

ئەندریاس: پەیمان بێت لەقسەت دەرناچم.

ماكوان: تەلەفونەكەم دەرهێنا و دامە دەستی وتم تەلەفون بۆ كێ دەكەیت بیكە.

عەبدوڵڵا: ماكوان بۆ خاتری خوا، ئەوە چی دەكەیت ترسانەكە.

ماكوان: وازی لێ بێنە پلانی خۆمە، تەلەفونەكەم دایە دەستی.

ئەندریاس: كەسم نیە تەلەفونی بۆ بكەم، نامەوێت.

ماكوان: ڕەفیقەكانت!

ئەندریاس: ئەوانە هەمووی بە پارە كاریان دەكرد، لەگەڵم رایانكرد، من ئەوانم ناوێت، ئیشم بەكەس نیە بەتۆ نەبێت.

ماكوان: كەواتە تۆ خاوەن پارەكەیت، بۆیە كەست ناوێت. سەرمایەكەت باشە؟

ئەندریاس: بەڵێ خراپ نیم.

ماكوان: كێت لە پشتە و كار بۆ كێ دەكەیت؟

ئەندریاس: كەبالا

ماكوان: بە پێكەنینەوە خۆشحاڵت كردم، دە هەستە با باوەشت پیابكەم، دەبوو زوو قسەت بكردایە لەكام گروپی.

ئەندریاس: سەگی ڕەش

ماکوان: خۆشحاڵم، کێ سەرۆکە؟

ئەندریاس: خۆم!

ماکوان: چۆن؟ کێی ترت لەگەڵدایە؟

ئەندریاس: هەر خۆمم ناوی ئەوخەڵکانەم دابوو بە بارەگای سەرەکی لە (نیوۆرك) کە بەپارە کاریان دەکرد یەکێک لەوانە هێرۆیە.

ماکوان: لەکوێوە پەیوەندیت پێوە دەکەن؟

ئەندریاس: بەریتانیا و ئەمریکا.

ماکوان: لەکوێ کەرستەکان وەردەگریت و بۆت دێت؟

ئەندریاس: ئێران و ئەفغانستان

ماکوان: کەواتە سوێندم بۆ بخۆ کە فێڵ ناکەیت.

ئەندریاس: سوێند بەتاجی کەبالا، هاوکارت دەبم.

عەبدوڵڵا: هیچ تێناگەم ماکوان، ئەوە باسی چی دەکەن؟

یەکێك لە شاگردەکانی عەبدوڵڵا سەری کێشاو وتی عەبدوڵڵا ڕاکە پۆلیس هاتوە بۆ دوکانەکە.

# کەبالا و زەردەشتی، فێڵەکانیان و چۆنیەتی یاریکردن بەخەڵکی

لەدوای ئەوەی شاگردەکەی عەبدوڵڵا هات وتی پۆلیس هاتووە، عەبدوڵا ویستی سەری ئەندریاس بگرێت بیکات بە تەنورێکدا و لەوێدا بیشارێتەوە.

ماکوان: وازی لێبێنە حەقی ئەوت نەبێت برۆ بزانە بۆچی هاتوون، ئەو دانێ بۆ من.

ئەندریاس: ماکوان من ئاگادار نیم کە بۆچی پۆلیس هاتوون، هیچ پەیوەندی بەمنەوە نیە دەزانی؟

ماکوان: دەزانم هەر باسی ئەو مەووزعەش مەکە، بابڕۆینە سەرەوە بزانین چ باسە.

ئەندریاس: بەڕاستە؟

ماکوان: بەڵێ بەڕاستمە، تۆ یەکێکی لە گروپی خۆم ئەگەر پەیمانەکەت ببەیتە سەر.

ئەندریاس: تۆشێفی گەورەیت، واتا وەستای گەورەیت.

هەردووکمان بەیەکەوە هاتینە سەرەوە، ئەوانەی کە هاتبوون پۆلیس نەبوون، بەڵکو کارمەندی فەرمانگەی تەندروستی بوون هاتبوون بۆ پشکنینی پاك و خاوێنی دوکانەکە.

شاگردەکەی بە ڕەش کاری دەکرد، زمانی نەرویجیشی نەدەزانی بە پۆلیس تێگەیشتبوو.

عەبدوڵڵا: قسەی لەگەڵ ئەوان دەکرد، زوو زوو سەیرێکی منیشی دەکرد دەیووت ئاگات لێی بێت ڕانەکات.

ماکوان: کاکە تۆ خەریکی ئیشی خۆت بە، من خواخوامە ڕاکات. خوا ئەکات ئەو پیاوەتییەی دەکرد مەمنونی دەبم، تازە ئەوە چۆن ڕادەکەت تۆ خەمی خۆتت بێت خەمی ئێمەت نەبێ.

پێکەوە چووینە بازار کراس و پانتۆڵم بۆ کڕی و ١٠٠٠ کرۆنم دایە، وتم بڕۆ ئیسراحەتی خۆت وەربگرەو یەکتر دەبینینەوە، بەس ئەندریاس تۆ زۆر بچوکی جارێکی تر بیر لە یاری کردن لەگەڵ مندا مەکەرەوە، حەز ناکەم بێیتە بازاڕی من تۆ نەرویجیت، توانای شەڕی گروپی ئێمەت نیە.

پیاوکوشتن لای ئێمە ئاسانە، لای ئیوە ئەگەر زۆر عقوبە(سزا) بدرێت بەندکردنی ٤ ساڵ بۆ ٧ ساڵە، مەیە ناو ئێمە لەوانەیە لەیەکەم جاردا لەگەڵمدا بکوژرێیت.

بۆیە وام وت بە ئەندریاس بۆ ئەوەی بترسێت و بڕوات مەشغوڵی سەرسەریەتی خۆی بێت و منیش لەدەستی ڕزگارم بێت.

ئەندریاس: هەرچی بیت من قبوڵمە.

ماکوان: ئێستا فەرموو بڕۆ.

دەمزانی ئەوروپی ئەو کێشەیەی هەیە بەتایبەت ئەوانەی کە زۆر حەز بەتاوان دەکەن ئارەزووی ئەوە دەکەن لەگەڵ گروپ و کەسێکی بەهێزا بن و بیان پارێزن لە سایەیدا بن وەك کۆیلەیان لێدێت.

بە پێچەوانەوە ئەو کەسانەی لە ئەوروپادا لە سەر بنەمای تەندروست پەروەردە دەبن، هەمیشە هاوکاری یاساو پۆلیسن و هەڵە قبوڵ ناکەن. ئەندریاس لەو شێوە مرۆڤانەیە کە حەز بە تاوان کردن دەکات، دیار بوو کاریگەری فیلمی ئەمریکی و خوێندنەوەی ڕۆمانە مافیاییەکانیشی لەسەر بوو، لەسەرو و هەمووشیەوە لە ناو گروپی کەبالادا کار دەکات.

چوومەوە بۆ لای عەبدوڵڵا تەماشام کرد سەرحەد و سەردار و ڕێبواریش لەوێن، بە پێکەنینەوە وتم هەرمنتان نوقسانم، دوای سڵاو کردن و دەربڕینی خۆشەویستی بۆیەکتری، پرسیم خێرە هەموو کۆبونەتەوە؟

سەردار: مامە ماکوان عەبدوڵڵا تەلەفونی کرد دەڵێت فریاکەون ماکوان.

ئەندریاسی بردوە نەکو شتێك لەماکوان بکات.

ماکوان: برام ئەو کابرایە زیرەی کردووە، ئێمە چێ لێبکەین خۆ مافیا نین تا داوای پارەی لێبکەین. هەر دەبیت بڕوات، دەبێت ئێمە ڕزگارمان بێت لەدەستی بۆچیمانە؟ ئەی وانیە؟

عەبدوڵڵا: وەڵڵا تا یەك ساڵ هەویرم پێدەشێلا! بەس تو خوا ماكوان پێم بڵێ كەبالا چییە؟

لەم نەرویجەدا هەرچی فیعلە دەیزانم، ئەم كەبالایە نازانم چییە؟

ماكوان: كەبالا؛ لە بنەڕەتادا گەل و هۆزێكی مەزهەبی جولەكەن، واتا لەمەزهەبەوە خۆیان جیاكردۆتەوە. توانیویانە كاریگەری دروست بكەن بەسەر هەموو دەوڵەت و ئایینەكاندا بە ئیسلام و مەسیحی و ئایینەكانی ترەوە، بەهۆكاری فیكری غەنوسی و ثیۆصۆفی[١٠]

سەردار: شەرحی بكە برا هیچ تێناگەم.

ماكوان: كەبالا: كۆمەڵێكن خۆیان لەسەروو هەموو شتێكەوە دەزانن واتا سیاسەت دین و تەنانەت كتێبە ئاسمانییەكان، بڕوایان بەهەموو پێغەمبەران هەیە، تەنانەت بڕوایان بە پێغەمبەری خۆشمان محمد (s) هەیە، هەموو پێغەمبەران بە هێزی شاراوە ناو دەبەن لەلایان تاجی كەبالاوە توانایان پێدراوە و تێكەڵ بووە بە گیانی ئەوانیش. پێیان وایە خوا تێكەڵ بووە بەگیانی پێغەمبەران.

خوای كەبالا وەك ئەو خوایە نیە كە ئێمە بڕوامان پێیەتی، خوای كەبالا پێك هاتووە لە دە بەش، بڕوایان وایە سەرەتا خوا هەبووە، بەڵام هیچ تواناو قودەرەتێكی نەبووە تا وردە وردە لەنەبوونی خۆی ئەو خوایە بە دە پێكهاتە خۆی دروستكردووە!

---

[١٠] - ثیۆصۆفی: لەبەشەكانی داهاتوودا ڕوون كراوەتەوە.

كە پێک هاتووە لە:

یەكەم: تاجی شاهی

دووەم: حیكمەت

سێیەم: مەعریفەت و زانست

چوارەم: ڕەحمەت

پێنجەم: توڕەیی و تۆڵە سەندنەوە

شەشەم: بەرزیی و شكۆمەندیی

حەوتەم: گەورەیی و پیرۆزی

هەشتەم: شاهەنشاهی

نۆیەم: بونیادو سەرەتا

دەیەم: تواناو دەسەڵاتی شاهی

ئەم دەپێكهاتەیە ناویان ناوە خوا یان كەبالا كە ناتوانێت بەتەنها هیچ بكات، بەڵكو پارچە پارچەیە تا ئەو كاتەی هەموو یەهوود بەسەرۆكایەتی ئەم گەل و هۆزی كەبالایە كۆدەبنەوە حوكمی دنیا دەكەن لە فەڵەسطینەوە.

پێیان وایە ئەو سەركردانەی كە گەورەن هەموو ڕۆحی پاكن و دەبێت ئەمان پیرۆزییان پێبدەن، وەك پێغەمبەران وان. ئەوەی لەگەڵ ئەمانیش نەبێت ڕۆحی پیسەو لەناوی دەبەن و دەیكوژن وەك یەكێک لە

سەرۆکەکانی کۆنی ئەمریکا کە کوشتیان[11] پێیان وایە کە هەموو پێغەمبەران سەردارو خاوەن توانا بوون بۆیە گەیشتونەتە ئەو ئاستە،

[11]- جۆن کەنەدی: جۆن فیتزگیرالد کەنەدی (ماوەی ژیان:٢٩ی ئایاری ١٩١٧ تاکو ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ لە ٤٦ ساڵیدا) ،کەسایەتی سیاسیی ئەمریکی و ٣٥هەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرەتا ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بووە دواتر بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی پیران، لە ساڵی ١٩٦٠ و لەتەمەنی ٤٣ ساڵیدا لەلایەن حیزبی دیموکراتییەوە هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا و لەئەنجامدا لە ریتشارد نیکسۆنی ڕکابەری بردەوە و بووە یەکەم کاسۆلیکی کە سەرۆکایەتی ئەمریکا بگرێتە دەست و هەروەها بەبچوکترین سەرۆکی ئەمریکا هەژمارکراوە. جۆن کەنەدی لەکاتێکی هەستیار و دژواردا لەماوەی جەنگی سارددا سەرۆکایەتی ئەمریکای گرتە دەست لەبەرامبەر سۆڤیەتدا و خاوەنی هەڵوێستی بەهێز بووە لەهەموو ڕوویەکەوە، هەر ئەمەش وایلێکردووە لەهەموو سەرۆکەکانی دیکەی ئەمریکا گرنگتربێت و لەلایەن خەڵکیشەوە خۆشەویستربێت، لەهەرە ڕووداوە گرنگەکان لەسەردەمی حوکمڕانی جۆن کەنەدیدا کردەوەی هەڵکوتانی کەنداوی بەرازەکان و قەیرانی مووشەکی کووبا و دروستکرنی دیواری بەرلین و کێبڕکێی داگیرکردنی ئاسمان کە بەوە ناسراوە بەڵێنی داوە مرۆڤ بخاتە سەر زەوی ڕوویانداوە. لە ساڵی ١٩٦٢ کۆپتەرەکانی cia وێنەی چەند مووشەکێکیان گرتووە کە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە لە کووبادا دامەزراوە و ئاراستەکەشی بەرەو ئەمریکا بووە و توانای هەڵگرتنی سەری نەوەویان هەبووە هەر بۆیە جۆن کەنەدی ڕووبەڕوی مەترسیدارترین بڕیار بۆتەوە لەمێژوودا، ئەگەر هێرشی بکردایەتە سەر مووشەکەکان ڕەنگ بوو جەنگێکی نەوەوی لێبکەوتایەتەوە و زۆربەی وڵاتانی جیهان کاول ببوایە ئەگەریش دەستەوەستان بوەستایە و هیچی نەکردبا مووشەکەکان مەترسیان لەسەر ئەمریکا دروست دەکرد و پێگەی ئەمریکاش لاواز دەبوو، ئەگەر وەڵامی مووشەکەکانی نەدایەتەوە، لەکۆتاییدا بڕیاریدا هێزی دەریاوانی ئەمریکا ڕەوانە بکات تاکو ڕێگە بەسۆڤیەت نەدات پرۆژەی دروستکردنی ئەو مووشەکانە تەواوبکات. دواتر لەگەڵ نیکیتا خرۆتشۆڤی سەرۆکی سۆڤیەت ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی مووشەکەکانی سۆڤیەت لە کووبا لابرێن بەمەرجێک ئەمریکا کووبا داگیرنەکات. جۆن کەنەدی ناسراوە بەو سەرۆکەی بەڵێنی داوە کە مرۆڤ بگەیەنێتە سەر مانگ و بەسەلامەتیش بیگەڕێنێتەوە سەر زەوی، لە ٢٢ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ لەتەمەنی ٤٦ ساڵیدا کە بەسەردانێکی ڕەسمی لە شاری دالاس بووە بەفیشەک تیرۆر کراوە.

خوا لەناو لاشەیاندا تواوەتەوە کتێبی زیاتری بۆ ناردوون، بۆنمونە بڕوایان وایە موسا (i) بێجگە لە تەورات کتێبێکی تری بۆ هاتووە بەناوی (تەلمود). ئەم (تەلمود)ە تایبەتە بەم تایەفەیە و دەماودەم لە موسا (i)یان وەرگرتوە کتێبی باطنی ئەوانە. ئەوەی کتێبی باطنی نەبیت بە جاهیلی دەزانن، ئەمانە پێیان دەوتریت کەبالای جولەکە.

کەبالای مەسیحیمان هەیە، ئەم جۆرە تائیفەیە بڕوایان وایە بێجگە ئەو کتێبەی کە بۆ عیسا (i) هاتووە واتا ئینجیل١٢ حەواری هەبووە دەماو دەم فێری کتێبی باطنی کردوون، ئەویش ئەو ثیۆسۆفیەیە لەڕێگای گەورەترین ئافرەتی ساحیرەوە لە ساڵی ١٨٣١ لەدایك بووە ناوی (هیلانا پترۆفینا پلافاتسکی)ە خەڵکی رووسیایەو لەساڵی ١٨٩١ بە هەلاکەت چووە.

ماوەی ٢٠ ساڵی ژیانی نادیارەو لە پڕ دەردەکەوێت کۆمەڵەیەك دروست دەکات بەناوی کۆمەڵەی فریاکەتن، یان لەهەر وڵاتێك ناوێکی لێنراوە. توانی لە سوریا و میسر و ئەمریکاو هیندستان و ئێران و ئەوروپاو روسیادا زۆرترین خەڵك کۆبکاتەوە، زۆربەی وڵاتانی جیهان گەڕاوە، چۆتە تبت و لەوێ گوایە لەگەڵ رۆحانیەکاندا قسەی کردووە، کردوویانە بە نوینەری خۆیان بە فەلسەفەی ثیۆصۆفی و وزیاد لە دەساڵ خەریکی بڵاوکردنەوەی ئەم بیروبۆچوونە بووە، پێیان وایە کە بنەمای هەموو ئاین و فەلسەفەیەك ثیوصۆفیە.

سەرحەد: ئەی بێزەحمەت ثیۆصۆفی چییە؟

ماکوان: ثیۆ واتا الله، صۆفی واتا حیکمەت. واتا حیکمەتی الله

سەردار: ماکوان کەبالا لەناو ئیسلامدا هەیە؟

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە هەیە، کەبالای جولەکەو مەسیحی ئیعتراف بە کەبالای ئیسلام دەکەن، دەڵێن ئەوە ئیسلامی ڕاستە، ئەویش تەنیا ئیعتراف بە شیعە دەکەن! هەروەها دەڵێن:

قورئان بۆ محمد هاتووە، ئەویش عەلی فێری باطنیاتی ئیسلامی کردووەو کتێبەکەی داوەتە دەست ئەو تا سەردەمی مەهدی دێت، ئەوانیش باطنی دەزانن و ئەهلی کەبالان، ئیمامەکانیان فێری باطنی دەکەن.

ئەگەر تەماشای هەموو ئەو ئاینانە بکەیت لەیەك نزیکن یاخود لەیەك دەچن.

سەردار: واتا شیعە کەبالان؟

ماکوان: ئەوە قسەی کەبالای جولەکەو مەسیحیە. دانی تەواو دەنێن بە شیعەدا، پێیان وایە ئاینی ئاسمانیە، بەڵام ئەهلی سوننەت نا بەئاژاوەگێڕ و خراپەکار ناساندوویانن.

جا ئەمانە گروپیان هەیە لە هەموو جێگایەکدا خەریکی سیحرو جادوون، بە ناوی سیحری ڕەشەوە ناسراون.

گروپی تریشیان هەیە وەك زەردەشتییەکان، بوزییەکان، مانییەکان، ساتانیستەکان، نوێگەرەکان، ماسۆنیەکان و صوفییە کڵاو سوورەکان[١٢] کە نزیکن لە شیعەوە جاران پێیان دەوترا قزڵباشییەکان.

---

[١٢]- باسی هەموو ئەو گروپانە لە کۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەمان پێداوە.

هەندێکی تر بەناوی شێخ و فاڵگرەوە و ئەوانەی چەقۆ و شمشیر بەکار دێنن لەم کۆمەڵانەن، جا هەریەکە ناوێکی وەرگرتوە. لە هیندستان زۆرن و لە ئەمریکا بەتایبەت لە نیویۆرك لەڕووی ماددیەوە زۆر بەهێزن.

عەبدوڵڵا: دانیشتنەکەمان خۆشە با بڕۆم دوو پیتزا دروست بکەم بیخۆین.

سەرحەد: وەڵڵا کاك ماکوان من نیازم بوو لەماوەیەدا ببمە زەدەشتی! ئەوەندە وتیان ئایینی کوردە.

سەردار: وەڵڵاهی ئەوەندەی من بزانم زەردەشت[١٣] کورد نەبووە و فڕی بەسەر کوردیشەوە نیە، لای فارسێك یان ئەفغانییەك بڵێی زەردەشت کوردە ئەکێشێت بەدەمتا، یان لای پاکستانی و هیندی بڵێ زەردەشت کوردە ئەوەندەت جرط بۆ لێئەدا تا خێل دەبیت، کوردی چی وەڵڵا فڕی بەسەر کوردەوە نیە.

ڕێبوار: کاکە دە پەلە مەکەن سەرتان لە منیش و ماکوانی براشم تێکداوە، هیچ نەبێت با بگەینە ئەنجامێك لەسەر کەبالا، مەوزوع مەگۆڕن چیمان داوە لە زەردەشتی؟ ئادەی ماکوان ی برام بەردەوامبە.

ماکوان: ڕاستە باسەکان دەڕوات و دێت، بەڵام هەمووی یەك سەرچاوەن لە جولەکەوە سەردەردێنن، جارێ ئەم زەردەشتییەی کە ئێستا لە کوردستان هەیە هەمووی قسەی جادوو سیحرەو هەندێکیشی هەڵخەڵەتاندی ئێرانە بۆ نفوزی خۆی لە ناوچەکەدا.

---

[١٣] - لە کۆتایی پەرتوکەکەدا باس کراوە کە زەردەشت کێیە.

جا ئەوانە کێن باسی ئاینی زەردەشتی دەکەن؟ هەروا تەماشاکەن لەماوەی ڕابردوودا دەنگۆی ئاینی زەردەشتی و فەلسەفەی زەردەشتی و ئاینی کوردانی باوك و باپیران! سەریهەڵدا لە ناو ناوەندی شەقامی کوردیدا، ئەوانەی بانگەشە یان بۆ دەکرد لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا کۆمەڵێك کەس بوون بەناوی سەنتەری کوردۆلۆجی و دواتر ئەم سەنتەرە کرایە ئەکادیمی و بەناوی لێکۆڵینەوە لە مێژوی دێرین و نوێی کورد و کوردستان و بەرەو سەربەخۆیی کوردستان.

ئەو کەسانەی کە زیاتر سەرپەرشتی ئەم سەنتەر و ئەکادیمیایانەیان دەکرد، زۆربەی لە چەپەکان و کۆمنیستەکان یاخود روونتر بڵێین: (بێباوەڕەکان بوون بەئایینی ئیسلام و تاڕادەیەك بەهەموو ئایینەکانی تر).

لێرەو لەوێ بزوتنەوەیەکی نادیار و ڕێکخراوی نهێنی دروست بوبوون لەناو دەزگاو پێشمەرگە دێرینەکاندا لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات و زیاتر گرنگی ئەدرا بە واجیهەکانی ناو ئەو دەزگایانەو خەڵکی ئیعلامی و پێشمەرگە ناودارەکان و بەستنی کۆڕو سمینار لەسەر ئەم باسانە، تەنانەت ڕەمزی دەزگا ئەمنییەکان لەسەر شێوەی ڕەمزی زەردەشتییەکان دروستکران.

وەك نمونەی دروشمی دەزگای دژە تیرۆر، هەروەها وشەی زیرەڤانی کە بەواتای پاسەوانی ئاگر دێت.

دواتر هەندێك بیریاری کوردی دروست بون بەتایبەت لە ئەوروپادا کە بانگەشەی زەردەشتی بوونی خۆیان و خەڵکیان ڕادەگەیاند، لە ناسراوترینیان (پۆڵا سەعید و بابان سەقزی)بوون، هەروەها لەم دوایانەش پیر لوقمان، هەرچەندە چەند جارێك لە ناو مەڵبەندی

پێشمەرگە دێرینەکان کۆڕسازدرا لە نێوانی ئێمەو کاک بابان سەقزیدا لەتۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی پاڵتاڵک ئەوەندەی کە من دەمویست بیسەلمێنم کە مێژووی زەردەشت زۆرنادیارەو لە ڕووی ئایینی و مێژووییەوە تاڕادەیەك وەك هێلکەی کەڵەشێر وایە و ساغ نابێتەوە! ئەوانیش جەختی زیاتریان لەسەر ئەوەیە وەك فەلسەفەیەکی ئیرادە و هەندێك ئاکاری ڕەوشتی و دژایەتی ئیسلام لای ئەوان خۆی نمایش دەکرد، هەڵبەت زۆر جار بە ئاشکراو بە ناڕاستەوخۆ ئاماژەی ئەوەیان ئەدا کە بڕوایان بە ئایینێك، وەك ئەوەی کە زەردەشتی بۆ خۆی ئایین بێت نیە! ئەوەندەی کە گرنگیان داوە بە چەمکی دیرۆك و بیری نەتەوەپەرستی و کوردبوونێکی ڕەگەز پەرستی ئەوەندە گرنگیان بە خودی ئایینەکە نەداوە، هەڵبەت ئەم باسە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠٠٥-٢٠٠٦ هەروەها لەڕووی مەیدانیەوە ئێمە زەردەشتییەکانمان ناسیووە، لەڕووی لێکۆڵینەوەی فیکری و فەلسەفی و مێژوویی، بەسەدان سەرچاوەمان ئەمدیوا و دیو کردووە لەسەر ئەم بیروباوەڕە و ئەو چەمکانەی کە ناونراوە بە زەردەشتی، هەر لە فارسی و عەرەبی و کوردی، وە بەستافێك کارمان کردوە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری زیاترو لە ڕووی پاشماوەی دێرین و خودی زەردەشتییەکان لە ئێران و چەند ئاسەوار ناسێکیش لە وڵاتی ئێران و لە هەرێمی کوردستانیش. چەند زمانزانێکی ئینگلیزی جا ئەم پێشەکییەمان بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستییەیە کە سەرحەد و ئێوەش بەرچاوڕوون بکەم.

ماندووترین و بێسەلیقەترین و پەرشوبڵاوترین زانیاری لەناو ئەم باسەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەکادیمی ئەوروپییەکان و بیرمەندەکانی جیهان بەگشتی بە شێوەیەك باسیان کردووە کە تووشی ماندووبون دەبیت

لەباسەكانی نێوان (كرستیان سەندی دانیماریكی و فریدریك نتچە ی ئەڵمانی و ئەنتگیل دۆبرۆنیی فەرەنسی، عەبدوڵڵای موبەلغیی ئابادانی، پرۆپفیسۆر ڕ. س. زێهنەری ئینگلیزی ..هتد) تەنانەت زۆر جار لە ئایینی یارسانی وەك كاكەیی و یەزیدیەكانی كوردستان[١٤] و خودی زەردەشتییەكانیش هەندێك پرسیاریان ئاڕاستە دەكرا لەسەر زەردەشتییەت، تەنانەت ڕۆشنبیرەكانیشیان نەیاندەزانی چ باسە! یەزیدیەكان خۆیان بەر پەرچی ئەوەیان دەدایەوە كە هیچ پەیوەندییان بە زەردەشتییەوە نیە، تەنها كاكەییەكان خۆیان بە نزیك لەزەردەشتییەكان دەزانی، بەڵام نووسەرو ناسراوی ئێرانی عەشیرەتی قەڵغانی (كاك عەباسی پژوهی) ئەوەی ڕاگەیاند: (كاكەییەكان زەردەشتی نین، بەڵام نێوانمان خۆشە لەگەڵ زەردەشتییەكاندا، هەردوولامان بڕوامان بە تەنسیخی رووح(دۆناودۆن) هەیە)! واتا تێكەڵبوونی رۆح دوای مردن بە گیانلەبەرانی دیكە.

لە یەكێك لە ئاتەشگاكانی یەزد پرسیارمان كرد كە: (ئایا وێنەی زەردەشت كێ دروستی كردووە؟) كاك «عەبدوڵڵای خاكە سەر» كە خۆی یەكێكە لەزەردەشتییەكان ئەوەی پشتڕاستكردەوە و وتی كە: ( ئەم وێنەیە كەسێك دروستی كردووە بەناوی (ڕەزای ڕەزەویانی یەزدی) لەساڵی ١٩٨٥ز لە لۆس ئەنجلس كۆچی كردووە لە حیزبی تودەی كۆمەنیستی ئێرانی بووە! هەر هەمان كەسە كە وێنەی ئیمام عەلی دروستكردووە لەسەردەمی شا) دا.

بەكورتی و پوختی با ماندوو نەبین باسەكان درێژەی دەبێت با نانەكەمان بخۆین و پیتزا هات.

---

[١٤]- لە بەشی كۆتایی كتێبەكەدا باس كراون.

دەستمان کرد بە پیتزا خواردن.

تەلەفونەکەم لێیدا ئەندریاس پەیوەندی پێوە کردم هەمووی دوو کاتژمێر بوو ڕۆشتبوو.

ئەندریاس: من دوو ملیۆن کرۆنەکەم بۆ ئامادە کردویت وەك پێشەکی بالات بێت بەیەکەوە کار دەکەین. لەکوێیت با بۆت بهێنم من ئێستا لە شاری مۆسم؟

ماکوان: نا من پارەم ناوێت، لە تەلەفونیش ئەو قسانە مەکە تا یەکتر دەبینین، تەلەفونم داخستەوە بەسەریدا، بەڵام ئەو ژمارەیەی کردبووی دیاربوو.

باسەکەم بۆ برادەرەکانم کرد هەموو حەپەسا بوون، تۆ بڵێیت ڕاست بێت، یان فیڵە؟ دیسان تەلەفون زەنگی لێدایەوە وامزانی ئەوە، تەماشام کرد عەلی یەمەنی بوو، وتی ماکوان پێویستە هەواڵێکی ناخۆشت بدەمێ.

ماکوان: خێر؟

عەلی: هاوڕێکەمان کە تۆ بینیوتە کوژراوە و لە ژیاندانەماوە!

ماکوان: حەزقیل!

عەلی: بەڵێ

ماکوان: ئێستا لەکوێیت عەلی؟

عەلی: لە فرێدریکستادم

ماکوان: چۆنت زانی؟

عەلی: شێخ وەجدی پێی وتم.

خوا حافیزی کرد و تەلەفونی داخستەوە.

ماکوان: لاحول ولاقوة الا بالله

عەبدوڵڵا: چی بووە ماکوان؟

سەردار: براکەم کێ مردوە؟

سەرحەد: رەفیقمانە تا تەعزێی بۆ دابنێین؟

دەوەرە چیان بۆ باس بکەم چییان پێ بڵێم؟ بڵێم کێ مردووە؟ خۆشم تاسابووم نەمدەزانی باسی چی بکەم، هیچم نەووت.

بۆ سێیەم جار تەلەفونەکەم زەنگی لێدایەوە، ئەم جارەیان سەیران خان بوو، وتی ماکوان ئاگاداربە هێرۆ لە نەخۆشخانە ڕایکردووە! ئەم جارەش وتم: لاحول ولاقوة الا بالله.

سەردار: کاکە شێت بووم چییە؟

## فرتوفێڵی شەیتانی جنۆکە و شەیتانی مرۆڤ بەیەکەوە

لەدوای ئەوەی باسو خواستەکانمان لەگەڵ هاوڕێکانم چڕ کردەوە لەسەر کەبالا و زەردەشتی و ثیۆصۆفی.. هتد. سێ تەلەفون کرا لەلایەن ئەندریاس و عەلی یەمەنی و سەیران خان.

بەهاوڕێکانم وت: وەرن با شیکارییەکی بابەتیانە بکەین.

ئەندریاس دەیەوێت پارەیەك لای من بخەوێنێت بۆ ئەوەی پێکەوە کاری دەرمان فرۆشتن بکەین.

عەلی یەمەنی هەواڵی پێدام کە هاوڕێکەمیان کوشتووە ناوی عەبدوڕەحمان حەزقیلە، پێشتر لەگەڵ ئەم گروپەدا کاری کردووە.

سەیران خان هەواڵی داینێ کە هێرۆی خوشکەزای ڕایکردووە چی بکەین باشە؟

سەردار: چیت پێ باشە وادەکەین.

سەرحەد: حەقمان چیە بەسەر هێرۆ وە، بە نیسبەت ئەو برادەرەشت کوژراوە، ئەگەر دەڵێیت دەچین تۆڵەی دەکەینەوە. ئەو هەتیوە پیسە نەرویجیەش ئیهمال کە.

عەبدوڵڵا: من دەڵێم بڕۆینە لای ئەندریاس و پارەکەی لێوەرگرین و هێرۆش لەوێ دەبینین تەسلیمی نەخۆشخانەو کەسوکاری دەکەینەوە، بۆ ئەو کاك

عەبدوڕەحمانەش چی دەڵێن من ئامادەم. حەق کردنەوە دەڵێن سوڵح دەڵێن من لەخزمەتاندام.

ڕێبوار: من پێم باشە پەیوەندی بە پۆلیسەوە بکەین و هەموو ڕاستییەکانیان پێ بڵێین، ماکوانیش لەو ڕەوشە ڕزگاری بێت.

ماکوان: ئێوە دەزانن عەبدوڕەحمان حەزقیل کێیە؟

عەبدوڵڵا: حەتمەن عەرەبە.

جەماعەت وتیان نازانین.

ماکوان: جنۆکەیەکی رەفیقی من بوو، ئەو بوو منی ئازاد کرد لە بن دەستی جەماعەتەکەی ئەندریاس، بڕوا دەکەن؟

هەموو حەپەسابوون بەدیارمەوە.

سەرحەد: توخوا پێمان ڕادەبوێری؟

ڕێبوار: ئەرێ کاکە ئەم هەموو شتە عەجیب و غەریبە چییە لای تۆوە دەردەچێت؟ ماکوان بۆ خاتری خوا.

عەبدوڵڵا: بابڕۆین ئەو دوو ملیۆنە بهێنین، ئێمە ئەندریاس دەکوژین لە تۆڵەی ئەو برادەرە جنۆکە.

ماکوان: سەردار تۆ دەڵێی چی؟

سەردار: تۆ چی دەکەی من لەگەڵتم، سەرم لە هیچ دەرناچێت بەس تۆ چی دەڵێیت من ئامادەم.

پلانم دارِشت و بۆم باس کردن کە چی دەکەین، کەوتینە رِێ بەرەو شاری مۆس.

لەرِێگادا تەلەفونم کرد بۆ ئەندریاس و پێم وت: ئەدرەسەکەتم بدەرێ بابێمە لات.

بۆ داوای ئەدرەسم کرد بۆ ئەوەی من بچمە لای تا بزانم لە ماڵدایە یاخود لە کوێدایە، تا بە ناڤیگراشون و سسیتەمی گوگل جێگاکەی بدۆزمەوە.

ئەو ناونیشانەی کە دابووی شوقەیەك بوو لەو شارە لە قاتی چوارەم کە زانیم شوقەیە ناو شارە، کەواتە هیچ شتێکی ترسناك لەوێدا رِوونادات.

کەنزیك جێگاکە بووینەوە وتم تەنها گڵۆپی ناوەوە داگیرسێنن بۆ ئەوەی بزانێت ٣ کەسن.

ئەندریاسم بانگ کرد هاتە خوارەوە بە کۆڵە پشتێکەوە، وتی وەرن برِۆینە سەرەوە بۆ لای من.

وتم: نا ئەوە ماڵی کێیە؟

ئەندریاس: ئەوە ماڵی خۆمە کرِیومە، کەس نازانێت ئەوەم هەیە.

ماکوان: هێرۆ پەیوەندی پێوە نەکردوویت؟

ئەندریاس: نا ئەی تۆ نەترِفاندوە؟

ماکوان: با، بەڵام ڕای کردووە.

ئەندریاس: ئاسانە ئێستا بۆت ئەدۆزمەوە، بەڵام پێم بڵێ ماکوان حەزت لە هێرۆیە؟

ماکوان: زۆر، ئیتر تۆ ناچیت بەلایدا، بزانم لەگەڵی بخەویت کەلەت ئەتەقێنم.

ئەندریاس: ئیتر من کاری واناکەم.

ماکوان: باشە ئەو ڕۆژەی پەیوەندی پێوە کردی، نەتزانی چۆن تەلەفونی موستەفای دەستکەوتوە؟

ئەندریاس: من ئەوەندە دەزانم بە ژمارەی ئەو موستەفایە کردی، دەنا نازانم موستەفا کێیە.

ماکوان: باشە بابڕۆین، لە کوێن؟

ئەندریاس: دەچێتە ماڵی ئافرەتێك ناوی ماریتایە لەوێ دادەنیشین، ئافرەتێکە بۆ دکتۆرێك کاردەکات دکتۆرەکەش ناوی ئەلفرێدە خەڵکی بەریتانیایە، بەڵام دەمێکە لە نەرویج دەژی.

ماکوان: هەموو بەیەکەوەن؟ لە گروپی سەگی رەشن؟

ئەندریاس: نا- ئێمە دەچینە ئەوێ دادەنیشین و هێرۆ هەندێك ئافرەتی تر هەیە خەڵکی تایلەند و فلیپین و ڕووسیا و لیتوانیا بۆ ئێمەی دێنن بە پارە ئێمەش لەگەڵیاندا ڕادەبوێرین بە پارەو زۆر جار بە دەرمان.

ماکوان: کێ سەرپەرشتیان دەکات؟

ئەندریاس: من سەرپەرشتیان دەکەم لەگەل ئەلفرید، بەس ئەو کەمتر دێتە ئەوێ، لە عەیادەی خۆی کار دەکات، جێگاو کاری تایبەتی خۆی هەیە.

ماکوان: واتا گەوادیشی تۆ نەرویجی ئەصلیشی؟

ئەندریاس: بە پێکەنینەوە.. بەڵێ، ئەی چۆن.

هەڵبەت لە ئەوروپادا ئەو کارە بە بزنس هەژمار دەکرێت، ئەوەی کە کاری گەوادی دەکات لە ناو خەڵکیدا خۆشەویستەو ئیحترامی زۆر دەگرن لەبەرئەوەی ئافرەتی بەدەستە.

ماکوان: ئەم ئافرەتانەت چۆن دەست دەکەوێت؟

ئەندریاس: هەندێکیان دەکڕم بە پارە لە باندەکانی ئەوروپای شەرقی و هەندێکیشیان بە ڤیزە دەیانهێنین لە ئاسیاوە بەناوی کارەوە بۆ ئێرە، بۆ خۆیان دەبنە لەشفرۆش ئیتر کار دەکەن. پارەکەیان خراپ نیە، هەندیکیان ڕادەکەن و هەندێکیان دەمرن و هەندێکیشیان بەردەوامن لەکارکردن.

ماکوان: ئەی هێرۆت چۆن والێکردووە، ئەو پێویستی بەهیچ نەبوو؟
ئەندریاس: شەوێکیان لەگەڵ ئەو فارسانەدا هاتبوون کە ئێستا لە زیندانن سەمایەکی زۆر جوانی کرد، ئیتر من خۆم حەزم لێکرد. چەند جارێك دەرمانم دایە بەخۆڕایی تا موعتادم کرد، ئێستا ناتوانێت لێم جیابێتەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە بۆ تۆ ماکوان، دیاری منە بۆ تۆ سەماکەشی زۆر جوانە. هەندێ قسەی تریشی کرد.

یەك تۆزی مابوو بکێشم بەدەمیدا، بەڵام هەرچۆن بوو دانم بەخۆدا گرت و بێدەنگ بووم.

ئەی دکتۆر ئەلفرید بۆچی لەگەڵ ئێوەدایە؟ دەرمانتان بۆ دروست دەکات؟ واتا جۆری مادەکان تێکەڵ دەکات تا بیفرۆشن؟

ئەندریاس: نا - ئەو کابرایە زۆر ترسناکە، کەس ناتوانێت لە ڕوویدا بوەستێت...

ماکوان: بۆ؟

ئەندریاس: ئەو مێشکی مرۆڤ تێکەڵ دەکات.

ماکوان: چۆن؟

ئەندریاس: خەریکی کارێکە بۆ گروپەکەمان زۆرێك لە خەڵکی دروست دەکات بۆ ئێمە کاری پێدەکەین، هەندێکی لێرە بەکار دێنین هەندێکی لە وڵاتانی تر.

ماکوان: واز لە بەکارهێنانەکە بهێنە دەرمانی پێدەفرۆشی خەڵکی پێدەکوژیت... هتد. ئەوە دەزانم وکێشەی من نیە، بەڵام ئەوە نازانم چۆن دروستیان دەکات؟

ئەندریاس: قسە بکەم ئاساییە، چاوی خستە سەر سەردار.

ماکوان: ئاساییە خۆمانە.

ئەندریاس: ئەم کابرایە خەڵکی دەڕفێنت بە ئەقڵی. بۆ نمونە ئەگەر کەسێك تووشی لەبیر چوونەوە بوبێت بەهۆکاری هەر ڕووداوێک بێت، ئەم هەوڵی لەگەڵ دەدات ڕابردوویەکی بۆ دروست دەکات وەک ئەوەی خۆی بیەوێت، تا هەرکارێکی بوێت بۆی ئەنجام بدات. بۆ نمونە کەسێکی هێنابوو تووشی لەبیر چوونەوە بوبوو بەهۆکاری ئەوەی کە بینایەکی بەرز کەوتبووە خوارەوە، ئەم هێنای بەئارەززوی خۆی کەسایەتیەکی بۆ داڕشت و پێی وت کە کەس وکاری لەلایەن کەسێکەوە کوژراون و خۆشی بەدەستی ئەو وای لێ هاتووە، ناردی کەسەکەی کوشت کە دوکتۆرێک بوو هاوکاری خۆی، بەڵام ڕازی نەبوو بەو کارەی کە ئەلفرێد دەیکرد، بۆیە ترسا ئاشکرای بکات بۆیە کوشتی. چەند کەسێکی ترمان هەیە کە لەڕووداوی هاتووچۆ تووشی فەرامۆشی بوون لە وڵاتانی تری ئەوروپییەوە هێناونی مێشک وبیری هەموویانی داڕشتۆتەوە بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت، کەسایەتیەکی تری پێدروست کردوون وە دەرمانیشیان دەداتێ بۆ ئەوەی بیر لە ڕابردوو نەکەنەوە تا بیریان نەکەوێتەوە کە کێ بوون.

ماکوان: واتا مێشکی ئەسڕێتەوە دوایی بە ئارەزوی خۆی کەسایەتی بۆ دروست دەکات، جا ئەوە چۆن دەبێت؟

ئەندریاس: جاری واهەیە دەڵێت: تۆ فڵانە کەس باوکی کوشتویت، یان تۆ ساحیری، یان بۆنمونە تۆ پیا وچاکێکی و.. هەروەها.. واتا رابردووی کەسەکە ئەشواتەوە و خۆی رابوردوویەکی بۆ دروست دەکات، تێگەیشتی ئێستا؟

ماکوان: تێگەیشتم! ئەوە ئیشی مۆساد و زیاتریش کاری ماسۆنییەکانە، کەواتە تۆ ماسۆنیشیت؟

ئەندریاس: نەگەیشتومەتە ئەو پلەیە.

ماکوان: ئەی کێ ناڵێت تۆشی وا لێنەکردووە؟ ئەزانی باوک و دایکت کێیە؟

لەگەڵ ئەوروپی ئەو گفتوگۆیانە سادەیە ئاساییە و دەکرێت، ڕاشکاوانە قسە دەکریت، کەمتر موجامەلەی یەکتر دەکەن.

ئەندریاس: نا - بڕوا ناکەم، چونکە ئەزانم دایکم کێیە و نەنك و باپیریشم هەیە، بەڵام نازانم باوکم کێیە.

دایکم دەڵێت نەمساوییە. جارێك چووە بۆ نەمسا شەوێك لەدیسکۆ لەگەڵ نەمساییەکدا ڕایبواردووە من لەدایك بووم! چەند جار وەڵامی بۆ ناردبوو کە بێت من ببینێت نەهاتبوو. منیش لە مێشکمدا وجودی باوکایەتی نیە، ڕقم لە هەرچی باوکە.

ماکوان: باشتر خەمێک کەمتر، ئەگەر بتزانیایە باوکت کێیە دەبو خەمی ئەویش هەڵگری بێ باوکی باشترە، باسی دکتۆر ئەلفریدم بۆ بکە.

ئەندریاس: وەك وتم ئەو خەریکی ئەو جۆرە کارانەیە.

ماکوان: هیچ نمونەت لایە؟

ئەندریاس: ئەو کوڕەی کە هاتە لات ئەو کاتەی لای ئێمە بوویت. ویستی جگەرەیەکت بداتێ، ئەوە لەو جۆرانەیە لە ڕووداوێکدا سەری ئازاری پێگەیشتبوو تووشی فەرامۆشی بوبوو، لای خۆی چارەسەری کرد هەموو مێژووی سڕیوەتەوە ئێستا کردوویەتی بە پیاوکوژی خۆی، ڕقی لە دکتۆرێك بوو .. ئەم کوڕەی بوو ناردی دوکتۆرەکەی پێ کوشت، پێی وتبوو کە ئەو

دوکتۆرە هەموو زاکیرەی تێکداویت و ژنەکەت و دوو منداڵی کوشتوویت، لە کاتێکدا ئەو کوڕە ژن و منداڵی هەر نەبووە!

گەیشتینە جێگای مەبەست.

ماکوان: بڕۆ بزانە لە وێیە؟

ڕۆیشت و پارەکەی لە جێگای خۆیدا جێهێشت، خێرا من و سەردار تەماشامان کرد پڕ بوو لە پارە، وتم لە جێگای خۆیدا بۆی دانێنەوە.

پاش کەمێکی پێچوو تەلەفونی بۆ کردم وتی لێرەیە بۆم نایەتە دەرەوە، خۆت وەرە بۆلای.

کەچووم ئەوەی من بینیم یاخوا کەس نەی بینێت، سۆزانیخانەیەکی تەواو بوو، بۆنی حەشیش و مەریوانە و دەرزی هێرۆین و هەموو جۆرە کەرستەیەکی نەشیاوی تێدا بوو.

هەر چوومە ژوورەوە ئەندریاس بیرەیەکی بۆ من و سەردار هێنا، وتمان ناخۆین من سەیارە لێدەخورم ئەویش وتی منیش پاش کەمێکی تر سەیارە لێدەخورم. چوومە لای هێرۆ پارەی پێنەبوو ئەپاڕایەوە لەو نەرویجییانە کە دەرزیەکی هێرۆینی بۆ بکەن.

داوای ١٢٠٠ کرۆنیان لێدەکرد ئەویش پێی نەبوو، ئەگریا و دەچووە باوەشی هەموویان کەس ڕووی نەئەدایە، چونکە کارتی پارەکەیان لێسەندبوو.

چۆن گەیشتبووە ئەو ماڵە نازانم، بەڵام من دڵم پڕبوو بۆی.

سەردار وتی کاکە من پارەکەی بدەمێ؟

ماکوان: نا پێویست بە پارە ناکات ئێستا پێیان دەکەم بەس با تەلەفونێك بکەم.

تەلەفونم کرد بۆ سەیران خان و پێم وت دۆزیومەتەوە لە جێگایەکە دەتوانم بەزۆر بیهێنمە دەرەوە، بەڵام پێدەچێت تووشی کێشەمان بکات. مەگەر پارەی دەرزییەکی بدەمێ و بەم جۆرە بیهێنمەوە، بە دکتۆرەکان بڵێ ئاساییە؟

سەیران: کاتم بدەرێ، خێرا وەڵامت لێدەگێڕمەوە.

ماکوان: فەرموو.. پاشان چووم بۆ لای هێرۆ، وتم من پارەت بدەمێ دەرزیەکەت بۆ بکەن دوایی لەگەڵ مندا دێیتەوە؟

هێرۆ: دەستی کرد بەگریان بەس توخوا لای کەس باسی مەکە.

ماکوان: ئەو پەیمانە نادەم، دڵنیابە بۆ دکتۆرەکانتی باس دەکەم. بەس دڵنیابە بۆ موستەفاو سەیرانی باس ناکەم.

هێرۆ: دە پارەکەم بدەرێ.

ماکوان: پێویست ناکات پارەت بدەمێ، ئەمانە هەموو بۆ من کاردەکەن.

هێرۆ: بەڕاستە؟

ماکوان: بە توڕەییەوە بانگم کرد لە ئەندریاس و تۆزیك خۆم فش کردەوە بەسەریدا و وتم چی دەوێت بۆی بکەن.

ئەندریاس: زانی تورەم، وتی بە جەماعەت بزانن خۆشەویستەکەی گەورەمان چی دەوێت (مەبەستی من بوو، گوایە هێرۆ خۆشەویستی منە).

دەرزیان بۆ کردو ٢٠ خولەکێك بیهۆش بوو، من زۆر ترسام نەمزانی ئەو حاڵەتە ئاساییە، تورە بووم وامزانی شتێکی لێهاتووە، ئەندریاس بە ئاسانی وتی ئاساییە ئەوە هێرۆینە هەر ئەوەندەی پێدەچێت.

لەڕاستیدا ئەو زانیارانەم نەبوو، بەڵام لای ئەوان وتم خۆشەویستیەکەی وای لێکردم هەموو شتێکم لەبیر بچێتەوە، لە کاتێکیشدا هێندەی سەگێك ڕقم لێی بوو، لەهەمانکاتیشدا بەزەیم پێدا دەهاتەوە.

سەیران تەلەفونی بۆ کردم وتی: دکتۆرەکان وتویانە ئاساییە، بەڵام هەرچی کردووە بیهێنیتەوە بۆ نەخۆشخانە.

ماکوان: باشە وەرە لەوێ لێم وەربگرن با ئێمە نەیەینە لای دکتۆرەکان.

هێرۆمان خستە ناو سەیارەکەو بردمانەوە بۆ نەخۆشخانەکە، ئەومان بە جێهێشت کاتی نوێژی مەغریب بوو داوامکرد لە سەردار و هاوڕێکانی ترم بچینە ماڵی ئێمە نوێژەکانمان بکەین ئەمەش بەرین لەگەڵ خۆماندا، ناچار بووین چووینە ئەوێ و هەموو نوێژمان کرد سەرحەد و ئەندریاس نەبێت.

دوای تەواو بوونمان ئەندریاس پارەکەی دەرهێنا و وتی ئەوە دوو ملیۆنەکەیە.

من ئامادەم قسەی خۆم بەرمە سەر، موشتەریەکانمان چاوەڕێ دەکەن ئێنەرجیان بدەینێ و دەستکەین بە دابەش کردن.

نەمدەزانی چۆن خۆم لەو وێستگەیە ڕزگار بکەم.

ئەگەر ڕاستی بڵێم دەترسم، دوایی خەڵکی ترم بۆ کۆبکاتەوە دیسان شەڕم پێبفرۆشێت.

خۆ ناکرێت دەست بکەم بە دەرمان فرۆشتن، ئەترسام لەوەی ئەم کوڕە چاوی پۆلیسی لەسەر بێت و منیش لەگەڵیدا بگیرێم حەیاو شەرەف و کەرامەتم بڕوات، لەپاشانیشدا کەس بڕوای پێنە دەکردم.؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

(سبحان الله) گیرم کردبوو ئەترسام لە ڕۆحی ئەو کوڕانەی لەگەڵمدان، عەبدوڵلا دەیووت ماکوان بابیکوژین و پارەکەشی دەبەین و لەناوبردنیشی لەسەر من، ئەمانە نەرویجین کەسیان نییە خۆ خاوەن عەشرەت نین لەچی دەترسین.

ماکوان: لە خوا.

منیش حەزم بە خوێنڕێژی نیە، ئەوەندە پارەم بەلاوە گرنگ نیە، نە ئەوەندەش ژیان بەلامەوە گرنگە، بەڵام ماڵو منداڵم زۆر لا خۆشەویستە ئەوان دەستی منیان بۆ زۆر شت بەستووە.

چی بکەم، خوایە چیبەکەم؟

ناچار وتم: ئەندریاس دوای ئەوەی لەسەروو خۆمەوە بەمنیان ڕاگەیاندووە کە تۆ ناتوانیت بێیتە ناو ئێمەوە، دەبێت بۆ خۆت کار بکەیت، بەڵام ئەتوانین هاوکاریت بکەین، تۆش هاوکاری من بکەیت ئەگەر پێویستمان بەیەکتر بوو.

ئەندریاس: بەڕاستە، پێم ناخۆشە. بەس ماکوان دەتوانیت بمپارێزی؟

چەندم پارە لێدەستێنیت ئێستا؟

ماکوان: هیچ، پارەی تۆمان پێویست نیە.

عەبدوڵڵا شێت بوو، ئاگام لێبوو خەریك بوو بۆم هەڵسێت.

ئەندریاس: نابێت، من هەر ٥٠٠ هەزار دادەنێم.

ماکوان: پارەمان ناوێت.

سەردار: وەریگرە و ئەیدەینە ماڵە شەهید و ئەنفالەکان.

ماکوان: پارەکە حەرامە، خوێنی خەڵکە بۆ خاتری خوا با وەرینەگرین.

سەرحەد وەریگرە و دەیدەینە کۆمیتەی شەهیدان.

عەبدوڵڵا: ئەیدەینە مەکەتبی شەهیدان.

کۆمیتەو مەکتەب هی پارتی و یەکێتی بوون.

## سەسیل و شەڕی هێرۆ

هەرچەندە هاوڕێکانم جەختیان لەوە دەکردەوە کەوا پارەکە وەرگرە ئەیدەنە ماڵە شەهیدو ئەنفالەکان، بەڵام ڕازی نەبووم، چونکە ئەو پارە حەڕامە، حەڕام ناکرێتە خێر. ناکرێت ئێمە ببینە ڕۆبن هود، پارە لە خەڵکی بدزین و بیدەینە هەژاران. ئێمە مۆم نین بۆ ڕوناکی بتوێینەوە خۆمان بسوتێنین.

ئەندریاس ڕۆیشت و هیچ پارەم لێوەرنەگرت پێم وت: دوایی قسە دەکەینەوە! پرسیاری ئەوەشم لێکرد سەیارەکەت چی بەسەرهاتووە؟

ئەندریاس: سۆپەر بیمەم هەیە، بێخەمبە سەیارەیەکی نوێم بۆ دێنن.

ماکوان: چیت وتوە، بە بیمە؟

ئەندریاس: خۆم هەموویم حەل کردووە خەمت نەبێت، وتومە دز وای لێکردووە.

ماکوان: باشە ئەو پارەیە سەیارەیەکی نوێ پێبکڕەو دیاری منە بۆ تۆ، من پارەم ناوێت.

ئەو ڕۆیشت و ماڵئاوایمان لێکرد.

عەبدوڵڵا: کاکە وەڵڵا وانابێت، دەبوو لێت وەربگرتایە.

ماكوان: عەبدوڵڵای برام ئێمە مافیاین؟ ئەگەر وا كار بكەین ئەی خواناسیمان، ئەی قیامەتمان، ئەی ڕێزو حورمەتمان، ئەی ئەو هەموو قسە زلەی كە دەیكەین. كاكە گیان خۆ دەبێت جیاواز بین لە خەڵكی تر، ئێمە هەر ئەوەندە بڵێین موسڵمانین. كە شتی حەڕاممان دەستناكەویت بڵێین حەڕامە كە دەستیشمان كەوت بڵێین ئاساییە حەڵاڵە؟ ئاخر براكەم وانابێت، من وتۆ هاوڕێیەتیمان و برایەتیمان كەی لەسەر پارەیە، ئێمە گیانی خۆمان پێشكەش بەیەك كردووە، پارە چییە؟

سوپاس بۆ خوا قسەی نەكردو عەبدوڵڵا بەپێكەنینەوە وتی: خۆت برا گەورەیت.

ڕێبوار: بەقسەی من بكە ماكوان، با بڕۆین ڕاستییەكان لای پۆلیس بدركێنین و هەموو شتێك بڵێین. دڵنیابە من ناترسم و ترسیش لەدڵمادا نییە، خۆشت من باش دەناسیت! بەڵام هەست دەكەم بۆ تۆ باش نییە! ئێمە گەیشتووینەتە بنجوبناوانیان با بە پۆلیس بڵێین. لە ڕووی ئەمنیشەوە بۆ تۆ باشترەو سومعەی تۆش پارێزراوتر دەبێت. من یەكەم شاهیدیش دەبم بەیەكەوە دەچین.

سەرحەد: ئیهمالیان كەن هیچ نییە، ئەوانە زیرەیان كردووە.

بەڵام من قسەكەی ڕێبوارم زۆر پێ پەسەند بوو، ڕازی بووم بەوەی بڕۆم سكاڵا تۆمار بكەم، وتم چەند كەس لەگەڵمدا دەبێت بڕۆین بۆ پۆلیس و شاهید بێت لەسەر وەزعەكە چیمان كردووە دەیڵێین؟

من و سەردارو ڕێبوار ئامادە بووین، عەبدوڵڵا منجەمنجی بوو. سەرحەد ڕازی نەبوو.

پێشنیارم کرد کە تەنها ئێمە وەک سێ کەس لەم کارەدا بووین ئەوەشی رازی نیە من پێڵاوەکانی دەخەمە سەر سەرو سەرچاوم، وەک ئەوە وایە هیچ رووینەدابێت و لەگەڵماندا نەبووبن، هەر باسیشی ناکەین.

عەبدوڵڵا: کاکە منیش ئامادەم، لەگەڵتان بووم تاکۆتایش لەگەڵتان دەبم.

سەرحەد ڕازی نەبوو وتی: من دەڕۆم ئێوە بۆ خۆتان بڕۆن.

ئێمە هەڵساین بڕۆین سەرحەدیش گەڕایەوە و ئەویش ڕازی بوو، پاشان هەموو قسەمان کرد بەیەك.

ئیحتمالی ئەوەمان دانا کە هەریەکەمان بەجیا جیا قسەمان لەگەڵ بکەن بەهەرحاڵ چووین و لە پۆلیس من یەکەم جار قسەم کرد، کەسێك هاتە لامان و باسی ئەوەم بۆ کرد کە ڕوویداوە. بەهەندێك گۆڕانکاری بۆ ئەوەی هیچ کارێکی یاسایی لەسەر هاوڕێکانم نەکەوێت. هەرچەندە پۆلیس ئەوەندە گرنگی پێنەدا و ئێمەش ئەوەی لەسەرمان بوو کردمان وەك کارێکی ئەخلاقی و مرۆڤدۆستی بۆ ئەوەی خەڵکی لە شەڕیان ڕزگار بکەین.

دوای ئەوە لە پۆلیس هاتینە دەرەوە خوا حافیزیمان لەیەکتر کردو کۆتاییمان بە دانیشتنمان هێناو هەریەکە چووینەوە سەر کارو کەسابەت و ماڵی خۆمان.

ماوەی هەفتەیەکی پێچوو پەیوەندیم بە کاك موستەفاوە کرد بۆ هەواڵ پرسین، پێی وتم کەوا هێرۆ بەتەواوەتی تێك چووە، زۆر وەزعی خراپە.

منیش وتم چاک دەبێت و تەلفونمان داخستەوە.

لە دڵی خۆمدا وتم کورە چاوی دەرێ، موستەحەقە لەوە خراپتری لێببێت.

دەمێك بوو نەچوو بووم بۆ مزگەوتی شارەکەی خۆمان ئەو ڕۆژە وتم نویژی عەسر لە مزگەوت دەکەم هیچ ئیشم نیە.

بەرەو مزگەوت کەوتمەڕێ، تەماشا دەکەم عەلی یەمەنی قورئان دەخوێنێت سەلامم کرد و دەمێك بوو یەکترمان نەدیبوو، وتم اخی العزیز لەسەر وەزنی ئازیز چۆنی براکەم؟

باوەشمان کرد بەیەکدا، دوای نویژ لە مزگەوت دانیشتین و دەستمان کرد بەقسەو باسەکانمان، ئەوەم لێپرسی چۆنت زانیوە عەبدوڕەحمان حەزقیل کوژراوە؟ شێخ وەجدی نەیوتوە چۆن کوژراوە هەواڵەکە چۆن هاتووە؟

عەلی: شێخ وەجدی وتی کە گوایە لەکاتی سەفەرکردنیدا زەفەریان پێبردوە شەیتانەکان و کوشتویانەو هەردوو منداڵەکەشیان کوشتوە، بەڵام تۆڵەیان سەندۆتەوە، دیاریەکی بۆتۆ داناوە بە هاوڕێکانیا ناردویەتی بۆلای شێخ وەجدی لەلایەن ئەوانەوەیە؟

ماکوان: چیە دیارییەکە، نازانیت چییە؟

عەلی: نازانم چییە، هیچی پێ نەووتوم.

ماکوان: خوا عەفوت بکات، چۆن ناپرسی چییە؟ ئاخر خەڵك دیاری بۆ بێت لە مرۆڤەوە خۆی ناگرێت خێرا دەبێت بزانێت چییە، دیاری لە جنۆکەوە بێت؟

ئەگەر بەردیش بێت هەر خۆشە بزانم چییە، بەردێکیش بێت ئەوە هەروا شتێکی ئاساییە نیە.

عەلی: دەی چی بکەم پێی نەووتوم.

ماکوان: ئەوە تەلەفونی من، تەلەفون بکە بۆ شێخ وەجدی بزانە چییە؟ خۆم بلیت دەبڕم دەچم بۆ یەمەن دەیهێنم.

عەلی: ئاخر پارە زۆر دەبات.

ماکوان: کێشە نییە بیکە.

تەلەفونی کرد هەر هەڵینەگرت، من خەریك بوو دڵم شەقی دەبرد. زیاد لە دەجار تەلەفونی بۆ کرد.

بەهەرحاڵ هیچ هیوایەکم نەما، پێم وت هەرچیت کردووە با قسەی لەگەڵ بکەین، عەلی: باشە.

عەلی: ماکوان ئازیز شووی کرد؟

ماکوان: نەوەڵڵا شووی نەکردووە، هەموو شەوێ خەوت پێوە دەبینێ ئەڵێ بە عەلی نەبێت شوو بەکەس ناکەم! (بۆخۆشی وام وت ) لەبیریکە ئەمە چەند جار پێت بڵێم.

عەلی: کێشە نیە گاڵتەم پێبکە، ماکوان کوردی تۆ بهاتیتایە بۆ یەمەن ژنم بۆ دەهێنایت.

ماکوان: اخ عەلی ئاخر ئەمە دوکان نیە تۆ پێپسیەکم بۆ بکرێت منیش کۆکا کۆلایەکت بۆ بکڕمەوە، کچ لێرە خۆی بڕیار ئەدات.

عەلی: بەتەمام کچێکی سۆماڵی بێنم، ئەگەر ئەو شووم پێنەکات با ئەو کچە بهێنم.

ماکوان: لەسەر من بڕۆ بیهێنە، ئازیز دڵی عاجز نابێت.

عەلی: باشە تۆ پێی بڵێ.

ماکوان: باشە بەسەر چاو.

لەم قسانەدا بووین سەیران خان تەلەفونی بۆ من کرد وتی: ماکوان .. هێرۆ داوای تۆ دەکات، دەستم ماچ دەکات دەڵێت با ماکوان بێت بۆ لام.

ماکوان: سەیران خان بەخوا بۆم ناکرێت مەشغوڵم، دەمزانی کە داوای پارە یان دەرمان لەمن دەکات، ئەوەندە بێ ئەقڵە هێرۆ وادەزانێ من ئەو کارە دەکەم، ئاگام لێبوو سەیران خان پێی ناخۆش بوو.

پاش کەمێکی تر کاك موستەفا تەلەفونی کرد: ماکوان ئەو کچە داوات دەکات بزانە چییە؟

عەرزی کاک موستەفام کرد، بەخوا حەزم بەسەروچاوی نیە نامەوێت بیبینم، جا راستت دەوێت من خۆمی لێدەشارمەوە.

موستەفا: ماکوان بڕوا بکە زۆر گوناحە، دایکی یەکجار سەردانی کردووە لە نەخۆشخانە و براکەی هەر نەچووە بەلایدا، تەنها سەیرانە لە ڕای خوا

دەچێت بۆ لای، من جارێك سەردانم کرد بەخوا دەستم کرد بەگریان بۆی. مادام داوات دەکات بڕۆ بۆلای لەبەر خوا.

ماکوان: من دەزانم بۆچی داوام دەکات بۆ ئەوەی پارەی بدەمێ یان دەرمانی بۆ پەیدا بکەم، ئەوەش بەمن ناکرێت.

موستەفا: بڕوا ناکەم ئەوە بێت، خۆت دەزانی بەس بەقسەم بکە بڕۆ.

ماکوان: لەبەر دڵی تۆ دەچم بەس ئەمڕۆ نا لە مەجالێکی تردا. لەگەڵ عەلی خوا حافیزمان کرد و هاتمەوە بۆ ماڵەوە. بۆ بەیانی پۆلیس تەلەفونی بۆ کردم وتیان ماکوان تا بنکەی پۆلیس وەرە.

ماکوان: ئێستا؟

داوایان کرد هەر ئێستا ئەگەر لە کار نیت.

ماکوان: نا لە کارنیم هەر ئێستا دێم!

کەچووم دووکەس چاوەڕێیان دەکردم لە رێسێپشنەکە، تەعاروفمان کردو منیان بردە ژوورێك و وتیان قاوە ناخۆیتەوە؟

ماکوان: نەخێر، سوپاس

پۆلیس: دەزانی بۆ چی بانگمان کردوویت؟

ماکوان: نەخێرا

پۆلیسەکان دەستیان کرد بە قسە کردن و وتیان: ماوەی چەند مانگێکە چاومان لەسەر تۆ داناوە ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوت و چالاکییەکانت بووین، لەگەڵ هاوڕێکانت لە ئۆسلۆ و لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە پەیوەندیتان هەبووە!

ئاگاداری ئەوەش بووین کەچۆن خەڵکت کۆکردۆتەوە و شەڕت لەگەڵ گروپی ئەندریاس و دکتۆرەکەدا کردووە، ئاگاداری ئەوەشین کە تۆ سەیارەکەی ئەندریاست خراپکردووە!

ماکوان: ئەی ئاگاداری ئەوە بوون کە چۆن لە منیان داوە و ئازاری منیان داوە؟ ئەی ئاگاداری ئەوە بوون کە منیان ڕفاندوە؟ ئایا چاوەڕێی ئەوە بوون بمکوژن؟

پۆلیس: بەڵێ ئاگادار بووین.

ماکوان: کەواتە ئێوەش لەگەڵ ئەواندا لە تاواندا بەشداربوون! جیاوازی ئێوە و ئەوان چییە؟

پۆلیس: بە پێکەنینەوە.. نا بەو شێوە نیە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە، ئەو کەسەی کە سپرای کردووە بەتۆدا لەگەڵ ئێمە کار دەکات و ئەو تۆی پاراستوە، بەڵام ئەوەی کە ئێمە سەرمان لێدەرناچێت کێ تۆی کردۆتەوە ئەو شەوە؟!

ئەوە ئێستا بۆ ئەوە بانگمان کردوویت، کە سوپاست بکەین لەگەڵماندا ڕاستگۆ بوویت و لەهەمانکاتیشدا دەبێت سزای ئەوەت بدەین (بە پێکەنینەوە) کە سەیارەکەی ئەندریاست خراپکردووە.

ئەوە بەخشیمانیت لە ئێمەوە، بەڵكو باشترین شانست هەبوو كە خاوەن سەیارەكە هیچ سكاڵایەكی لەسەرت تۆمار نەكردووە. هەرچەندە ئێمەش دەزانین، بەڵام خۆش بەختانە ناتوانین هیچت لەگەڵ بكەین و ئەوەش سوپاس نامەیە كە ئێمە هیچمان لەسەر ئەو دكتۆرە ساختەچییە نەدەزانی تۆ زانیاریت داینێ، دووبارە سوپاس بۆ هاوكاریەكەت.

ئەو دوو ملیۆنەی كە باست كرد لە ٢٠٪ ی بۆ تۆیە، وەك دیاری لەئێمەی وەرگرە، لەبەر چاوی پۆلیسەكان سوجدەی شوكرم برد و بەخۆشحاڵییەوە هاتمە دەرەوە، چونكە دڵنیا بووم كە ئیتر ڕزگارم بووە لەو باندە. ئەوەندەی تریش ئاسودە بووم كە پۆلیس ئاگادار بووە.

پاشان وەك ئەركێكی قیامەتی و ئیسلامەتی وتم دەچم بۆ لای ئەو كچە لەبەر خوا و پاشان لەبەر خاتری كاك موستەفا و سەیران خان، بەرەو نەخۆشخانە كەوتمەڕێ كەچوومە لای سەیران و هێرۆ ئەوەی كەدیم تەنها جومجومە بوو لەوانەیە ئەو كچە ٢٠ كیلۆی كەم كرد بێت لەو ماوەیەدا كەنەمدیبوو، پێستی بە ئیسقانەوە نووسابوو بەڕاستی كە بینیم زۆر خەفەتم خوارد.

ماكوان: سەیران خان ئەوە بۆ وای لێهاتووە؟

سەیران: ماكوان گیان شەوان قسە زۆر دەكات تۆ بڵێی جنۆكەی تێدا نەبێت؟

ماكوان: بڕوا ناكەم ئەمە بۆ خۆی جنۆكە بوو جنۆكە چی دەكات لەلاشەی هێرۆ.

هێرۆ چاوی بەرز کردەوە، قسەی بۆ نەدەکرا پەنجەی ڕاکێشا بۆ سەیران و چاوی داخستەوە.

منیش عەلی بەجوانی فێری کردبووم چۆن جنۆکە دەردەکەیت لەلاشەی مرۆڤدا، دەستم کرد بەخوێندنی ڕوقیە شەرعی و دوعاکانی دەرکردنی جن بەسەر لاشەیدا وئەوەندەم زانی سەسیل لەلاشەی هێرۆ وە کەوتە قسە کردن، سەیران ڕایکردە دەرەوە.

## سەسیل و هێرۆ، دۆزینەوەی کەسایەتی سەسیل

هەرچەندە گومانم لە بێدینی هێرۆ نەبوو، بەڵام وتم قورئانەو دەیخوێنم، بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی بدات. هەرگیز خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو کە جنۆکە لەلاشەی هێرۆدا بێت.

دەستم کرد بە خوێندنی قورئان باروگوزەرانی هێرۆ زۆر نائاسایی بوو بەتەواوەتی تێکچوو، هەڵسایەوە پەلامارم بدات، هەستم کرد کە نیشانەکان- نیشانەی جنۆکەیە، بۆیە بەردەوام بووم لەسەر خوێندنی ڕوقیە شەرعییەکە و جنۆکەیەك دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵمدا.

کە گوێم لە تۆنی دەنگی بوو ناسیمەوە سەسیل ە، سەیران خانی پوری ڕایکردە دەرەوە.

وتم: سەسیل خۆتی وەرە باقسە بکەین، منجە منج مەکە ئەتناسمەوە.

بەردەوام قسەم کرد لەگەڵیدا پێمووت: سەسیل تۆ ناترسی لەخوا، بۆ زوڵم دەکەیت لەم کچە، بۆ ئەوەندە ناحەزی بە مرۆڤ. ئەی نازانیت کۆتایی تۆش مردنە؟ لەدەست خوای پەروەردگار بۆ کوێ دەچیت ؟ تۆ لە کەونی خوا دایت ناتوانیت خۆت بشاریتەوە لە مردن، بۆ ژیانی خۆت تاڵ کردووە بۆ شەیتانێکی مەلعون؟ خۆت دوورخستۆتەوە لە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار.

سەسیل: مژدەیەکی خۆش ماکوان، هێرۆ تووشی ئایدز بووە.

ماکوان: لاحول ولاقوة الا بالله، خۆشحاڵیت؟

سەسیل: هەرشتێك تۆ ئازار بدات من دەیکەم، چونکە زۆرترین زەرەر کە کردومانە بەدەستی تۆ بووە، دەزانی؟

ماکوان: ئەی سوپاس بۆ خوا، بەراستی خۆشحاڵت کردم، پێم بڵێ خۆ تۆ بەتەمابوویت، من بکەیت بەشێخ و خۆت بە ڕۆحانی نیشاندا دەموچاوت زۆر جوان هاتە پێش چاوم ئەوە بۆ دوایی بوویت بە شەیتان؟

وەرە دەرەوە لە لاشەی ئەو کچە داماوە، ئەچینە دەرەوە قسە دەکەین، ئازاری ئەو کچە مەدە، وەك عەرەب دەڵێت ژیان: اخذ و عطاء وەرە بزانم ڕێناکەوین؟

سەسیل: ئەگەر بەیەکەوە ڕێبکەوین هێرۆشت لە نەخۆشییەکانی بۆ چاك دەکەمەوە.

ماکوان: دە وەرە دەرەوە لەلاشەیدا خۆ دەتوانم بە ئایەت بتسوتێنم، بەڵام کارم پێتە وەرە، دەی دەنا بەجێت دێڵم و ڕوقیە شەرعییەکەش دەخوێنم و دەرتدەکەم، بەڵام دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم.

چونکە دەمزانی ئایەتەکان کاریگەری لەسەر هێرۆ دروست ناکات و هیچم بۆ ناکرێت! لەبەر ئەوەی قورئان شیفای ئیمانداره، نەك بێدین وکافر. خوای گەورە دەفەرموێت قورئان شیفاو رەحمەتە بۆ ئیماندار نەك بۆ کافر. ئەوەی دەڵێت: بە قورئان یەزیدی چاکدەکەمەوەو یان مەسیحی چاکدەکەمەوە درۆ دەکات، ئەوە بە شەیتان دەیکات بە قورئان نیە، چونکە دەیەوێت قورئان بەدرۆ بخاتەوە خوای گەورە خۆی دەفەرموێت:

﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴿٨٢﴾﴾ [الإسراء]

واتە: ئێمە لە قورئان ئایەت و سوورەتانێك دادەبەزێنین، كە ببێتە هۆی شیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەكان هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیش، بۆ ئیمانداران، بەڵام بۆ ستەمكارو خوانەناسان جگە لەوەی كە دەبێتە زەرەرو زیان بۆیان (هیچ بەهرەو سوودێكی لێ نایەن).

كەواتە قورئان تایبەتە بەئیماندار بەڵام بۆ بێدین دەتوانرێت بە هەنگوین چارەسەر بكرێت ئەویش شێوەی تایبەتی هەیە، چونكە هەنگوین شیفایە بۆ هەموو خەڵكی، خوای گەورە لەقورئاندا ئاماژەی پێكردووە بۆ هەموو خەڵكی نەك تەنها موسڵمان.

﴿... يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ... ﴿٦٩﴾﴾ [النحل]

واتە: جا لەناو سكی ئەو هەنگانەوە شلەیەكی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە كە شیفایە بۆ (زۆر نەخۆشی) بۆ خەڵكی.

سەسیل: من لەلاشەی هێرۆدا بەهێزم، تۆ هیچیت بۆناكرێت ناتوانیت من بهێنیتە دەرەوە وە نەمنیشت بۆ دەسووتێت؟ من دێمە دەرەوە، بە مەرجێك هیچ نەخوێنیت با قسە بكەین.

ماکوان: باشە هیچ ناخوێنم، وەرە دەچم لە کەنار ڕووباری شار چاوەڕێت دەکەم چوومە دەرەوە خێرا بۆ لای سەیران خان وتم هەرچیت کردووە با هێرۆ موسڵمان بێت و شایەتومان بهێنێت و بەڕاستگۆیی موسڵمان بێت، چپاندم بە گوێیدا و زۆر هێواش پێمووت هەرچیت کردووە هەنگوین و ڕەشکەم بۆ پەیدا بکە.

هیچ وەڵام مەدەرەوە هەوڵبدە هێرۆ موسڵمان بکەیت و تۆبە بکات، چونکە ناتوانم جن لەلاشەی دەرکەم بە قورئان. من (جن)ەکە مەشغوڵ دەکەم ئێستا خواتان لەگەڵ.

کەوتمە ڕێ بۆ کەناری دەریاچەکەی شارەکەی خۆمان و لە نزیك هەندێك مراوییەوە وەستام تەماشای ناو ئاوەکەم دەکرد، نزیکەی ١٠ خولەک چاوەڕێم کرد لەسەر شێوەی یەکەم جاری هات.

هەرچی تەماشام دەکرد ئەو روخسارە شەیتانییەم دیوە، ڕاستە کە یەکەم جار تەماشام کرد هەڵخەڵەتام، بەڵام ڕۆژ بەرۆژ دەموچاوی قیزەون دەبوو لەسەر ئەو شێوەیەی کە دەمبینی.

سەسیل: ماکوان چیت دەوێت بۆت بکەم؟ چیت پێخۆشە داوای بکە، بەو مەرجەی لەگەڵماندا کار بکەیت.

ماکوان: باشە موسڵمان بە! چی دەڵێیت بۆت دەکەم گوێ بۆ شەرعی خوا بگرە، ئەوی تۆ دەتەوێت پەیمان بێت بۆت بکەم. تۆ داوای شتێکم لێدەکەیت، منیش داوایەکت لێدەکەم بیکە بۆم کە بەقسەم ناکەیت.. ئیتر منیش بەقسەت ناکەم!

سەسیل: ئەوەی باسی دەکەین من و تۆ دژ بەیەکن نابێت.

ماکوان: بۆ نابێت، ئاساییە تۆ وەرە ناو ژیانی ئێمە و موسڵمان بەو منیش دەچمە ناو ژیانی ساحیرەکان، ئەمە نابێت؟

سەسیل: ئەوە نابێت ماکوان، بەڵام ئەگەر پێت خۆشە دەتکەینە دەسەڵاتداری وڵاتەکەی خۆت!

ماکوان: واتا دەچمە جێگای مەسعود بارزانی، بەخوا ئەمەت هەر زۆر درۆیە! سەسیل شتێك بڵێ جێگای باوەڕ بێت، بۆ منداڵ قسە ناکەیت بزانە من پیاوم درۆیەك بکە کە پیاو بڕوات پێبکات، ڕاستە دەڵێن جنۆکەو شەیتان زۆر درۆزنن، بەڵام بوون بە فشەکەریش!

سەسیل: بۆچی بڕوا ناکەیت، سەدانی وەك ئەوانەمان دروست کردووە لەو جێگا گەورەنەدا کاردەکەن. زۆر لە مەسعود بارزانی و هەرێمەکەی ئێوەش گەورەترن، ئەتوانیت ببیت بە سەرۆکی عێراقیش!

ماکوان: بەس ئەوەندە کافر بم ئەم هەموو شتە بۆ من دەکەن؟ ئەی بچۆ بۆ لای هەر مولحیدێك بیکە تەنها بەئەندامی خۆت، بڕوابکە لەوانەیە هەموو عەشیرەتەکەشی بفرۆشێت.

سەسیل: ئەوان ئەندامن ئیتر بۆ هەوڵیان بۆ بدەین وازیان لێبینە هەمووومان کۆدەبینەوە لە دۆزەخدا، کامیان تورە بوون دواتر جێگاکەی خۆمیان ئەدەمێ!

ماکوان: واتا خۆشت دڵنیایت لەوەی کە دەچیتە دۆزخ، ئەی بۆ وادەکەیت بەزەیت بەخۆتا نایەتەوە بۆ هەتاهەتایی دەچیتە دۆزەخ!

سەسیل: ئەوە موشکیلەی تۆ نیە.

ماکوان: باشە پلانەکەم پێ بڵێ بەتەمای چۆن بمکەیتە سەرۆکی وڵاتێك.

خۆ دەبێت بزانم چی دەکەیت و بەچی دەبین بە سەرۆك! قابیلە قۆریە سیحریەکەی عەلائەدینت پێ بێت؟ ئێستا دەبابە و سەرباز و پێشمەرگە و فیشەک و شتی واهەیە. بە فیشەکێك دەمرین، مەجالی ئەوە نیە ژیان چۆڵکەیەت کە مەلەکولمەوتمان بینی هەردووکمان مەلەفەمان دادەخرێت و کافریش بووین. وەك ئەوە وایە بڵێین منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ. ئەی وانیە سەسیل؟ نیعمەتی ئیسلامیش لەدەست ئەدەین.

سەسیل: باشە من ئەصلی فیکرەکەت ئەدەمێ، جوان تەماشای من بکە. من ناناسیت کێم؟

ماکوان: سەسیل ی شەیتانی خوا دەزانێ کوڕی شەیتانی یان ئامۆزایانیت یان خۆت ئیبلیسی چوزانم تۆ کێیت.

سەسیل: من ڕاسبۆتینم[١٥]، ئەمناسیتەوە؟

ماکوان: وەڵڵاهی ڕاست دەکەیت! دەڵێم خوایە ئەم سەرو چاوەم دیوە. برا گیان تۆ تاوانباری و شەڕەنگێزو پیسی. ئەوە بەڕاست خۆتۆ ئەوی سەسیل؟

---

[١٥]- دواتر ئاماژەی پێدراوە.

سەسیل: ئەو مردووە! من كەسایەتی ئەوم دروست كردووە، دوای كوشتنیشی لەسەر لاشەی ئەو خۆم نیشانی تۆ و خەڵكی تریش ئەدەم.

ماكوان: جا خۆ زیاتر لە ١٠٠ ساڵە ئەو ساحیرە پیسە مردوە، ئەزانی بووە هۆكاری كوشتنی ملیۆنەها خەڵك. تۆ ئەتەوێت بمكەیتە خزمی قەیسەر و وەك ئەوبم؟ بەدەردەكەی ئەوم بەری؟

سەسیل: تۆ بۆ وابیر ناكەیتەوە كە خوا نیە؟ وەك مولحید بژی، بۆ ڕاسبۆتین كەم خۆش ژیا؟ هەمیشە جوانترین ئافرەتی لەبەردەستدا بوو هەموو كڵێسای ئۆرتۆدۆكسی لێی دەترسا، شیفای نەخۆشی ئەدا، بێجگە لەوەی كە هاوڕێی خودی قەیسەر بوو، زۆرترین نفوزی هەبوو. ئیتر بۆ ناتەوێت پلانی ئەوت بۆ بەكاربینین و وەك ئەو بژیت؟

ماكوان: باشە قبوڵمە! بەمەرجێك تۆ موسڵمان بێت، بەشەرعی خوا رازی بیت.

سەسیل: بیانو دەگریت ماكوان.

ماكوان: تەنها پێم بڵێ كاتێك ئەو ڕاهیبە سەرسەری و فاجر و فاسقە شیفای خەڵكی ئەدا هیچ نەخۆشێك لەژێر دەستیدا دەرنەدەچوو چاك دەبووە، پێم بڵێ ئەوە چی بووە؟

سەسیل: ئەوە زانستە تۆش فێر دەكەم ئەگەر ئارەزووت بێت، بەناوی دین دەیكەیت، ئەتەوێت ببیت بە ڕاهیب تەنانەت داوای پێغەمبەرایەتیش بكە! ئەو زانستەت فێر دەكەم، دەتوانیت هەرچی كەس هەیە شیفای بدەیت.

ماکوان: سەسیل تۆ خۆت باش دەزانیت من تا شتێك نەبینم و تاقی نەکەمەوە هەرگیز قسەی لەسەر ناکەم، ئەمەی تۆ دەیڵێت قوماره.

سەسیل: بۆ قوماره تۆ داوای پلانت کرد باشترین پلانت ئەدەمێ. خۆشەویسترین کوڕی کام سەرکردەو دەسەڵاتدار دەڵێیت: نەخۆشی دەخەین و تۆ بڕۆ چارەسەری بکە بەناوی دیینەوە. نفوز و پێگەی خۆت بەهێز بکە هەروەك ڕاسبوتین، ئیتر ئەوەندە قورس نیە. ڕاستە پلانەکە زۆری دەوێت، بەڵام ئێمەش لەگەڵتین و هاوکاری تەواوت دەکەین.

ماکوان: سەسیل باشە پێم بڵێ بۆ حەزقیل دیار نییە؟

دەمویست بە پرسیار کردن دوای بخەم، بەڵکو سەیران هێرۆ موسڵمان بکات و تۆبەی پێ بکات.

سەسیل: ناردوومانە بۆ جێگای تر کار دەکات.

ماکوان: بەخوا ڕاستە جنۆکە درۆزنە، ڕاستم پێبڵێ.

سەسیل: زیندانە لای ئێمە، چونکە موسڵمانت کرد.

ماکوان: باشە ئەتوانم ببینم بانگی بکە، بەڵام فێڵم لێنەکەیت چونکە ئەو موسڵمان بووە. من هەموو زیکرەکان دەخوێنم، ئەو لە تەلیسم ئازاد بووە وەك تۆ نیە کۆیلەی شەیتان بێت.

سەسیل: باشە، بەڵام منیش کارێکم دەوێت بۆم بکە.

ماکوان: چییە؟

سەسیل: تفێك بکەرە قورئان و بەشەق تێی هەڵدە.

ماکوان: شتی واناکەم و سەرت دای لە نوکی پێڵاوەکانی من و شەق لە دەمی تۆ هەڵئەدەم، هیچو پوچ.

سەسیل: باشە تورەمەبە! تەنها تفێکی تێکە شەقی تێهەڵمەدە.

ماکوان: وتم باسی وامەکە، قورئان نوری چاوی ئێمەیە، برۆ ملت بشکێنە هەر قسەت لەگەڵ ناکەم.

سەسیل: تورە مەبە! باشە بیستوینە یان بیدرێنە.

ماکوان: ئیتر لە تاقەتما نەما دەستم کرد بە قورئان خوێندن و لەپێشاندا ئەم زیکەرەم خوێند کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت هەرکەس ئەم زیکرە بخوێنیت: هیچ زەرەرێکی پێنگات نەلە لایەن جن نەوە نە لە لایەن ئاژەڵی درندە و زیانبەخشەوە.

أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ. یـــا ئایەتەلکورسی و ٤ قل- کە ئەو چوار سوورەتەی بە (قل) دەست پێدەکات.

نەما رایکرد ئەو هیچو پوچە! خێرا تەلەفونم کرد بۆ سەیران: لەگەڵ هێرۆ چیت کرد؟

سەیران: زۆر بەئاسانی شایەتومانی هێناوە و تۆبەی کردووە.

ماکوان: ئەگەر دەتوانیت با بروات خۆی بشوات و دەست بکات بەنویژ، ئەگەر نەیزانی فێری بکە. منیش دوای نان خواردن دێمەوە بۆ لاتان.

سەیران: بەسەر چاو، بەڵام ماکوان گیان دەست لە هێرۆ هەڵمەگرە زۆر گوناحە.

ماکوان: خوا ئاسانی بکات.

تەلەفونم کرد بۆ عەلی یەمەنی: ڕاکە هەواڵێکی خۆشم پێیە بۆت، نەوەستی!

عەلی: خێرە ماکوان؟

ماکوان: نەوەستی ڕاکە زۆر موهیمە!

عەلی هات بەسەیارەوە: خێر؟

ماکوان بە چی تێگەیشتوویت هەواڵەکە؟

عەلی: ئازیز ڕازی بووە؟

ماکوان نەوەڵڵا لەوە خۆشترە، هێرۆ موسڵمان بووە و شایەتومانی هێناوە. وەزعەکەم بۆ باس کرد لە سەرەتاو چی ڕوویداوە لەگەڵ سەسیل دا تا کۆتایی.

عەلی: بۆم باسکە، ڕاسبۆتین کێیە؟

گریگوری یافیموڤیچ ڕاسپۆتین (Rasputin Yefimovich Grigori)

ماکوان: لە ٢٢ی کانوونی دووەم ١٨٦٩ لە گوندی (پوکرۆفیسکۆی) لە سیبیریا لەدایکبووە، قەشەیەکی داوێنپیس و فێڵبازبووە، لە جوتیارێکی

کۆلکە خوێندەوار گەیشتۆتە ناو ماڵ و خێزانی قەیسەری ڕووس و لەژێر پەردەی ئایینی نەسرانیدا ئەوەی نەکراوە کردوویەتی، بە دەیان وەزیر و ژەنەڕاڵ و فەرمانبەری گەورە و خاوەن پلە و پایەی ڕژێمی لە گەڵدا بووە.

بەوە ناسراوە کە هێزێکی لە ڕادە بەدەری هەیە، ئەوەی هێزی موگناتیسی چاویەتی، بەڵام من پێم وایە سیحرە جنۆکە کاری بۆ کردووە. سەسیلیش دانی بەوەدا ناوە، ئەو وای لەقەیسەری ڕووسیا تێگەیاندبوو کە دەتوانێت پێشبینی هەموو شتێکی بۆ بکات، تەنانەت لەیەکێک لەپێشبینییەکانیدا بۆ قەیسەری نووسیبوو ئەگەر هەر کەسێکی خزمت بکوژێت، لەماوەی دووساڵدا هەموو کەسوکار و وەچەکانت بەدەستی میللەتی ڕووسی دەکوژرێنەوە.

ئەوەش ڕاست دەرچوو، دوای کەمتر لەدوو ساڵ بەسەر کوژرانی ڕاسپۆتین دا، بەلشەفییەکان قەیسەر و ماڵ و منداڵیان لەسێدارەدا و بەوەش ئەخیر سولالەی ڕۆمانۆڤ لەڕووسیادا کۆتایی هات. لە ١٩١٥ دا وەختی جەنگی یەکەمی جیهانی ، کاتێک قەیسەر (نیکۆلای دووەم) بۆ بەسەرکردنەوەی بەرەی شەڕ، سەنت پیتەرزبورگی بەجێهێشتبوو دەسەڵاتی ڕاسپۆتین گەیشتە لوتکە، ئەو کات ڕاسپۆتین بەئارەزووی خۆی وەزیری لادەبرد و وەزیری دائەنا.

لە جەنگی یەکەمی جیهانی گەورەترین تۆڕی سیخوڕی بۆ ئەڵمانیا گێڕاوە لەدژی ڕژێمی ڕوسیا و ئیتاڵیا بە بەرژەوەندی ملیۆنەها خەڵکی کەساس و برسی و ڕەش و ڕووتی میللەتانی ژێر چەپۆکی قەیسەری کردووە، پێش دوو شەو لە بۆنەیەکدا ژەهری (سیانور)ی بۆکرایە ناو کێک و شەرابەوە لەلایەن شازادە (فلیکس یوسوپف)ەوە، کە ژەهرەکە کاریگەری نەبوو

لەسەری، بۆیە شازادە تەحەمولی نامێنێت و فیشەکی پێوە دەنێت، بەڵام فیشەکەکانیش کاریگەریان نابێت، بۆیە لەگەڵ چەند کەسی دیکەدا دەیبەستنەوەو دەیبەن فڕێی دەدەنە ئاوی دەریاوە، لە ئاوەکەدا خنکاو مرد.

بە پێی چەند سەرچاوەیەک وا پێدەچێ کە لە لایەن بەریتانیاوە کوژرا بێت، چونکە ئەوکات ڕاسپۆتین لەوپەڕی کاریگەریدا بوو وە خەریک بوو قەناعەتی بەقەیسەر ئەکرد یەکلایەنە لەگەڵ ئەڵمانیا ڕێبکەوێت و ئاشتی بکات، ئەمەش مانای شکانی بەریتانیا بوو لە جەنگەکەدا، دەرئەنجام لە ٣٠ی کانوونی یەکەم ١٩١٦ دەکوژرێت.

عەلی: بـــا بڕۆین بۆ نەخۆشخانە.

## مردن و كۆتایی

كەوتینەڕێ بەرەو نەخۆشخانە لەگەل عەلی یەمەنیدا كە چووینە ئەوێ تەماشام كرد سەیران خان دەگریا.

ماكوان: خێرە سەیران خان چی ڕوویداوە هێرۆ چۆنە؟

سەیران: هیچ باش نییە، دوای ئەوەی بردمە حەمامی نەخۆشخانەكە و شۆردم داوای ئاوی كرد بۆم هێناو پێم وت: ماكوان داوای لێكردوویت شایەتومان بهێنیت و موسڵمان بیت.

بەڵكو جنۆكە لە لاشەتدا دەربكات، خوای گەورە ڕەحمت پێبكات شیفات بدات. ئەویش بەقسەی كردم، شایەتومانی هێناو تۆبەی كرد. ئاوم بۆ هێناو تۆزێك قسەی خۆشی كرد، دووركعات نوێژی كرد و لەگەڵ ئازیز دەستیان كرد بە قسە وەزعی زۆر باش بوو.

دیسانەوە لەپڕ ڕشانەوە و خوێنی بەیەكەوە هەڵدەهێنایەوە، ئەوە ئێستا من و ئازیز هاتوینەتە دەرەوە چاوەڕێین بزانین دوكتۆرەكان لەژوورەوەن چی دەڵێن.

ماكوان: ئەی هەنگوین و ڕەشكەكەت پەیدا كرد؟

سەیران: هەنگوینم كڕیوە، بەس بڕواناكەم ئەصڵ بێت ڕەشكەش لە كوردستان هێناومە زۆرمان هەیە.

ماکوان: عەلی هەنگوینی ئەصل نیە؟

عەلی: بەڵێ زۆرم هەیە، لەیەمەنەوە هێناومە.

ماکوان: دەبڕۆ تۆزێك بهێنە بۆ هێرۆ تایەیتەوە قسەیشت بۆ دەکەم لەگەڵ ئازیز.

عەلی خێرا ڕایکرد بیهێنیت و سویچی سەیارەکەی لە من وەرگرت.

چوومە لای ئازیز چۆنی و چاکیکم لەگەڵ کرد، دوای هەندێك موجاملەی خۆش وتم ئازیز تۆ برات نیە بۆ من نەبم بە برات و بتدەم بەشوو؟!

ئازیز: بەو کوڕە عەرەبە؟

وتم بەو کاك عەلی یە (یەمەنیە)، هەتا بڵێیت قۆزە و کوڕی چاکە و خواناسە. تۆی خۆشدەوێت ئیتر بۆ شووی پێناکەیت؟

ئازیز: بەخوا کاك ماکوان من حەزم لێی نیەو شووش ناکەم.

ماکوان: بۆ شووناکەی ئازیز، بەر دەگری بۆ سەیران و موستەفا؟ تۆ حەزت لەو نیە عەلی حەزی لەتۆیە، نابێت؟

ئازیز: ئاخر کاك ماکوان خۆشەویستی بەیەك لایەنە نابێت، ئەنجا من ئەو کوڕە ناناسم ئایا تەبیعەتی لەگەڵ من دەگونجێت؟

ماکوان: بەخوا ئەوەندەی خۆشدەوێیت، هەرچی بڵێیت بەقسەت دەکات.

ئازیز: بەخوا ناتوانم شووی پێ بکەم، ببورە.

ماکوان: باشە من یەك تەکلیف لەتۆ دەکەم، بڕۆ خۆت قسەی لەگەڵ بکە، کە هاتەوە قەناعەتی پێ بکە کە ناتوانیت لەگەڵ ئەو ژیان بەریتە سەر، بۆ ئەوەی چاوەڕێت نەکات و منیش ئەوەندە ئیحراج نەبم لەنێوانی تۆ و عەلی دا، لەڕاستیدا من عەلیم زۆر خۆشدەوێت، باشە؟

ئازیز: ئاخر چی پێ بڵێم؟

ماکوان: من نازانم تۆ چی پێ بڵێیت، بەڵام من دەزانم ئێوەی کچ ئارەزووتان بێت هەرچی شتە دەیڵێن، جا ئارەزووەکەت بجوڵێنە وە قەناعەتی پێبکە نەیەتەوە بەلای مندا لەسەر زمانی خۆتەوە ڕازی بکە کە شووی پێناکەیت. باشە؟

ئازیز: باشە، بەس شتێکت پێ بڵێم لای کەس باسی ناکەیت!

ماکوان: من رۆژنامەنوسم نازانم باسی دەکەم، یان باسی ناکەم وەعد نادەم بەس پێم بڵی خوا گەورەیە.

ئازیز: من و عەبدوڵڵا دڵمان بەیەکەوەیە.

ماکوان: عەبدوڵڵا هەولێری هاوڕێی من؟

ئازیز: بەڵێ!

ماکوان: ئەی عەبە زۆڵ[١٦]، ئەمەی چۆنکرد؟

---

[١٦]- لە ناوچەی ئێمەدا هەرکەس وریا و بەدەست و دەم و چەپوك بێت پێی دەڵێن زۆڵ.

ئازیز: ئەو ررۆژەی کە هێرۆتان هێنا، منیش هاتم بۆ ماڵی هاوڕێکەی تۆ. بەس تۆ زۆر مەشغوڵ بوویت هاوڕێکانت لەگەڵ بوو، ئەو ڕۆژە یەکترمان ناسی.

ماکوان: باشە ئەی کوێرا خۆشتویست؟

ئازیز: تەلەفونەکەی خۆی دامێ، وتی دوایی تەلەفونم بۆ بکە ئیشم پێتە بۆ کاری ماکوانە! لەڕاستیدا درۆی کرد، منیش کە قسەم لەگەڵ کرد زۆر کوڕێکی باش بوو ئیتر لەوێوە یەکترمان ناسی.

ماکوان: ئەی ئافەرم کاکە عەبە، بەڕاستی کردەیە.

ئازیز: بەس توخوا لای کەس قسە مەکە.

ماکوان: لای دایك و باوکت قسەناکەم بە مەرجێك عەلیم بۆ رازیکەیت و دڵی لە خۆی دانەمێنێت، بەڵام قسە لەگەڵ عەبە دەکەم کە بەناوی منەوە تۆی کردووە بە عاشقی خۆی ئەبێت بەزووترین کات بتهێنی.

ئازیز: باشە ئەوەی تۆ دەیڵێی دەیکەم.

ماکوان: ئەوەی من دەیڵێم قازانجی تۆیە دەزانم دەیکەیت. خۆم پێنەگیرا تۆزێك دوورکەوتومە تەلەفونم کرد بۆ عەبدوڵڵا، دوای چۆنی و چاکی. پارەی دانراو چەند هەیە؟

عەبدوڵڵا: بەخوا قەرزارم لە شەریکەکەم دوکانەکەم کڕیوەتەوە ، زۆر قەرزارم.

ماکوان: بۆ وادەزانی من داوای پارەت لێدەکەم وا دەکوڕوزێیتەوە؟

عەبدوڵڵا: نەوەڵڵا! ئەگەر پارەت پێوستە بۆت پەیدا دەکەم یان دوکانەکەمت بۆ دەفرۆشم.

ماکوان: چەند پێویستە بۆ ئەوەی ماڵێکی باش پێکەوە بنێیت لە ئۆسلۆ؟

عەبدوڵڵا: بۆ بەتەمایت بێیتە ئۆسلۆ بژیت؟

ماکوان: نا ئەمەوێت ژنت بۆ بێنم!

عەبدوڵڵا: پێم ڕادەبوێری؟

ماکوان: نا- ئازیزی کچی کاك موستەفات بۆ دێنم!

عەبدوڵڵا: بەقورئان خەجاڵەتم چۆن زانیوتە؟

ماکوان: عەبدوڵڵا تۆ من باش دەناسیت، زۆر جدیم لەسەر مەسەلەی هاوڕێکانمو شەرەفو وەفاو نانخواردن لەماڵی خەڵکدا، ئازیزت بەبۆنەی منەوە ناسیوە بەبۆنەی منیشەوە کردوتە بە خۆشەویستی خۆت و ئەم قسە قۆڕانە.. وایە؟

عەبدوڵڵا: بەخوا داوای لێبوردن دەکەم، مەبەستم خراپ نیە.

ماکوان: باشە، موشکیلەت چییە بۆ ژن ناهێنیت؟

عەبدوڵڵا: تەنها پارەم نیە، پێویستم تەنها بەکاتە تا پارەکە کۆدەکەمەوە لە بازاڕدایە، دەنا بەخودای دەیهێنم ئەو کچە زۆرم خۆشدەوێت و نیازم خراپ نیە.

ماکوان: ١٠٠ هەزار کرۆن بەسە بۆ زەواجەکەت؟

عەبدوڵڵا: ٥٠ هەزاریشم بەسە.

ماکوان: ئێوارە وەرە من ١٠٠ هەزارت ئەدەمێ، ناوی مەنێ قەرز هیچ نیە بەس بەو مەرجەی حەیای من نەبەیت لای ئەوخانەوادە عەبدوڵڵا.

عەبدوڵڵا: باشە دێمە لات هەر خۆشت داوای بکە بۆم، هەرچی تۆ بیڵێیت ئەیکەم. لەقسەت دەرناچم.

ماکوان: باشە بەسەرچاو عەبدوڵڵا گیان مادام هاتیتە پێشەوە من لەخزمەتام، تەلەفونم داخستەوە و وتم ئەی عەلی یەمەنی نەگبەت.

چوومەوە بۆلای سەیران خان و مۆڕەیەکم کرد لەئازیز و دەستی کرد بە پێکەنین.

تۆزێکی پێچوو عەلی هاتەوە بە شوشەیەك هەنگوینەوە و سەیری ئازیز ی دەکرد، بە کوردی وتم ئازیز هەڵسە بڕۆ بۆ لای عەلی، با ئیشەکەت لێ تێکنەدەم.

خێرا چوو...

ماکوان: عەلی ئازیز دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

یەمەنی تۆزێك ڕەشن، بەڵام عەلی ڕەنگی شین بوبوو لەتاواندا ڕۆشتن، چوون بۆ کوێ نازانم.

ماکوان: سەیران خان داواکاری ئازیز نییە؟

سەیران: وەڵڵا زۆرە! بەس دەڵێت شوو ناکەم بەوانە هاتونەتە داوای، دڵی نەیگرتوە.

ماکوان: دەیگرێت بەم نزیکانە، من دەستی بۆ ماچدەکەم.

سەیران: بۆ عەلی یە، ڕازی بووە؟

ماکوان: نەوەڵڵا، عەلی نییەو عەبدوڵڵایە، ئەوە ناردم پێیبڵێ چاوەڕێ نەکات، لەوانەیە لەگەڵ کوڕێکی ڕەفیقی مندا ڕێکیان بخەین و هەردووکیان قابیلی یەکن و ئەگونجێن، وا هەستدەکەم زۆر باش بێت، هاوڕێکەی منیش کاسبەو لە ئۆسلۆ دوکانی هەیە کوردی هەولێرە و کوڕێکی زۆر باشە.

سەیران: هەر سەرسەری وقومارچی و داوێن پیس نەبێت، ئیتر ئێمەش چیمان دەوێت؟

ماکوان: ئەی بۆ ناڵێیت با دیندارو خواناس بێت؟

سەیران: جا ماکوان گیان ئەوەی ئەوانەی تێدا نەبوو خواناسە.

ماکوان: وەڵڵا وانییە هەیە ئەوانەشی تێدانیە خوانەناسێت و بێدینە.

لەم قسانەدا بووین دوکتۆرەکان هاتنە دەرەوە وتیان ببورن هێرۆ مرد!

ئەوەی لەدەسەڵاتماندا بوو کردمان، بەڵام بەداخەوە نەمانتوانی ژیانی ڕزگار بکەین، نەخۆشی ئایدزەکە زۆر لاوازی کردبوو. دووبارە بەداخەوە.

ماکوان: لاحول ولا قوة الا بالله، انا لله وانا اليه راجعون, فرمێسك بەچاومدا هاتە خوارەوە، زۆر حەزم دەکرد بچمە لای لەدوای ئەوە کە تۆبەی کردووە قسەی لەگەڵ بکەم.

خێرا چوومە سەری و دوعای خێرم بۆ کردو زۆر بیتاقەتی بووم زانیم کۆتایی ژیانی خوای گەورە پاکی کردەوە بەو ئازارو ناڕەحەتی و نەخۆشییەو بە تۆبەو پاکی گەڕایەوە بۆ لای خوای خۆی.

زۆر حەزم دەکرد ببوایەتە ئافرەتێکی بانگخواز، چونکە دوو زمانی بەباشی دەزانی ئینگلیزی و نەرویجی، بەهەر حاڵ من و سەیران تێرو پڕ بۆی گریاین.

تەلەفونم کرد بۆ عەلی بچێت لە مزگەوتی خۆمان کفن بهێنێت، نەخۆشخانە وتیان کفنمان هەیە.

بە ئازیزو سەیرانم وت ئێوە بیشۆن، قەبرمان بۆ کڕی و چووین ناشتمان.

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو کچەم خۆشنەدەویست، سبحان الله لە کۆتایی تەمەنیدا ئەگەر خوشکی خۆشم بمردایە، هەر ئەوەندە بۆی غەمبار دەبووم.

ئەم قەصیدەیەم لەسەر گۆڕی هێرۆ نووسیوە.

ئەم چرایە بۆ خامۆشە
كە من ئێستا تامەزرۆی مەقامەمە
ئەوە دەنگم بۆ نوساوە؟
كە تامەزرۆی ناڵەی یارمە
مۆمە چاو مەستەكە، بریسكە پەیوەستەكە
كەم بە گڕت سەمام لەگەڵ بكە...
بەس مەستانە لەگەڵما بدوێ و..
نازم بەسەردا بكە
من وا ڕۆحم نێڵەی ئەڤینە و بڵێسەی سەندووە
كەسێك نییە هاوڕازم بێ و ببێتە كەڵ كەڵە
تەپونێك بەرەو ئاسمانم بەرێ و...
نەرم نەرم پەڕاوێنم پێ بكات
پەرجۆیەك ڕوونادات
تۆ بكاتە كۆتەرە
یان بۆ جارێك ببیتە ڕازم ئەی شڵێوە
كەم بگری بە دیارمەوە
من پەژموردەی خەمم و سەروقژم ببینە
ژاكاوم و چاوەڕوانم بە...
مۆمە ئێسك سووكە ماكسییە چرچۆڵ لەبەرەكە
دامێن كراس شۆڕە شاژنەكە
ئامۆژگاریم بكە
وا زەریایەك ئەم شەو لەناو مندا نغرو بووە!
ئەم گەردوونە لەم ژوورەمدا نامۆ بووە
خجڵ، نزك، لەگژ..
بووم بە تۆوە

ئەی گۆڵی بەفر دەوار هەڵدە لەم ژوورەمدا
دیرۆك بکە لەگەڵ مندا
تارمایی ڕۆحم لەگەڵ لاشەم بەسەر تۆوە ئەی مۆم پاسارییە...
لە پەنای پاسارتا ئەم شەو پشکۆی یادگارییە
ئاگام لێتە تاوی فرمێسکت تك تك دەکەیتە خوار وەك عەزیزی...
بارۆڤەی ئەلهام...
وا خەریکە بپشکوێ بۆ مەرگ
بێشەڵانە ئەم شەو..
لەتاو بێ سەودایی من و پرشنگە جاڕی وشە
وائەم شەو پریاسکەم لە بەردەمتا هەڵدەڕێژم
بەڵکو پژانی ئەوین پلورەی هەنگوین بێت
کازێوەش بێت تا ئەم شەو لەناو ئیمان نەتوێینەوە وازناهێنن
من ئەمشەو قەتیسم لەناو تۆدا
قەف قەف فرمێسکەکانت چینیان گرتوە
نەرمە پێڵ بەهەستمەوە نەوا دەکەن
وروشەی خوانێکی میهرەبانی دروست دەکەن
ئەمشەو وشە لەگەڵ تۆدا هاوێر دەکەم
مەملەکەتیکی هۆبەت بۆ دروست دەکەم
هۆبەی عشق
لەو کۆمارو هۆبەیەدا
هێمایەکی شیرینی ژیاری مەرگ
هەژمەت بە دڵمەوە بەرێ
ئەم شەو ڕازم کەوشەنە...
مۆمە قەد باریکەکە..
لەگەڵ تۆدا لە بەهاری وشەدا شەوینە
شالورم ئەم شەو...
کەناریش لە ئاستما بێ دەنگە

ئەمشەو گیانم تەژی خەمە
دەندەکانم دەرکەوتووەو..
منیش وەك تۆ فرمێسك لە چاوم دەبارێت
لاشەم وا بۆتە زنار
ساپیتەی ژوورەکەیشم بەسەرما وا دەبارێت
شەم چەم نی یەو نەتۆرێی لێم؟
با گوڵی بەفر نەبێتە میوان
ئەنگوستیلەکەم دەکەم بەقەدی تۆدا
لایەقی تۆیا مەڵبەندی نێرگزە جاڕ
بۆ من تۆ چل چرای پڕ ئاوێزەی
چلۆپکی ڕوناکی و تیرێژی منی
داڕشتنی هەموو خەمە لاسارەکانی منی
مۆم.. من ئەم شەو هەر سیاچەمانەت بۆ دەڵێم
بەیات و سەبا بەدەورتا دەگەڕێنم
هەرچی خەممە ئەم شەو لەگەڵ گڕە بێ نازەکەت دەیسوتێنم
من ئەمشەو نازت دەکێشم
کەسێك نییە هاوڕێم بێ لە تۆ زیاتر
کەسێك نییە ڕووناکیم بێ
بەجێم مەهێڵە؟
ئەم هەموو ناڵەیەم بۆ تۆیە..
کەچی وا لارەمل کەوتی..
پرتە پرت کەوتیتە ناو فرمێسکی خۆت
بەجێت هێشتم
کوا ڕووناکیت؟
ئەوانەی وەك تۆ ناسکن
ئەگەرچی شعریشتان بۆ بنووسن
لە کۆتایی بەجێمان دێڵن و نامان ناسن

ئەوەش مۆم و عشق
بۆ یەکتری دەتوێنەوە
ئازیزانیان بەجێ دێڵن
هەڵبژێرە کامیانتە وێ
ژوورە تاریکەکەی من؟
یان مۆمێکی عەیاری بەژن بێ بن؟
ئەمە عشقە یان گۆڕستانی مۆمە؟
هیچیان فەرقیان نییە بۆ من.

ماوەی مانگێکی پێچوو عەبدوڵڵا هات بۆلام و وتی: با بڕۆین بۆ لای کاك موستەفاو داوای ئازیزم بۆ بکە.

چووین و باسەکەمان لە خزمەتی کاك موستەفادا کردەوە، کاك موستەفا ڕازی بوو، سوپاس بۆ خوا من دەستم بۆ عەبدوڵڵا ماچ کردو مەجلیس خۆش بوو. ئیتر وتمان بڕیاری خۆتانە کەی دەیگوازنەوە.

دوای دوو هەفتە عەبدوڵڵا تەلەفونی بۆ کردم لە میسر وتی: هیچت ناوێت بۆت بێنم لە میسرم. منیش هەر کتێبم پێویستە داوای کتێبم لێ کرد، بەلامەوە سەیر بوو. وامزانی چووە بۆ کەرەستەو ئەشیای دوکانەکەی لە میسر بکڕێت. وتی ئەوە ئازیزیش سەلامت لێدەکات!

چوو بوون بۆ مانگی هەنگوینی، منیش بە خۆشحاڵییەوە تەنها پیرۆزبایم لەسەر بوو.

بەڵام زۆر دڵم بەعەلی ئەسوتا تەلەفونم بۆ کرد وەك وەفایەك وتم عەلی ئەم ئێوارە دەعوتی منی چی دەخۆیت؟

عەلی: حەزم لە فەلافلە

ماكوان: بەكوردی، ئاخر بۆیە ئازیز شووی پێنە كردی.

عەلی: تێناگەم باسی چی دەكەیت؟

ماكوان: ئەڵێم وەرە بارۆحی عەزیزی خۆمت پێشكەش كەم فەلافل چییە.

دوای چەند مانگێك عەبدوڵلا تەلەفونی كرد وامزانی عاجزبوون لەگەڵ خێزانی. دەنگی زۆر هێواش و نەرم بوو لەدڵی خۆمدا وتم بەخوا شەڕیان بووە لەگەڵ ئازیز.

دوای چۆنی وچاكی وتی: ماكوان، مامە مستەفام عەمری خوای كردووە، وەرە بۆ تەعزێكەی.

ماكوان: لاحول ولا قوة الا بالله، انا لله وانا الیه راجعون.

كاك موستەفاش خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی.

ژیان زۆر سەیرە ئەڵێی شانۆگەرییە، هەر كەس دێت و دەوری خۆی دەبینێت و كۆتایی بە دەورەكەی دێت، كۆتایی هەموومانە. خوایە گیان لە ماكوان خۆشبە ئەگەر لە شانۆكەتدا كارەكتەرێكی باش نەبووم.

دوای چەند ڕۆژێك عەلی پەیوەندی پێوە كردم: ماكوان وەرە ژن مارە دەكەم!

ماكوان: ئەی كە خۆشحاڵم اخ عەلی سۆماڵییە؟

عەلی: نا نەرویجی یە.

ماکوان: عەلی لە دیسکۆ پەیدات کرد؟

عەلی: نەوەڵلا لە مزگەوت بۆیان دۆزیمەوە، نەرویجیەکی سەلەفییەو نیقاب دەکات و دەڵێت بە مەرجێك شووت پێدەکەم بچین لەیەمەن بژین.

ماکوان: چیت پێویستە بۆت بکەم عەلی برام؟

عەلی: وجودی خۆت

عەلی ژنی هێنا، موستەفا مرد، ئازیز شویکردو هێرۆش مرد.

سەسیل ماوە، ماکوانیش ماوە جارێ ململانێ بەردەوامە.....

ئەمە کۆتایی نیە بەڵکو سەرەتایە.

## جنۆکە چوونە ناو لاشە و چۆنیەتی دەرهێنانی

ئەو کەسانەی کە جنۆکە دەچێتە لاشەیانەوە، دیاردەکانی زۆر نزیکە لەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی دەروونی بوون. بەچیدا لەیەکتر جیایان دەکەیتەوە، تاکە شا ڕێگایەك خوێندنی قورئانە.

زۆر جار قورئان خوێندنەکە ڕاستەوخۆ جنۆکەکە لەلاشەی کەسەکەدا دەخاتە قسە و هەندێك جاریش پێی دەچێت.

لە کەمترین ماوەدا ١٠ بۆ ٢٠ خولەک لە خوێندنی ئایەتەکان ڕاستەو خۆ هەست بە نەخۆشەکە دەکەیت کە بەتەواوەتی دەگۆڕێت و هەوڵی پەلاماردان، یاخود ڕاکردن ئەدات. هەندێك جاریش ئاساییە هیچ هەستێکی نیە تەنها بەچاو تەماشا دەکات

لە پیاوان زیاتر کە تووشی ئەو حاڵەتە دەبن. ئەوەی کە قورئانەکە دەخوێنێت سەرەتا دەیانەوێت ئیحراجی بکەن دەست دەکەن بە جرِط لێدان، یاخود کەسەکە با لەخۆی بەرئەدات واتا (ترِی گەورە لێئەدات)، ئەویش شەیتان و جنۆکەکان وا دەکەن بۆ ئەوەی مەجلیسەکە بخەنە پێکەنین و لە جەوی ئیمانی دەرچێت.

هەندێك جار بەزمانی جیاواز و لە کوردی و عەرەبی و فارسی قسە دەکەن بۆ سەرتێك دان وەك ئیسپانی و پرتوگالی و زمانی تری بیانی، چونکە زۆرێك لە زمانەکان شارەزان، لە حاڵەتی وادا دەبێت بەئاسایی وەریگریت و هەوڵبدەیت بەزمانی قورئان قسەی لەگەڵ بکەیت و هەر تێنەگەیشتی

ئەوکاتە کەسەکە ڕوقیەی شەرعی دەخوێنیت، بەردەوام دەبێت لە خوێندی ئەزکارەکان و ڕوقیەکە تەواو دەکات و گوێ بەو نادات.

هەندێك جار بەقسەو گاڵتە و گەپی قۆڕ مەجلیس تێک ئەدەن و سەرقاڵت دەکات لە ڕێگای نەخۆشەکەوە، ئەوەی کە قورئان دەخوێنێت و ڕوقیە شەرعیەکە دەکات دەبێت نەهێڵێت مەجلیسەکە یان ئەو خەڵکەی لەگەڵیدان بکەونە پێکەنین و قسەی بێمانا و وەڵامدانەوەی. بەناوی خوا دەست پێبکات و بە سلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (s) دوای ئەوە دەست دەکات بە خوێندنی قورئان بە پەناگرتن لە خوای گەورە لە شەیتان دەست پێدەکات.

هەندێك ئافرەت کە جنۆکە لەناو لاشەیدایە، باشترە ئافرەت دەری بکات، بەڵام بەهۆکاری ئەوەی ئافرەتان دەترسێن کەمتر دەتوانن ئەوکارە ئەنجام بدەن. هەرچەندە لەناو سۆماڵییەکاندا ئافرەت هەیە ئەو کارە دەکات.

ئەگەر پیاو بوو، باشترە دەم و چاوی ئافرەتەکە داپۆشێت، بەهۆکاری ئەوە جنۆکە لەلاشەی ئافرەتەکەدا پەلاماری عەورەتی پیاو ئەدات بۆ ئیحراج کردنی، زۆر جار خانەوادەکان ئیحراج دەبن دەبێت بە ئاسایی وەریگرن، لە نەخۆشەکە نەدرێت، یان توڕەبن لێی. چونکە ئەو بەو کارە ئاگادار نیە یان دەیانەوێت هەستی ئەو پیاوە بوروژێت لەڕووی سێکسیەوە کە قورئانەکە دەخوێنێت.

باشتر ئەوەیە کەمەحرەم لە لایاندا بێت وەك باوك یان برا یان دایك..هتد.

ئەو کەسانەی کە داوا دەکەن بەتەنهابن لەگەڵ ئافرەتدا، ئەوانە ساختە چین دەستدرێژی دەکەن سەر ئافرەتەکە، خۆی لەگەڵ شەیتانو جنۆکەدا دەستی تیکەڵ کردووە، هیچ پێویست بە تەنهایی ناکات.

ئەوکەسەی کە کارەکە دەکات باشترە بەڕۆژوو بێت، ئەگەر نەیتوانی باشترە دەستنوێژی هەبێت، ئینجا دەست پێبکات، نابێت بترسێت و سیر و پیازی نەخواردبێت باشترە، نابێت هیچ ترسێك لەدڵیدا بێت لەکاتی کارەکەدا، چونکە ترس دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە جنۆکەکە یاخود شەیتانەکە هەستی پێبکات و لە لاشەی کەسی دووەمەوە بچێتە ناولاشەی ئەو کەسەی کە ڕوقیە شەرعییەکە دەخوێنێت و ئەنجام ئەدات.

پاشان لە ژوورێکدا ئەو کارە بکات هیچ جۆرە ڕەسمێکی ناشەرعی تێدا نەبێت وەك وێنەی تەواوی مرۆڤ، مەبەستم وێنە تەواوی لاشەی مرۆڤ بێت، واتا وێنەی کامل، چونکە وێنەی لاشەی مرۆڤ بەتەواوی جائیز نیە و حەڕامە، ئەگەر تەنها سەری بێت یان لاشەکەی نوقسان بێت ئەو وێنەیە جائیزە ئەویش بەڕای هەندێك لەزاناکان.

بەهیچ شێوەیەك بخورد نەسوتێنن بۆ بۆن پیرۆزی ئەوە حەڕامە، چونکە شەیتان و جنۆکەکان حەزیان بەو بۆنەیە، هەرچەندە بۆنەکە زۆر خۆش نیە بەڵام جنی و شەیتانەکان حەزیان پێیەتی.

ئەو کەسەی کە جنۆکە دەردەکات پێویستە پاکوخاوێن بێت، جلوبەرگی جوان بێت و بۆن خۆش بێت، لەبەر ئەوەی جن و شەیتانەکان لەپاکی ڕادەکەن ئینجا دەست دەکەیت بە خوێندنی و هەمووکەس دەتوانێت بەکاری بهێنێت بۆخۆی و ماڵ و منداڵ و تایبەت نیە بەکەسێك یان بە شێخ

یان بە مەلایەك، بەڵکو گشتییە، هەموو کەسێک دەتوانێت بەکاری بهێنێت..

وەك من دەستم پێکرد بۆ هێرۆ بەم شێوەیە دەستم پێکرد سەرەتا:

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم

بسم الله الرحمن الرحيم

بە سەرەتای سورەتی بەقەرە.. تا ئایەتی ١٠ ﴿الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ [البقرة]

پاشان هەمان سورەت، تەنها ئایەتی ١٠١ ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ

مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴿١٠٢﴾

هەمان سورەت و پاشان ئایەتەلکورسی ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ﴿٢٥٥﴾ [البقرة]

هەمان سورەت کۆتاییەکەی ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴿٢٨٦﴾ [البقرة]

ئەگەر ئەمانە چەند جار دووبارە بکرێتەوە زۆر باشە بەزووترین کات بەم ئایەتانە نەخۆشەکە دەکەوێتە حاڵێکی ناتەندروست و لە ئاسایی بوون

دەردەچێت، بەڵام ئەگەر هیچ ڕووی نەداو دڵنیابوون لەوەی کە هەر جنۆکەی تێدایە، نابێت وازی لێبهێنیت، بەڵکو بەردەوام دەبیت.

سورەتی قل-ەکان دەخوێنرێتەوە کە بریتیە لە چوار سورەت.

بەم شێوە تەرتیبە دەخوێنرێت بەدوای یەکدا.

یەکەم سورەت (الكافرون)

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦﴾ [الكافرون]

سورەتی دووەم الإخلاص

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾ [الإخلاص]

سورەتی سێیەم الفلق

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ٣
وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ٥﴾ [الفلق]

کۆتایان سورەتی الناس

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ
ٱلۡخَنَّاسِ ٤ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ٦﴾
[الناس]

ئەگەر کەسەکە جنۆکەی تێدا بێت بەدڵنیاییەوە دەکەوێتە حاڵەتیکی زۆر نائاسایی و هەوڵ ئەدات ڕاکات و پەلاقاژێ دەکات هەست بە ترس دەکات، لە تۆ.. هتد پێویستە کەسەکە بەهێز بێت، ئەگەر زۆر بەهێز نەبوو لە چاونەخۆشەکەدا خەڵکی تر هاوکاری بکات.

لەو حاڵەتەدا دەست بکە بە قسەکردن ڕووەو نەخۆشەکە، ئەشێت سەرەتا کەسەکە خۆی وەڵام بداتەوە بەردەوام بە لەگەڵیدا تا ئەو کاتەی دەنگێکی

نائاسایی لە دەنگی ئەو پەیدا دەبێت ئیتر ئیعتراف دەکات و داندەنێت بەوەی کە جنەکەیە.

هەندیك جن هەیە شەرمنە دەنگی نزمە لەگەڵی بەردەوام بە تا دەکرێتەوە لەگەڵتا.

بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لەوەی کە ڕاستە جنۆکەیە لەلاشەیدا و بتوانیت جیای بکەیتەوە لە نەخۆشی دەروونی، ئەشێت نەخۆشەکە دەنگی خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی سەرت لێ تێك بچێت، هەندێك شتی تایبەتی نەخۆشەکە وەرگرە لە کەسوکارەکەی کە تەنها هاوسەرەکەی یان دایکی یان باوکی بیزانن، پرسیاری بکە بەنهینی بچپێنە بەگوێیاندا، ئەگەر زانیان ئەوە ئەشێت دەنگی خۆی بێت، بەڵام ئەگەر نەیانزانیوە ئەوە جنۆکەیە، چونکە عیلمی غەیبیان نیە، دەبێت شتی زۆر تایبەت بێت، نابێت گشتی و کاری ڕۆژانە بێت کە بیکات.

یاخود بە پێچەوانەوە شتێك دەڵێت کە نەخۆشەکە نازانێت، بۆ نموونە دەیبەیتە ماڵی کەسێکی تر لە ژوورەکانی سەرەوە پرسیاری لێدەکەیت، پێشتر پێویستە خۆت بزانێت چی تێدایە و یان ژێرزەمینەکاندا چیان تێدایە. خۆت دەبێت دڵنیابی لەو شتانەی کە لە ژوورەکەدایە، ئەگەر زانی ئەوە جنۆکەیە چونکە ئەوان سەریعن و زۆر خێران دەچن و دێنەوە دەزانن چی تێدایە.

پاشان کە کەوتیتە قسە لەگەڵیدا هیچ نابێت بترسیت، هەست بەوە بکە بە تەلەفون قسە دەکەیت یان بە سکایپە یاخود زۆر بەئاسایی وەریگرە،

هەندێك جار پێبکەنیت باشترە، بەڵام نەك قاقا، بەزەردەخەنە هەست بکات تۆ بەتوانایت و لێیان ناترسیت..هتد.

پێی دەڵێت: وەرە دەرەوە لە لاشەی ئەم مرۆڤەدا تۆ زوڵمی لێدەکەیت، ئەوە جێگای تۆ نیە، جنۆکە و شەیتانەکان سروشتیان وایە زۆر درۆزنن و ئینجا ئەوان پرسیار لە تۆ دەکەن بۆ ئەوەی مێشک و سەرنجی تۆ ڕاکێشن و مەشغوڵت بکەن بە پرسیار، نابێت بەهیچ شێوەیەك مەشغوڵت بکەن، خۆت توانای ئەوەت هەبێت ئەو بهێنیتە ژێر ڕکێفی خۆت و بە توڕەییەکی ئاسایی پێی دەڵێت زوڵم مەکە لە لاشەیدا وەرە دەرەوە ئەگەر نا خوای گەورە ئەتسوتێنێت.

هەوڵبدە باسی ئیسلام بکە لەماوەیەکی کورتدا، ئەگەر بەقسەی نەکردی لەماوەی ١٠ خولەک بۆ ٢٠ خولەک، دەبێت قۆناغی دووەم بچیتە پێشەوە بە ئاشکرا پێی بڵێیت نەچیتە دەرەوە دەتسوتێنم.

ئەویش هەوڵی ئەوە ئەدات تۆڵەت لێبکاتەوە پێش سووتاندی، بەسوڕەتی زەجرەکان دەیسووتێنیت واتا ئەو سوڕەتانەی کە باسی قیامەت و ئاگری دۆزەخە بۆ نمونە. سوڕەتەکانی- ص و ق- سوڕەتی واقیعە- سوڕەتی ڕەحمان- صافات...هتد. ئەو ئایەتانەی کە پێیان دەوترێت ئایەتی زەجر.

ئەو کەسانەی کە دەیخوێنن پێویستە قورئانخوێنێکی باش بن و بزانن قورئان بە جوانی بخوێنن و بە شێوەیەکی هێمن و دان بنێن بە وشەکان و تەجوید و تەرتیلی تەواو بێت.

هەرچەندە قورئان بۆ خۆی هەمووی هەر دەتوانیت بەكاری بێنیت و بیخوێنیت بۆ ئەوكارە، بەڵام ئەوانەی كە باسم كرد زانایان و ئەوانەی كە لەمەیداندا ئەو كارەیان كردووە ئەزمونی ئەوانە و تاقی كراونەتەوە.

ئەگەر كەسەكە سیحری لێكرابوو لەڕێگای سیحرەوە جنۆكە چووبووە لاشەیەوەو جنۆكەكە خۆی وتی لە ڕێگای سیحرەوە هاتووم، ئەوە زیاتر سورەتەكانی شعراء و قصص ی بەسەردا بخوێنرێت كە باسی چیرۆكی موسایە (i) و باسی ساحیرەكان و فیرعەون دەكات، بەسەریدا بخوێنرێت، لەدوایدا سورەتی جن ی بەسەردا بخوێنرێت.

ئەگەر لەو حاڵەتەدا هەست كرا زۆری خایاند، پرۆسەكە هەر بەردەوام بوو، (جن)ەكە نەچووە دەرەوە هەوڵبدرێت سورەتی یاسین بەسەریدا بخوێنریت و كەسێكی تر هاوكاری ئەو كەسە بێت كە ڕوقەیە شەرعییەكە دەخوێنێت.

پاشان ئاوی سارد بهێنی و دەرخواردی بدرێت، چونكە هەست بەوە دەكەیت كەنەخۆشەكە ماندووە و عارەقی زۆری كردۆتەوە، لە ترساندا هەڵدەلەرزێ و سەرمایەتی.

دەبێت بەسەر جامە ئاوەكەدا سورەتی فاتحە و سورەتی قل- كان و ئایەتەل كورسی بەسەردا بخوێنرێت و دەرخواردی نەخۆشەكە بدرێت دەموچاوی پێ تەڕ بكرێت.

هەرچەندە ئەوەندە زۆر ناخایەنێت، مەگەر زۆر دەگمەن بگاتە ئەو حاڵەتە، ئەگەر لەم قۆناغەدا هەر نەچووە دەرەوە هەر قسەی كرد شمشێرێك، چەقۆیەك یاخود دەمانچەیەك، سیلاحێك هەر شتێك بێت یان

تێلا(داری ئەستوور)یەك دەهێنن و لەبەر چاوی نەخۆشەكە دایدەنێن و دەڵێن ئێستا بەمە لەناوت دەبەین، بەڵام بێ ئەوەی بەكاربێت، بەهیچ شێوەیەك ئازاری نەخۆشەكە نادرێت. پاشان جارێكی تر سەر لەنوێ كردارەكە دووبارە دەكرێتەوە، ئیتر بە پشتیوانی خوای گەورە دەردەچن و نامێنن.

لەوانەیە خەڵكی بڵێن بۆچی جنۆكە دەچنە ناو لاشەی مرۆڤ؟

لەبەر ئەوە خۆشحاڵییە بۆ شەیتان و جنۆكەكان كە كۆنترۆڵی مرۆڤێك دەكەن، ئەوان ڕقیان لە مرۆڤە لەبەر ئەوەی خوای گەورە شەیتانی دوورخستەوە لە ڕەحمی خۆی و مرۆڤی ڕێزدار كرد، وەك سەیرانگاو خۆشی وایە بۆ ئەوان هەروەك ڤایرۆسێك وایە كە خەڵكی تووشی نەخۆشی دەكات ئەمانیش ڤایرۆسی شەیتانن و دەرمانەكەی تەنها قورئانە بۆ دەرچوون.

هەروەها پێویستە حەوت گەڵا لە داری سیدرە بكرێتە ناو ئاوەوە، ئەم ئاوە دەبێت ئەوەندە بێت كە بتوانێت غوسڵی پێ دەربكات.

پاشان سوڕەتەكانی الفاتحة، الإخلاص والفلق والناس بەسەر ئاوەكەدا بخوێنرێت، دوای ئەوە چەند قومێک لە ئاوەكە بخواتەوە و بە باقی`یەكەی غوسڵ دەربكات.

ئەگەر گەڵاكە دەستنەكەوت ناوی هەر گەلای دارێک كە لە قورئان دا هاتبوو وە لە میوەكانی بەهەشت بوو، وەك گەڵای هەنار، گەڵای مۆز وە گەڵا مێو...هتد دەتوانرێت بەكار بهێنرێت. بەڵام باشترینیان سیدرە یە.

هەندێك دیاردەی واقیعیتان بۆ باس دەکەم کە لەشاری سلێمانی ڕوویداوە.

لەوانە:

خانەوادەیەك لەماڵێکی خۆشدا دەژیان لە شاری سلێمانی، ئەم ماڵە گیرۆدە بوون بەدەست ئەوەی هەموو ڕۆژێک ماڵەکەیان کۆدەکردەوە، بەڵام دووبارە دایاندەپژاند بەسەر یەکدا و بەماجیك و قەڵەم لەسەر دیوارەکان دەنووسرا. دەبێت هەمووتان شێت بکەین و لەناوتان بەرین، ئیتر وایان لێهاتبوو ژیانیان لێ تاڵ بوبوو. هەرچی جلو بەرگیان بوو لەناو کەنتۆر و بۆفیەدا دەهاتە دەرەوە و قاپ و قاچاخیان بڵاو دەکرایەوە و دەشکا.

پەیوەندییان کرد بە برایەکمان لەسلێمانی چوو بوو کە تەماشای حاڵەتەکەی کردبوو هیچ ڕووی نەدابوو. پێی وتبوون بادانیشین لە قاتی خوارەوە بزانین چی ڕوونەدات. دانیشتبوون دوای ماوەیەك تەماشایان کردبوو هەمان کردار ڕوویدا بوو، لەسەر کاشی ماڵەکە بە ماجیکێك نوسرابوو ئەگەر نەچنە دەرەوە لەم ماڵەدا ئەم ماڵە دەکەینە جەهەنەم لێتان!

ئەو برایەمان پێی وتبوون ئەتوانم هەموو منداڵەکانت ببینم؟ هەموویان هاتبوون تەنها کچێکیان نەبێت، تەئکیدی کردبووەوە ئەمە هەموو منداڵەکانە؟ خاوەن ماڵەکە وتبوی نا یەك کچی ترمان هەیە ڕووی نەهاتووە بێت، ئەو برایە جەختی کرد و داوای کردبوو کە بیبینێت بەتایبەت ئەو کچەیان.

بۆی گێڕامەوە وتی: كەهات یەكسەر زانیم جنۆكەی تێدایە، دەستم كرد بە خوێندنی ڕوقەیە شەرعی لەبەردەستمدا بووڕایەوە، جنۆكەكە دەستی كرد بەقسە كردن لە لاشەیدا، پرسیم بۆ وا دەكەن لەم ماڵە؟

پێم بڵێ كێیە وادەكات لەم ماڵە؟

(جن)ەكە وتی: ئەم كچەیە وادەكات، ئێمە پێیدەكەین و بە خێرایی دەیبەین و هەموو ماڵەكەی پێ تێك ئەدەین بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت و دەیهێنینەوە. كەسیش نازانێت ئەوەندە بەخێرایی كارەكەی پێدەكەین. تاكو ئەو برایەمان جنۆكەكەی لەلاشەیدا دەركردبوو. ماڵەكەش ماڵێكی ناسراون و یەكێكە لەدەوڵەمەندەكانی شار.

لەو ماڵەدا كۆتایی هات بەو حاڵەتەدا سوپاس بۆ خوا ئێستا هیچ كێشەیەكیان نییە.

مەبەستم لەم باسەدا ئەوەیە كەبزانن ئەم حاڵەتانە ڕووئەدات هەست بكەن كەسێكە لەماڵەكەدا ئەوە دەكات، بەڵام جن پێی دەكات ئینجا خەڵكی زۆر دەبن بەملاولادا بە خێرایی و بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت.

حاڵەتێكی تری بۆ گێڕامەوە كە هەر لەشاری سلێمانی ڕوویداوە. لە ماڵێك هەموو بەیانییەك پێش ئەوەی هەڵسن لەخەو نان ئامادە كراوە و چا لێنراوە و هەموو شتێك ئامادەیە.

ژن و پیاوەكەش دەڵێن ئاگامان لە هیچ نییە.

ئەو برایەمان بە پیاوی ماڵەکەی وت: هەوڵبدە شەوێك نەخەویت و چاو بخە سەر چێشتخانەکە. پیاوەکە تەماشای کردبوو لە خێرایەکی بێوێنەدا ژنەکەی هەڵدەستێ هەموو شتەکان ئامادە دەکات و دێتەوە دەخەوێت.

بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێت، دوای ئەوەی بەو برایەمان دەڵێت ئەویش دەچێت دەڵێت ژنەکەت جنۆکەی لە لاشەدا یەو دەری دێنێت و حاڵەتەکە کۆتایی دێت، ئەو جنۆکەیە لەلاشەی ئەو ژنەدا بووە جنۆکەیەکی موسڵمان بووە، هەر حەزی کردووە خزمەت بەوماڵە بکات، بەڵام ئەو برایەمان وتی بەقسەی کردم و دەرچوو زۆر بەئاسانی.

زۆر جار جنۆکە دەچێتە دەستی نەخۆشەکە دە پیاو یان چەند پیاوێك بەئاسانی بۆیان ناجولێت، یاخود قاچی. ئەم حاڵەتانەش ڕووئەدات، ئەگەر ئەوەندە بەهێز بوو نەخۆشەکە بزانن ئەوە جنۆکەیە.

# پاشكۆی باس

یەكێك لە شێوازی پەروەردەی مرۆڤ، یاخود بونیادنانی مرۆڤ لەسەر بنەمایەكی ئایدۆلۆژی و یان ڕوونتر بڵێم كاریگەری دروست كردن لەسەر ناخی مرۆڤەكان ژێرخانێكی مەعریفی پێبەخشێت لەزمانی فیكردا پێی دەوترێت (ئەبستمۆلۆژیا)؛ پێویسە قسە لەگەڵ ناخی بكەیت تا بتوانیت لە ڕێگای ئەو شێوازەوە پەیامی خۆت تێبەگەینیت، ئەوەی لە مێشكیدا چەسپاوە بیسڕیتەوەو ئەبدەیتی زانیاری بكەیت لە مێشكی بەرانبەردا بەو شێوەیەی تۆ ئەتەوێت.

ئەمەش بەزانستێكی نوێ دەبێت كە ناوی: (بیردۆز و مۆدێلێكی ڕەفتاری مرۆڤ پەیوەندیەتی لەسەر بنەمای تێگەیشتنی زمانەوانی) بە كورتكراوەیی ئینگلیزی) ئەم زانستە نزیكەی ٣٥ ساڵە دامەزراوە. ناسراوترین زانای ئەم بوارە (P.L.N ) ناوی (هیملتۆن ئەریكسۆنە) خەڵكی ئەمریكایە و لە نەژادی جولەكەیە ئەم شێوازە ئوسلوبێكی گرنگە بۆ تێگەیاندنی بەرانبەر بەبێ ئەوەی داوای لێبكەیت خۆی شوێنت دەكەوێت؟ ئەمەش ئەگەر دەرفەت بوو ئەو كۆڵ بارەی لەسەر شانمە لاچوو بە پشتیوانی خوا- نامەی دوكتۆراكەم لەسەر ئەم تێزە دەبێت، لە زانكۆی زانستە مرۆییەكانی لەندەن، لەشێوەیەكی ڕەخنە ئامێزدا لەو زانستە، چونكە پێش ٣٥ ساڵ لەمەبەر وەك ئاماژەمان پێدا ئەم زانستە دامەزراوە.

ئەکادیمیایەکی ئاسمانی بەناوی ئەکادیمیای محمد (ﷺ) ئەو پەیام و میتۆدەی فێری موسڵمانان و مرۆڤایەتی کرد بەگشتی لەڕێگای پەیامەکەی خوای پەروەردگارەوە لە زانکۆی پێغەمبەرایەتی دا بەناوی القرآن.

﴿.... فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [الأعراف]

واتە: ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەرەوە بۆ ئەوەی (دابچڵەکێن و بیربکەنەوە.

ئەگەر بەسەرهاتەکە ڕاست بێت ئەوە باشترو کاریگەری زیاتر دەبێت، ئەگەر بەسەرهاتەکە ڕاست نەبوو تەنها گێڕانەوەی نمونە بوو بۆ تێفکرین و تێگەیشتن ئەمەش هیچ کێشەیەکی تێدانیە، چونکە خوای گەورە هەمان شێواز و ئوسلوبمان فێر دەکات و دەفەرموێت (محمد) نمونەیان بۆ بێنەروە.. وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا جا ئەم ئوسلوبی نمونەو مەسەلە لەناو قورئاندا زۆرە واتا واقیع نیە، بەڵکو تەنها نمونەیە بۆ تێگەیشتن.

ئەوم شێوازانە هەمووی خوای گەورە لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە وەك زانستێکی پەروەردەیی هەموو کۆمەڵگای جاهیلی ئەو سەردەمی گۆڕیوە بەقورئان.

## ئامانج لەباسی مەملەكەتی شەیتان.

ئەوەی لای نووسەر گرنگە زانیاری ناو باسەكەیە، زانیاری تەندروست بدەین بە خەڵكی لەسەر ئەو باسانەی شەیتان و جنۆكەكان، كە هەموو باسی بیروباوەڕە لە باوەڕەوە سەرچاوەی گرتووە. هەوڵمانداوە كە خوێنەر بەچاوی مەخلوقاتێكی ئاسایی تەماشای جنۆكەو شەیتانەكان بكات و كاریگەرییان بزانێت كە وەك ڤایرۆسێكە. بە شۆردنی بە ئاو و صابوون و دەرمانی تایبەت لەناو دەچێت، (جن) جۆرێكە لەمەخلوق هاوشێوەی ڤایرۆسە دەچێتە ناو لاشەی مرۆڤ ئەمیان بە صابون و دەرمان لاناچێت، بەڵكو بە زیكری خوای پەروەردگار و دینداری و خواناسی لەناودەچێت، ئامانجەكەم ئەوە بووە زیاتر كە پێتان بڵێین تۆی مرۆڤ بەهێزتریت و خوای گەورە ئەم كەونەی موسەخەر كردووە لەبەردەستی تۆدا و تۆ خەلیفەیت و ئەوان هیچ بەدەستن.

كاریگەری باسەكە..

هەوڵمانداوە لەباسەكەدا خەڵكی زیاتر دیندار بێتەوە و خواناسییەكەی بەهێزتر بكات و ئیمانی زیاتر پتەو بێت بە پەروەردگاری و ئاڵای یەكتاپەرستییەكەی هەمیشە بشەكێنێتەوە، دوور بكەوێتەوە لە شیرك و سیحرو نوشتەو جادوو و سەرفكردنی پارەو سەروەت و سامان لە شتی پڕوپوچدا و دووركەوتنەوە لە خورافات و قسەی بیماناو بەتاڵ.

پاشان ویستومانە راستەخۆ خۆتان مامەڵە بكەن لەگەڵ واقیعی ناو باسەكەدا و تۆ دەست بدەیت لەجنۆكەو خۆت دەربیكەیت، هەست

بکەیت خۆت وەك خوێنەر کاراکتەری ناو باسەکەیت. لەهەمانکاتدا فێرت بکەین کە چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت.

گۆڕانکاری لە واقیعی ژیانی ڕۆژانەتدا:

ئەو کەسانەی کە ترسنۆك بوون لەدوای خوێندنەوەی ئەم باسە ئازا دەبن لە بەرانبەر جنۆکەو شەیتانەکان و جادووبازەکاندا. ئەم باسە وای لێکردووە گۆڕانکاری پێدەکات و هەست بە ئازابوونی خۆی و زاڵبوونیەتی بەسەریاندا و لاوازی ئەوانی بۆ دەردەکەوێت.

رۆژانە هەوڵی ئەوە بدات کە بەردەوام بێت لەسەر زیکرەکان و مێشك و هزری فراوان بێت لە ئاستی ئەو ساحیرو جادووبازانە و ئەوانەی کە لە لاکۆڵانەکاندا خەریکی قاوەگرتنەوە و نوشتە نووسین و فاڵگرتنەوەن بەناوی شێخ و مەلاوە سەرقەڵەمانە لەخەڵکی وەربگرن، بەدەستوخەتێکی شەڕە پشیلە تەنها بۆ وەرگرتنی پارەیە لەخەڵکی و هیچی تر.

هەستمان بەوە کردووە کە گۆڕانکاری ڕوویداوە لە ناخی خوێنەردا بەوەی کە دەزانێت ساحیر چییەو چ جیایان دەکاتەوە لە پیاو چاکوخواناسەکان، لەهەمووی گرنگتر حەزکردنە بە خوێندنەوە و زانیاری زۆر و شیکاری کەمی بدەینێ کە خۆی بڕوات ماندوو بێت و هەوڵی جدی بدات بۆ بەدەستخستنی زانیارییەکان.

ئایا ئەم باسە ڕاستە؟

بەدڵنیاییەوە ئەم باسە هەمووی واقیعەو ڕوویداوە هیچ خیلافێکی تێدانیە، بەڵام ئەوەی کە ناڕاستە ناوی کەسایەتییەکان و گۆڕینی جێگاو شوێنیانە بۆ

ئەوەی کاریگەری کۆمەڵایەتی لەسەریان دروست نەبێت، هەموو ئەوانەی کەباس کراوە لە جنۆکەو شەیتان و کاراکتەری باسەکان بە دیکۆمێنت و قسەوباسی خۆیان لەبەر دەستی نووسەردا هەیە.

ئەوەی دەیەوێت سوودی لێوەربگرێت بۆ لێکۆڵینەوە و باسی ئەکادیمی ئەوکات دەتوانێت داوابکات و لە ڕێگای دەزگایەکی ئەکادیمیەوە ئێمەش هەموو سەرچاوەکان بخەینە بەردەستی و پێی بڵێین ئەمە ئەصڵ و بنەڕەتی باسەکانەو ئەمەش دیکۆمێنتەکانمانە فەرموو لێکۆڵینەوەی خۆتی پێ بکە، بەڵام تەنها لەبەر حوورمەتی کەسایەتییەکان ناوەکان و جێگاو کاتەکان بگۆڕە بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە لە ناو کۆمەڵگاداو کاریگەری خراپ لەدەروونی خەڵکی دروست بکات و لەسەر ئەوانیش ببێتە کارێکی قورس و بەچاوێکی ترسناك تەماشا بکرێن.

لەدوعای خێر بێبەشمان مەکەن.

فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ

جا لە ئایندە دا ڕۆژێك دێت، ئەم قسانەی منتان بێتەوە یاد ئێستاکەش من خۆم و کار و بارەکانم دەدەمە دەست خوا و پشت بە خوا دەبەستم، چونکە بێگومان خوا بینایە بە بەندەکانی.

# باسێكی كورت لەسەر ناوی ئەو گرووپو ڕێكخراوو ئایینو مەزهەبانەی لە كتێبەكەدا ناویان هاتووە

## بـــــاطنی

باطنییەكان: دوو كۆمەڵە بوون لە فاطمییەكان جیاببوونەوە، كۆمەڵێكیان كوڕانی(مستعریه)یان پێ ئەوترێ، كۆمەڵەكەی تریش پێیان ئەوترێ (نزاریه)، مستعرییەكان توانیان سوڵتەودەسەڵاتی فاطمی بگرن بەدەستەوە، بەڵام نزارییەكان لەڕێگای مونەزیرێكیانەوە كەناسراوە بە (حسن كوڕی صباح)یان (ابن صباح) لەگەڵ (ابن عطاش)دا هەردووكیان جیا ئەبنەوەو دێن بۆ ناوچەكانی شام، لەوێ بەدرۆ خویان بەئەهلی سوننەت نیشان ئەدەن تا ئەچنە ناوجەرگەی دەوڵەتی ئیسلامی‌یەوە. دوای ئەوەی چەند قەڵاو جێگاو قولەیەك ئەگرن لەموسڵمانان لەوێدا دەوڵەتی خۆیان درووست ئەكەن.

(حسن كوڕی صباح ) یەكەم كەس بوو حەشیشەی دۆزی یەوە بۆیە پێیان ئەوترێ شیعەی حەشاشین یان شیعەی اسماعیلی حەشاشین، سەرەتا كە ئەم گوڵەی دۆزییەوەو باخچەیەكی دروست كرد وناوی نا (بەهەشت) گوڵەكە ناوی خەشخاشە.

ئافرەتی ئەكردە ئەو باخچەیە بەردەوام خەڵكی خومار ئەكرد وە پێیانی دەوت ئەگەر ئێوە لەم بەهەشتە بمێننەوە بەخۆشی وشادی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا ڕائەبوێرن و بەردەوام خوماریشن، هەركارێكی پێ بكردنایە ئەی ناردن وە دواتر بەهۆی تلیاكەكەوە ئەبوایە بگەڕانایەتەوە بۆلای حسن

کوڕی صباح، وە زۆربەی زۆریشیان ئەکوژران و ئەگیران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وازیان نەئەهێنا لەبەرئەوەی حسن کوڕی صباح هەموویانی فێری تریاك و حەشیشە کردبوو، بۆیە ئەمانە لەمێژوودا ناسراوان بە (ئیسماعیلی حەشاشین) زۆربەی زۆری ئەهلی سوننەو جەماعەت بەدەستی باطنی یەکان شەهید ئەبوون، ئەوە ئەو تواناو هێزە حەشیشەییە بوو کەلەوسەردەمەدا تازە دۆزرابووەوە.

شایەنی باسە حسن کوڕی صباح وئیبن وعطاش دووکەسی پیسو ناپاك بوون، زۆرێك لەئەهلی سوننەت و جەماعەتیان شەهید کردوە، بەردەوام دەستیشیان تێکەڵ بوولەگەڵ صەلیبییەکاندا، ئەمانە باوەڕیان بەنوێژی ئیسلام وپێغەمبەر (ﷺ) نەبوو هەر دین بیروباوەڕێکی تایبەت بوو بۆ خۆیان دروستیان کردبوو،هۆکارێك بوو کەخۆشیان نەیان دەزانی باسی چی ئەکەن، هەتاکو (ئیمامی غەزالی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت کەخۆی چووە ناویانەوە دواتر زانی ئەمانە چەنە خراپە کارن کتێبێکی لەسەریان نووسی بەناوی(فضائح الباطنية).

## غنوصـــــی

(فەلسەفەیەکی کۆنی هیندیە gnosticism) غنوصی: یاخود گنۆستیسم تێکەڵکراوی کۆمەڵێك باطنیاتی ئایینەکانی هیندستانە، هەروەها تێکلاوی فەلسەفەکانی ترە، هەمووی تێکهەڵ کێشکراوە لە ڕووی عیرفانیتەوە ناونراوە بە گەنوسی، ئەم ناوە نوێ بۆی داتاشراوە، کۆکراوەی ئایینە بتپەرستیەکانی هیندساتە، دابڕانە لە جیهانی ماددی ئاوێتە بوونە بە جیهانی ڕۆحانی.

واتای فەلسەفی گەنوسی: راڤەو مانەی جیاوازی مەعریفی و ڕۆشنگەرایی و ڕزگار بوون و ئازاد بوونە بۆ ئەوەی یەکبگریت لەگەڵ خودای کردگاردا! بۆ پەیڕەوکردنی ئەم پرۆسەیە لەڕێگای زوهد و بەخشینی سەروەت و سامان بە هەژاران و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی حیکمەت لە ڕێگای چاکە کردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

ئەم فەلسەفەیە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ ١٠٠ ساڵ پێش لەدایك بوونی عیسا (i)، جۆری گەنوسەکان زۆرن ناوی هەر گەنوسییەك لکێنراوە بە دامەزرێنەرەکەیەوە، بۆ نمونە: گەنوسی ڤەلاتاین دامەزرێنەی ڤەلیتینوسە، گەنوسی باسیدیلی دامەزرێنەرەکەی باسیدلیدز، گەنوسی مارسیۆنی دامەزرێنەرەکەی مارسیۆنە وە هەروەها.

گەنوسییەکان بڕوایان به دوو خودا هەیە: خودایەك کە باڵا دەستە لە گەردووندا نادیارەو شاراوەیە، خودایەکیتریش کە ماددیە یان خودای خراپەکاری ناوی دەبەن! ئەم خودا خراپەکارە دنیای ماددیی دروستکردووە تەنانەت خودی مرۆڤ ئەو دروستی کردووە بەوپێیەی گوایە کە مرۆڤ ماددەیە بۆیە گەنوسییە پێیان وایە خودای ئیسلام و یەهود خودایەکی خراپەکارە، چونکە هەموو شتێکی ماددی ئەو دروستی کردووە، تەنانەت زەردەشتییەکان هەرگیز خودای ئیسلام و ئایینەکانی تر بە درۆ ناخەنەوە بەڵکو بڕوایان بەبوونی خودا هەیە، بەڵکو بە ئەهریمەن ناوزەدیان کردووە.

جیهان بینی گەنوسییەکان وایە: کە خودای ماددە رۆحی مرۆڤەکانی زیندانی کردووە لە لاشەیدا بڕوایان وایە کە خودای شاراوەکە واتا خودای نادیار تێکەڵ بووە لەگەڵ لاشەی مرۆڤەکاندا، ئەم خودا نورانیە وای کردووە

كە لەناو ناخی مرۆڤدا خۆی جێگا بكاتەوە شێوە بوونی خودایەك بوونی هەیە لە لاشەی هەموو مرۆڤێكدا!

وەك لێدانی دڵ لەناخی مرۆڤەكاندا یاخود لە ڕۆحیاندا خۆی جێگا كردۆتەوە. پاشان چۆن دەتوانن ڕزگاریان ببێت لەم خودا ماددییە كە دروستی كردون، لەڕێگای ئەو بوونی خودا نادیارەی كە لە لاشەیاندا هەیەو خۆیان ڕزگار دەكەن بە هۆكاری عیرفانییەت تا یەك دەگرن لەگەڵ ئەو خودا نورانییەكە كە خودای ئەزەلییە (ئیتحادی خودایەتی پێدەوترێت، هەر ئەمەش بوو حەلاج بڕوای پێی هەبوو)! ئیتر بۆ دواجار لە خودای ماددییەوە ڕوودەكەنە ئەو خودا نورانییەو دەچنە لای ئەو بە خلودی هەمیشەیی دەمێننەوە.

پێچەوانەكەشی ئەگەر نەیتوانی خۆی ئازاد بكات لەو لاشە مادییە، بەڵكو كاتێك لاشەكەی دەمرێت ڕۆحەكەی دەچێتەوە ناو لاشەی یەكێكی دیكەوە بەردەوام بە زیندانی كراوی دەمێنێتەوە و زۆر جار بە هۆكاری تاوانی زۆری لاشەی، ڕۆحی تێكەڵ دەبێت بە لاشەی ئاژەڵ و خشۆك و مێرووەكان ئەوانەی كە باش بوون فریای خۆ رزگار كردن نەكەوتون دەبنە باڵدار و باڵندە كان ڕۆحیان لە لاشەی ئەواندا زیندانی دەبێت.

ئەم پرۆسە بەردەوام دەبێت تا ئەو كاتەی مرۆڤەكان خۆیان رزگار دەكەن لەڕێگای خودای نورانییەوە بە چاكەو عیرفانییەت، یاخود ڕۆحیان زیندان دەبێ لە لاشەكاندا.

# نوێـــگەرەکان

نوێگەرەکان: قوتابخانەی مەزهەبی نوێگەریی، لە سەرەتایی سەدەی نۆزدەوە دامەزراوە، بەڵام پێشتر کاری بۆ کرابوو لە لایەن زاناو بیرمەندانی ڕۆژئاواوە.

پێناسەی ئەم قوتابخانە فیکریە ئەدەبییە: لەسەر بنەمای فیکری مارکسی و فرۆیدی و وجودی و داروینییە، زیاتر لەسەر بنەمای فەلسەفی ئەدەبی سریالی و ڕەمزییەکانە، واتا کار دەکات بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرە بیروباوەڕێکی ئاینی و لەناوبردنی دەستووری دینی و هەموو شەریعەتێك، جا- ئاسمانی بێت یاخود لەسەر زەوی، سنور تێدەپەڕێنێت بە هەموو کلتور و بەهایەکی ڕەوشتی و ئاکاری کۆمەڵایەتی، گرنگی تەنها بۆ خۆشی و ئازادیە ڕەهاکان دادەنێت بۆ مرۆڤ، ڕۆحێکی شۆڕشگێری ئەداتە خاوەن مەزهەب و هەڵگری فیکرەکە.

ئەم مەزهەبە فیکریە لە فەڕەنسادا دروست بوو لەسەر دەستی چەند ئەدیبێکی فرەنسی عەلمانی بێدین لە پاریس لە بەناوبانگترینیان

شارل بودلێر ١٨٢١-١٨٦٧ز ئەم بیرمەندە عەلمانیە لەسەرەتایی بانگەشەی نوێگەرییەوە، بانگەشەی ئازادی سێکسی و نەمانی هیچ جۆرە بەهایەکی ڕەوشتی کرد و خاوەنی دیوانی گوڵە شەڕخوازەکانە کە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی فارسی و عەرەبی زۆری تر لە زمانەکانی جیهان.

گوستاف فلوبیر ١٨٢١-١٨٨٠ز یەکێك لە وتەکانی ئەم بیرمەندە و ئەدیبە عەلمانییە ئەوەیە دەڵێت خراپترین و قەبیحترین کار هاوسەرگیرییە!

مالا رامیە ١٨٤٢ - ١٨٩٨ز شاعیرێکی ڕەمزیی فرەنسییە.

بۆ زانیاری خوێنەر: پاشان لە رووسیاوە زیاتر گرنگی پێدرا لەلایەن ئەدیبی ناسراو

(مایکۆفسکی) بانگەشەی لە بازدان بەسەر رابردوودا و دەرچوون بەرەو داهاتووی کرد.

پاشان لە ئەوروپا بەگشتی بڵاوبوویەوە تا گەیشتە وڵاتانی ئیسلامی لەسەر دەستی یوسف خالی نەصرانی و ئەدۆنیس کە ناوی خۆی عەلی ئەحمەد سەعیدە لە بەرئەوەی ناوەکەی ئیسلامی بوو گۆڕی بە ئەدۆنیس، ئەدۆنیس واتا خوای فینقییەکانە و لە حیزبی شوعی سوری کاری دەکردو لە نوصیرێکانە، دوایی بەزۆر حیزبەکە تەعەدایان لە ژنەکەی کرد لەبەر چاوی خۆیدا، لەو سەردەمەوە دژایەتیان دەکات و بوو بەیەکێک لە هەوادارانی میلیشیای مارۆنی لە لوبنان خاوەنی چەند کتێبێکی کوفری و بێباوەڕییە بە خوا، تەنانەت بە ئاشکرا قسە بە ئیسلام و بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی دەڵێت.

زۆری تر لەوانە وەك- نزار قەبانی لە سوریا- محمود دەرویش لە فەڵەستین- عەبدولعزیز ماقالح لە یەمەن، عەبدوڵا عروی لە مەغریب، عەبدولوەهاب بەیاتی لە عێراق، شێرکۆ بێکەس، لە هەرێمی کوردستان و زۆری تر.

ئەم بیرە تەنها کار بۆ ئەو دەکات دین نەهێڵێت و ئاکاری ڕەوشتی لەناو خاڵکیدا کاڵ بکاتەوە گرنگی بە پایەکانی سیکۆلاریزم بدرێت.

## زەردەشتییەکان

زەردەشتییەکان: باوەڕی زەردەشتی، لە ئایینی زەردەشتیدا ئاهورامەزدا بە خوای چاکە ناوزەد کراوە، ئەهریمەن بە خوای خراپە دانراوە. هەمیشە ئەم دوو دەسەڵاتە کە لە ناو زەردەشتییەتدا بە خوا ناسراون لە کێشمەو وەرگرتنی دەسەڵاتدان بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە دەست یەکتری. ئەوەی کە جێگای سەرنجە ئەم دوو خوایە لە خوایەکی کەوە سەرچاوەیان گرتوە کە ناوی (زەروان) کە گوایە "زەروان" لەمەولاوە دەسەڵاتی خۆی بەخشیوەتە دەست ئاهورامەزدا بۆ چاکە، بەڵام ئەهریمەن ئەمەی پێ ڕەوا نییە بۆیە کەوتۆتە گیانی شوێن کەوتوانی ئاهورامەزدا. ئەگەر باوەڕێك لە سەر ئەم شێوەیە دامەزرێت خواکان لە دەسەڵات لە یەکتری سەندنەوەدا بن ئەو کات ژیان بەرەو لە ناو چوون و مرۆڤەکانیش بەرەو فەتارەت دەچن.

کەواتە ئەم ئایینەی کە ئێستا بانگەوازی بۆ دەکەن هەڵخڵەتاندنی گەلی کوردی موسڵمانە وبیرێکی پوکاوەی سەردەمی ساسانیەکانە کە ئێستا ئەیانەوێت بە ناوی هێنانەوە کایەی دەوڵەتی کوردی کە گوایە وەك زەردەشت بانگەوازی بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی کردبێت وا ئێستا دەیانەوێت بە بیری زەردەشتی دەوڵەتی کوردی دامەزرێنن، کە تەنانەت بنەمایەکی یاسایی لە ناو ئەو ئایینەدا نەماوە یان بە سرودی ئەی ڕەقیب کە شانازی بە کەیخوسرەوە دەکەن وە خۆیان بە نەوەی ئەو دەزانن کە لە کاتێکدا دەوڵەتی ماد بەدەستی ئەو لە ناو چووە.

کەئیسلام هات کۆتایی هێنا بە پیرۆزترین شتی زەردەشتی کە بریتی بوو لە میزی گا، ئایینی پیرۆزی ئیسلام چاکەیەکی تری خستە سەرشانی کورد یاسایەکی تری ئاوێستای و زەردەشتی تریشی نەهێشت کە بریتی بوو لە (ڕەدووکەوتن) یان (هەڵگرتن) کە لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا وای لێهاتبوو کچەکان و ژنەکان لە ماڵەکاندا زیندانی دەکران نەوەک و پیاوێک ئایینی زەردەشتی وە یان موغێك یاڽ ئەتروبانێك وە یان ڕۆحانییەك ڕەدووی کات و ئیتر کە دووری خستەوە لە جێگای خۆی ئەوکات ئەو دەبێتە خاوەنی ئەو ئافرەتە، هەرچەندە بە داخەوە ئێستاش لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا ئەو مەراسیمە ماوە، بەڵام گۆڕانکارییەکی تەواوی بەسەردا هاتوە گوایە ئێستا ئەگەر دوو کەس یەکتریان بە دڵ بێت هەڵی دەگریت و دەیبات، بەڵام بۆ دەیبات بۆ لە خۆی مارە ناکات خێرا؟

پاشان بە نەمانی ئەم ئایینە و مەرسیمەکانی کورد ڕزگار بوو بەتایبەت لاوانی کورد بە کچان و کوڕانیە وە لە دەست بە قوربانی کردن، چونکە ئەگەر ئاتەشگەیەکی تازەی زەردەشتی بکرایەتەوە دەبوو کچێك بکرایەتە قوربانی و پێشکەشی ئاتەشگەکە بکرایە، خۆ ئەگەر کچێك دەست نەکەوتایە ئەوا کوڕێکی نابالغ یان دەکردە قوربانی کە (ئولاڤ ئوشیم) لە کتێبی مێژووی گەیشتن بە دەسەڵاتی خۆیدا باسی کردووە!

گەلی کوردی موسڵمان هەمیشە شانازی کردوە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە لە بەر ئەوەی ئەوەندەی ئێمە سوودمان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بینیوە ئەوەندە سوودمان لە هیچ بیرو باوەڕێکی کە نەدیوە بە تایبەت نازانین ئێستای بیری زەردەشتی وە لە پێشینەشدا چ خزمەتێکی بە میللەتەکەی من کردوە تا ئەو بیرو باوەڕە جێگەی سەرنجی من بێت، تەنها

ئێستا وەك قسەی زل یان ڕەق یان قسەی نەزۆك یان زۆڵەك دەیدەن بە گوێی میللەتەکەمدا، کە تەنها دەیانەوێت داماڵینی ئەو کولتورە موسڵمانییەی گەلی کورد دابماڵن.

## بودا و بوداییەکان

بوداییەکان: بودییزم یەکێک لە ئایینەکانە لە نیمچەدوورگەی هیندستان و بریتیە لە کۆمەڵێک سوننەت، بڕوا، عەمەلی ئایینی کە لە وانەکانی سیدارتا گاوتاما (ناسراو بە بودا) سەرچاوەیان گرتووە. بوداییەکان باوەڕیان بە تەناسوخ هەیە.

گاوتاما بودا یان سیدارتا گاوتاما یان شاکیامونی یان بودا مامۆستای ئاینی هیندستانی کۆن بووە و دامەزرێنەری بودیزمە. وشەی بودا بە مانای لەخەو هەستاو یان ئاگاپێدراوە. کاتی لەدایکبوون و مردنی ڕوون نییە، بەڵام مێژوونووسان سەدەی شەشەم یان پێنجەمی پێش زایین بە کاتی ژیانی دەزانن. ناوی ئەم بودایە سیدارتایە.

ئەمڕۆ وڵاتی چین زۆرترین ڕێژەی بودایی تێدایە کە دەگاتە زیاتر لە ٢٤٤ ملیۆن کەس و ١٨.٢٢٪ی دانیشتووانەکەی پێک دێنێت و تایلەند بە پلەی دووەم کە ڕێژەکەی دەگاتە ٥٥ ملیۆن و ڤێتنام و میانماریش بە پلەکانی سێهەم و چوارەم دێن لە زۆری پەیڕەوکردنی ئاینی بودا.

# مانی و مەزدەکی

## مانییەکان: فەلسەفەی مانی مەزدەکی چییە؟

مانی هەندێك بە پێغەمبەری سێیەمی ساسانی دەناسن، کە لەمێژووی ئەواندا هاتووە. لێرەدا باسی مێژووی ناکەین بەڵکو تەنها باسی فەلسەفەی مانیزم دەکەین کە تێکهەڵکێشراوی ئاینی مەسیحی و زەردەشتی و بوزییە، ئەم بیروباوەڕە وەك مەزهەبێکی زەردەشتی وابوو، بۆیە تا رادەیەك موغەکانی زەردەشتی قوبوڵیان کرد، بڕوای بە لەدایك بوونی جوتە خوایەك هەیە، کە هەتا هەتایە بەیەکەوە دەمێننەوە ئەویش خوای شەڕو خوای چاکەیە، بۆیە زیاتر کاریگەری ئاینی زەردەشتی لەسەر بوو، زوو ئەم مەزهەبە بڵاو بوویەوە بە هۆکاری فەلسەفی ئاکارو ڕەوشت و نزیك بوونەوە لە ئیۆصۆفیزم بوو کە شوێن خوای حیکەمت کەوتبوون، هەوڵی ئەدا بۆ ئەوەی کە مادام خوای چاکەو خراپە هەیە پێویستە ئیتر لاشە زۆر نەبێت و ڕۆحیش نەمێنێت، تەنانەت ژن و ژنخوازی حەرامکرد بۆ ئەوەی چیتر نەسل و لەدایك بوون نەمێنێت.

هەر ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە یەکێك لە پاشاکانی ساسان کوشتی.

مانیزم تێکەڵاوی ئاهورای زەردەشتی و خودی زەردەشت لە گەڵ روح قدوسدا شوبهاند بە باوك و کوڕ و ڕۆحی قدوس، خۆشی لە بنەماڵەیەکی مەسیحی بوو لەساڵی (٢١٦- ٢٧٦) ز ژیاوە، لە سەردەمی شاپوری پاشای پارسەکاندا دینەکەی بە فەرمی ناسرا وکاری پێکرا بە هۆکاری بەدرەوشتی موغەکانی زەردەشتی کە قۆرخی ئابوری ئەوکاتەی ئێرانیان کردبوو، لە

سەردەمی ساسانییەکاندا موغە زەردەشتییەکان کوشتیان، بەڵام کاریگەری فەلسەفی لەسەر خەڵکی و موغەکانی ئەو سەردەمەی زەردەشتی جێهیشتبوو لە رووی ئاکارو ڕەوشتەوە، باسی یەکسانی نێوانی چینەکانی دەکرد.

بۆیە لە دوایدا یەکێك لە پیاوە ئاینییەکانی زەردەشتی بەناوی (مەزدەك) مەزهەبێکی دیکەی نوێی لە ساساندا دامەزراند هەر لەسەر بنەمای زەردەشتی، (٥٢٩)ز کۆچی کردووە. ئەم پیاوە فەلسەفەیەکی داهێنا لە دەوڵەتی ساساندا یەکسانی دامەزراند لەنێوان خەڵکدا وەکو ئەم فیکرە شوعییەتەی ئێستا هەیە واتا «ئیشتراکیەت» وتی هەموو خەڵکەکان یەکسانن.

ئەمە بەڕوکاری شتێکی جوان و ئاساییە، بەڵام لەناوەڕۆکدا خەڵک وایلێهات نەیاندەزانی ئەرک و مافی خۆی چییە؟ ڕێزی خەڵک نەئەگیرا، وای لێهات خەڵکی لەسەروەت و ساماندا یەکسان بوون، بەهەمانشێوە بەرامبەر ئافرەتیش یەکسان بن، واتە هیچ کەسێك خاوەنداریێتی هیچ شتێك نییە ئەو شوعییەتەی کە ئێستا خەڵك ئیشی بۆدەکات ئەمەش «مەزدەك» دایناوە، هەتاکو مارکس لە دواییدا گەشەی پێداوەو بەناوی مادیەتی فیورباخی یان ڕاڤەکردنی مێژوو و مەسەلەی دیالەکتیکی هاتوەو کاری لەسەر کردووە تا بوەتە ئایدۆلۆژیەك و خەڵکێك شانازی پێوە دەکات.

ئەمەش خەڵکی بەهێز دەچوونە سەر ماڵی خەڵکی لاوازو تواناو دەسەڵاتی نەبوو پارەو ژنی داگیر دەکرد، شوعییەت ببوە دینی سەردەمی کیسرا بەناوی قوبادەوە بوو، لەو سەردەمەدا شتێك دروست بوو لە ناو یاسای

زەردەشتیدا بەناوی .. ڕەدوکەوتن و بردنو ڕفاندنی ئافرەت.. یاخود موڵکداریەتی..

(د. راغب السرجاني سيرة الرسول وبناء الامم ص ٨، الندوي، أبو الحسن علي الحسني. ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين؟ (الطبعة الرابعة). بيروت: دار الجيل. صفحة ٥٧

ئەگەر مەزدەك بەهۆکاری فەلسەفەوە تیۆری شوعی فارسی بیرۆکەکەی بڵاوکردەوە، مانی لە ڕێگای وێنە کێشانەوە لەسەر بەردو تاشینی پەیکەر، پەیام و دیدو تێڕوانی دەخستە ڕوو، بۆیە لە وێژەی کلاسیکی کوردیدا ناوی مانی وەکو نیگارکێشێکی گەورە هاتووە، لە یەکێک لە شیعرەکانی نالیدا ئاماژە بە ناوی مانی کراوە وەکو وێنەکێشێکی گەورە و بەناوبانگ. و هەروەها سالمیش باسی کردووە لە شیعریکدا.

نالی دەڵێت:

مانی نیەتی قووەتی تەسویری برۆی تۆ
ئەم قەوسە بە دەستی موتەنەففیس نەکشاوە
سالم دەڵێت: بۆ خەیاڵی نەقشی تۆ مانی لە من کەودەن ترە
ڕەنگی خامەی کردگارە سنعەتی تەسویری تۆ
هەروەها دەڵێت: بە جوز مانی موسەویر قەوسی ئەبرۆی وی نەکێشاوە
کە مانی نەقشی کێشابێ دەبێ هەروا کەمانی بی.

## ساتانیستەکان- شەیتانپەرستەکان

(ئینگلیزی: Satanism)ساتانیستەکان:
شەیتان-پەرستی بزووتنەوەیەکە لە ١٩٦٦ دروستکرا لەگەڵ دروست کردنی کلێسای شەیتان ئامانجەکانی پەرستنی شەیتانەو خۆشەویستی شەیتانە.

یەکەم جار ناوی شەیتان نووسرا لە تەوڕات کە بە شێوەی فریشتەیەك وەسفکرا کە دژایەتی یەهوەی دەکرد.

هەموو ئایینە ئیبراهیمییەکان شەیتان بە دوژمن دەزانێت.

# مـــــــاسۆنییەت

ماسۆنییەکان: ماسۆنی یان فریماسۆنی بزووتنەوەیەکی برایەتی کە لە چەندین ناوەند و بنکە(لۆژ) لە وڵاتانی جیهان پێک هاتووە. ماسۆنیسم خاوەنی بەڕێوبەرایەتییێکی جیهانی نییە. پێوەندی نێوان لۆژەکانی ماسۆنی لە ڕێگەی بەڕێوەبەرانی ئەوانەوە جۆر دەکرێت. ڕەنگە وشەی فریماسۆنی لە

بە واتای «بەننای ئازاد» لە ئینگلیزییەوە یان لە «mason freestone» بە واتای «بەننای فرەنسی» لە زمانی فرەنسییەوە هاتبێت. «franc mason» کەسێک کە ئەندامی ڕێکخراوە ماسۆنییەکان بێت پێی دەوترێت «ماسۆن» یان «فریماسۆن» هەروەها بە ئەو بینایەی کە ناوەندی چالاکی ماسۆنەکانە پێی دەوترێت «لۆژ».

ماسۆنی لە سەرەتادا بزووتنەوەیەکی لیبرال بوو. ماسۆنەکان بە درووشمی «یەکسانی، بەرابەری و برایەتی» ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە ئینقلابی ئەمریکا دژ بە بریتانیا، ئینقلابی گەورەی فرەنسە و ئینقلابی مەشرووتەی ئێران.

کتێب گەلێکی زۆر لە سەر ماسۆنەکان و ماسۆنیسم نووسراوە، بەڵام زۆربەی ئەوان بە ڕوونی لایەنگرانە نووسراون و ئەکادێمیک نین.

# قزڵباشەکان

صوفییە کڵاو سورەکان (قزڵباشەکان):

قزڵباش واتا کڵاوسوورەکانی شیعە- ئەمانیش جۆرێکن لە شیعە، زۆر نزیکن لە سۆفییەکانەوە، ئەم قزڵباشانە لەگەڵ شیعەدا ئەوەندە نەخوێندەواری و خورافیاتیان بڵاوکردەوە، تا وایلێهات هەموو ناوچەکە بوونە شیعە، سەربازەکانی ئیسماعیلی صەفەوی زۆر خوێن ڕێژ بوون، خەڵکیان بە ئاگرو ئاسن فەرمانڕەوایی دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا شا ئیسماعیلی صەفەوی پیاوێکی طاغوت و دیکتاتۆر بوو، کە هاوشێوەی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بوو لە فەرمانڕەوایکردندا، بگرە زۆر خراپتر، چونکە هەموو سەربازەکانی دەبوو سوجدەی بۆ بەرن.

## زەردەشت كێیە؟

زەردەشت لە ڕاستیدا بە چەند ناوێك لێكدراوەتەوە بە وشتری زەرد یان ئەستێرەی زێڕین یان پیر وەیان دەسەڵاتی زێڕین، خاوەنی وشتر یان گەشاوە باسیان لێوە كردوە.

مێژوو نووسان وا دەگێڕنەوە كە زەردەشت كوڕی پیاوێكی جوتیار بووە لە ڕەگەزو ڕەچەڵكدا ئاری بووە..ناوی لە بنەڕەتدا (زرواستر)ە یان (زراتشتر)ە، واتا خاوەنی وشتری زەرد یان وشتری كۆن یاخود پیر دێت.

لە ڕاستیدا مێژووی لە دایكبوونی زەردەشت زۆر ڕوون نییە، بەڵام مێژوونووسان دەیگەڕێننەوە بۆ(٦٦٠)پ.ز لە ئازربایجان لە دایك بووە بنەماڵەكەی (ئەسپیاما)یە كەلە ڕەچەڵەكدا هەموو ئارین، باوكی زەردەشت ناوی(پورشاسپا)ی ئازەربایجانییە دایكی زەردەشت ناوی (دغدو یان دگدو)بووە خەڵكی (ڕەمی) ئازەربایجانە، خێزانی سێیەمی زەردەشت ناوی (هۆیوی ) بووە كە كچی پاشای ناوداری فارسەكان(فریشا ئوشتر)ی برای (جاماسب )بووە.

زەردەشت لە تەمەنی پازدەساڵی دا دەستی بە خوێندن كردووە لای مامۆستایەك كە ناوی (كوشتی )بووە، سەیر لە وەدایە كە ئەم ناوە بە كار هاتووە بۆ مەراسیمی پشتوێن بەستن لە ئایینی زەردەشتی دا، تا تەمەنی بیست ساڵی بەردەوام بووە لە خوێندن لە دوایدا زەردەشت دایك و باوك و خێزانەكەی بە جێ هێشتوە و گەڕاوە بە جیهاندا، یان دەڵێن كەسێكی گۆشەگیر بووە لە چیاكان و ئەشكەوتەكاندا ژیانی بردۆتە سەر.

لە تەمەنی سی ساڵیدا بە پەیامبەر خۆی ناساندوە بانگهێشتی بۆ پەیامبەرێتیو ئاینەكەی كردووە.

مێژوو نووسان دەڵێن لە كەناری دەریای (دیتا) لە نزیك نیشتیمانەكەی خۆی لە ئازربایجان لە لەلایەن فریشتە یەكەوە كراوە بە پەیامبەر و ئەو فریشتە ناوی (هومنە یان بەهمەن)ە واتا لە زمانی پارسی كۆندا بە مانای بیری چاكە هاتووە.

لەدوای هەشت ساڵ پەیامبەرایەتی لەگەڵ شەش فریشتە ناسراوەكەی (ئەمشاسپندان) وتوێژی كردوە.

لە دوای ١٠ساڵی تری پەیامبەرایەتی مێژوونوسان دەڵێن؛ خەڵكی زۆر ئازاریان داوە تەنها یەك كەس باوەڕی پێ دێنێت، ئەویش نزیكی خۆی بووە یان دەڵێن ئامۆزای خۆی بووە كە ناوی(مینیدی نیمون ها) بووە.

لە پاشان دا سەری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوودەكاتە ئەوروپای ئێستا لە ناو یۆنان و ڕۆمەكاندا دەست بە بڵاو كردنەوەی ئایینەكەی خۆی دەكات.

زەردەشت لە ناو یۆنانیەكاندا بە (زۆرۆئاسترس) ناسراوە، وە لە ناو ڕۆمەكانیشدا بە هەمان شێوە پێیان وتووە(زۆرۆ ئاستر).

كارناسی فەرەنسی ئاوێستای (جێمس دار مێستەر) دەڵێت: لە دوای بەجێ هێشتنی زەردەشت لە ناوچەكەدا توانی ڕۆمەكان و یۆنانیەكان ڕێكبخات وە كۆكیان بكات لە سەر خوایەك كە لە زەردەشت دایان تاشی ناویان نا(هوم) كە لە شێوەی مرۆڤ دا بوو.

(کرن) مێژوونوسی فرەنسی دەڵێت: زەردەشت پەیامبەر نەبوو بەڵکو ڕۆشنبیرێکی ڕووناك پەرست بوو؛ لە گەڕانەوەیدا بۆ خۆرهەڵات ناونرا بە خوای خۆر.

ئەفلاتون لە ٤٢٩تا ٣٤٧ی پ.ز بە ڕاشکاوانە باسی زەردەشتی کردووە، ئەو بە فەیلەسوفێکی پارس و هندەکانی دەزانێت وە بە دامەزرێنەری ئایینی (مەزد یەسنا) ی زانیوە کە تا ئێستاش لە هندستان و ئێراندا ئەو ئایینە ماوە.

مێژوونووسی سەدەی سێیەمی زایین (برۆسوس) زەردەشت بە پاشایەکی خوازراوی پارس و māددەکان دەزانێت.

مێژوونووسە بەناوبانگەکانی جیهان هەموو لە سەر ئەوە کۆکن کە زەردەشت خەڵکی ئازەربایجانە و مێژوونووسەکانیش بریتین لە( براتلمە، مولون، سیستان، گلدزهیر، جاکسون وە پیریتیا)، بەڵام ڕایەکی کە هەیە کە دەڵێن زەردەشت خەڵکی شاری (ڕەیّ) واتا تارانی ئێستا بە زمانی ئاوێستایی باسی کردووە بە شاری تارانیان وتوە (وغ) وە بە زمانی پەهلەوی پێی دەڵێن(ڕکا) کە گوایە زەردەشت لە وێ لە دایك بووە.

ئەو مێژوونوسانەش بریتین لە (ئەفلاتون، دیۆجین لەگەڵ هرموودرس) کە قوتابی ئەفلاتون بووە، وەهەر ئەوانیش وشەی زەردەشتیان لێك داوەتەوە بە مانای ئەستێرەی زێڕین یان نیاز پاك وە یان بە زەوی کێڵەرێکی باش لێکیان داوەتەوە.لە ناو مێژوونوساندا تەنها مێژوونوسی ئەڵمانی کە ناوی (دۆمارێنی)یە دەڵێت زەردەشت خەڵکی (باڵخ)ی ڕۆژهەڵاتی ئێرانە یان (ئورومیە)، وە زەردەووشتیشی بە مانای سووتان و گەشاوە ناوزەند کردوە.

لە پاش گەڕانەوەی بۆ ناو مەڵبەند و زێدی باوو باپیرانی وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردبوو لە هەرێمی خۆرهەڵاتی ئێران گەیشتە بارەگای پاشای ئەو هەرێمەکە پاشای پارسەکان بوو ناوی (ویشتاسب) بوو.

زەردەشت بەهۆی زیرەکی و لێوەشاوەی خۆی توانی لە دەسەڵاتی ئەو پاشایەدا جێگای خۆی بکاتەوە تا دوو ساڵ بە نهێنی کاری کرد، تا ئەو پاشایە بهێنێتە سەر بیر وبۆچوون و ئایینەکەی خۆی، بەڵام دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان وە پیاوانی ئایینی ئەو دەڤەرە زۆر دژایەتی زەردەشتیان دەکرد.

لە دوای ئەوەی کە زەردەشت کچەکەی خۆی دا بە (ویشتاسب) کە بە تەمەن ٤٨ساڵ لە کچەکەی زەردەشت گەورەتر بوو کچەکەی ناوی (یوروچیست) بوو.

لە پاشاندا تەواوی هێزو دەسەڵاتی خۆی خستە ژێر دەستی زەردەشتەوە تا ئایینەکەی بڵاو بکاتەوەو وە خۆشی بڕوای پێ هێناو ئایینی زەردەشتی بووە ئایینی فەرمی "ئێران" وە بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم ئایینیە کەوتنە جەنگ و کۆشش کردن لە ماوەی ٢٠ ساڵدا خەریکی بانگەواز و داگیر کردنی وڵاتانی چواردەوریان بوون کە زەردەشت تەمەنی گەیشتە ٧٧ ساڵ لە جەنگێکدا بەرانبەر بە تورانییەکان و ماددەکان کە لە ڕاستیدا سەرکەوتن بەسەریاندا پارسەکان توانیان ماددەکان و تورانییەکان تێك و پێك بشکێنن وە زەردەشتیش لە تەمەنی ٧٧ساڵیدا کە یەکێك بوو لە سەرکردەی ئەو لەشکرانە بە دەستی تورانییەکان کوژرا.

## یارسان- کاکەیی

یارسان بە ئەهلی حەق یان کاکەیی ناسراون، تایەفەیەکی تایبەتن کە هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی جیاوازن لە گەلێک شوێنی کوردستاندا بڵاون بە تایبەت لە کرماشان و گەرمیان.

کاکەیی دانیشتووی کەرکووک و لێواری زێی نێوان هەولێر، مووسڵ (سارەلوو) و شەبەک ئەمانە هەموو بە بنەچەی هۆز و زمان و بیروباوەڕ دەگەنەوە یەکتر. شوێنەکانی نیشتەجێ بوونی ئەهلی حەق (یارسان) لە کوردستاندا لە کۆنەوە تا ئەم سەردەمە هەندێک گۆڕانکاری بە خۆوە دیوە، بەڵام ئەوەی کە هەمووان لە سەری پێداگری دەکەن ئەوەیە کە لە سەرەتادا ئاینی یارسان لە ناوچەکانی هەورامان و شارەزوورو لوڕستان بڵاوبووتەوەو گەشەی کردووە، جا دواتر گەیشتوونەتە ناوچەکانی تری کوردستان و ئێران.

بە بۆچوونی هەندێک لە مێژووناسان، ناوی یارسان کورتکراوەی «یارسولتان»ە و مەبەست لێی سوڵتان سەهاکە (بە فارسی: سلطان اسحاق). کە ڕێبەرێکی دیاری ئەم بیروباوەڕەیە لە کوردستاندا.

یاخود یارستان بە واتای شوێنی یار یا موردانی ئەهلی حەق. کۆنترین ناودارانی یارسان شاعیری بابا تاهیری هەمەدانی (٩٣٧-١٠١٠)ز کە زۆربە شیعرەکانی لای یارسانەکان پیرۆزن و هەندێک لە دێڕە شیعرەکانی ئاخێنراونەتە نێو (سەرەنجام) کە نووسراوی هەرە پیرۆزی یارسانە

# یەزیدییەکـــــان

یەزیدییەکان لە بنەڕەتدا بزوتنەوەیەکی سیاسی بوون، سەر بە یەزیدی کوڕی موعاویە بوون، عدی کوڕی موسافر کاتێک لەدەستی عەباسییەکان هەڵهات و چووە ناوچەی هەکاری لەوێ نیشتەجێ بوو ئەو بزوتنەوەیەی دروست کرد دژی عەباسییەکان، لە کۆتاییدا ئەم بزوتنەوەیە بوون بە گروپێک و تێکەڵاوی تەریقەتی صۆفی عەدەوی بوون، تا بۆ دواجار ئاینی یەزیدیەکانی لێ دروست بوو.

زۆر جار وشەی ئێزیدی بەکار دێنن، کەلە ئاینی یەزیدیدا هیچ بنەمایەکی نیە، تەنها لەم چەند ساڵەی دواییدا ئەو ناوە لکێنراوە بە یەزیدیەکانەوە.

یەزیدی خاوەنی ئایینی تایبەتن و زۆربەیان لە باشووری کوردستانن لە دەڤەری شێخانی نێوان مووسڵ، پارێزگای دهۆک و دەڤەری شنگاری سەر سنووری سووریادا دەژین. هەروەها لە بۆتان و دەربێسیە و باکووری پارێزگای ئەلحەسەکە و دەڤەری عەفرین لە حەلەب و ئەلەگەزی ئەرمەنستان و پارێزگای قەرس و ئەردێخانی باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا دەژین. یەزیدییەکان هەندێکیان بە کوردی کورمانجی ئەدوێن.

## بیروباوەڕی ئێزیدی:

خوا (الله): گەورەیەکەی لە نووسیندا دەرناکەوێت، لە سەرووی نموونە و شێوەوەیە؛ سیفەتەکانی کۆنن وەکو زاتی خۆی هیچ شتێک لە سەر شێوەی ئەو نیە و لە هیچ شتێک ناچێت. لەبەر ئەوەی خودایە کەواتە خوای مرۆڤە.

مەلیکە تاوس مەلیکی هەموو مەلائیکەتەکانە (فریشتەکانە). مەلیکە تاوس بریتیە لە عەزازیل یان بە عەرەبی (الشیطان) (بە ئینگلیزی: Melek Taus یان The Angel Peacock) کە حوکمی هەموو زەوی ئەکات بە یارمەتیو هاوکاری حەوت فریشتەی دیکە ئەو حەوت مەلائیکەتەش لەژێر ئەمری خودای گەورەدان.

پاشا بە شێوەی تاوس شێوە دەکێشرێت. ئاو، خۆڵ و هەوا لە دروشمە پیرۆزەکانی دینی یەزیدین کە هەرسێکیان ژیان پێک دەهێنن.

هەروەها یەزیدییەکان مەزارێکی زۆر پیرۆزیان هەیە کە سەردانی دەکەن کە مەزاری شێخ عەدی کوڕی موسافرە کە لە (لالش)دایە.

## ڕەمزە پیرۆز و دینییەکانیان

یەکەم پاڕانەوە (دوعا): کە بەسێ کاتدا دەکرێت بە تایبەتی لە کاتی هەڵهاتنی خۆرو ئاوابوونیدا، یەزیدییەکان لەم کاتانەدا داوای خێر و خۆشی بۆ خۆیان و هەموو مرۆڤایەتی دەکەن.

یەزیدی وەکو دیانەت ڕێگەو شێوازی تایبەتی خۆیان هەیە لە کاتی بەجێگەیاندنی نوێژدا بۆ خودا کە بەزمانی ئاری کۆن پێی ئەڵێن (خودێ) یـــان (ئێزدان) کە کۆمەڵێک دوعای لێ ئەکەن بە تایبەتی لە کاتی هەڵهاتنی خۆ رو نیوەڕۆ و کاتی خۆرئاوابووندا.

تەواو

# ناوەڕۆک



ئامانجی نووسەر لەنووسینی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە چەواشەکاریی و درۆو خورافیات لەسیحرو جادوبازی و کاری شەیتانەکان جیابکرێتەوە.
لەکتێبی یەکەمی مەملەکەتی شەیتاندا نووسەر زیاتر باسی ئەو ڕووداوانە دەکات کەچۆن ئاشنا بووە بەجیهانی جنەکان و چۆن پەیوەندیی دروست بووە لەنێوانیاندا.
لەبەشی یەکەمدا خوێنەر ئاشنابووە بەشێوازی چوونە ناوەوەی جنەکان بۆ لاشەی مرۆڤ و چۆنێتی دەرهێنانی، هەروەها باسێکی کورتی ئەو گروپ و ڕێکخراوو مەزهەبانەی کە لەپەرتووکەکەدا ناویان هاتووە ڕوونبکاتەوەو فێرمان بکات ئەوانە کێن و خەریکی چین لەرابردوو ئێستاشیاندا.
لەوبەشەی کە باسی جنۆکەو چوونە ناو لاشەی مرۆڤ دەکات، نووسەر هەوڵیداوە زانستیانەو واقیعیانە لەڕووی مەیدانییەوە کەخۆی ئەزموونی هەبووە تێیداو راوبۆچوونی زانایان و پسپۆڕانی لەسەر وەرگیراوەو گونجاوە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، باس بکات.
لەکتێبی دووەمی مەملەکەتی شەیتاندا نووسەر هەوڵی ئەوەی داوە کەجۆری سیحرو جادوو ڕوونبکاتەوەو شێوازی بەتاڵکردنەوەکەی باس بکات، تا خوێنەر سوودی لێ ببینێت و لەڕووبەڕووبوونەوەی هەر حاڵەتێکی لەو شێوەیەدا بزانێت چۆن چارەسەری بکات.
لەکتێبی سێیەمدا نووسەر هەوڵی تەواوی داوە کە ئەو کەموکوڕیانەی لەکتێبی یەکەم و دووەمدا هەبووە پڕبکاتەوەو واقیعیانەترو زیاتر لەڕووی مەیدانییەوە کەخۆی بەشێک بووە لەڕووداوەکان، نیشانەکان و شێوازی چوونە ناو لاشەی جنەکان و دەرهێنانیان و ئەو ئەزێت و ئازارەی کە مرۆڤەکان دەیبینن بەدەستی ئەوان ڕوون بکاتەوە.

# مەملەکەتی شەیتان




حاجی قادری کۆیی






لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف
٢٥٠٠٠ /M.Ktebxana ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤